# سەردەم


گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کەلتووری بیانی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات
ژمارە (13) شوباتی . 2001 - سالی سێیەم





ناونیشان:

سلێمانی - فولکەی یەکگرتن

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

تەلەفۆن : 29839 یان 4347

بۆ پەیوەندی کردن لەدەرەوەی وڵاتەوە

سەنتەری سەرچنار

Tel: 0044 162 84 86008 - Fax: 0044 162 84 77660

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لەڕێی سندوقی پۆستی ژمارە

14665/615 و 14665/616 تاران

ژماره (13) شوباتی 2001 سالّی سێیەم

# مۆمێکی نوێی تەمەن

بە دەرچوونی ژمارە (13) گۆڤاری سەردەم پێدەنێتە سێیەم ساڵی تەمەنیەوە، ساڵانی تەمەنیش لەسەر ئاستی تاکی دامێنەرەوە بیگرە تا تەمەنی هەر فیکرو فەلسەفەو دەستەو گروپێک بەو وێستگانە دەپێورێت کە کارو بەرهەم و چالاکیی ناوازەیان تیادا گەشەی کردوە، گۆڕانیان تیا رەخساندوە، بیری درەوشاوەیان بە مرۆڤ و سەردەمەکەیان بەخشیوە، ئاوەزی لە جووڵە کەوتووی باو و رابردووی دەق پێوەگیرتوویان بەزاندوە، نە سەری قایل بوونیان بۆ هەر دیاردەو واقیعێك دانەواندوەو نە پەنجەی گومانیشیان لە پێشی یەقینەکاندا نوشتاندۆتەوە. بە کورتی کاریگەریی خۆیان، کەم یان زۆر، بەسەر دەوروبەرەکەیاندا سەپاندوەو تایبەمەندی و پاساوی مانەوەو زەروورەتی بوونی خۆیان پاراستوە. دیارە هەموو ئەم ئەدگارانە سیمای شارستانی و تەعبیرن لە گیانی سەردەم، هەر لەبەر ئەمەیشە کە لە مێژووی فیکرو ئەندێشەکانی مرۆڤدا چەند وێستگەیەك بە نەمری ماونەتەوە، بوونەتە کلیلی ئایندەو تا ئێستا جێ پێی شایستەیان ماوەتەوە. بەتایبەتی بۆ ئەم سەردەمە جەنجاڵ و تیژڕەوەی خۆمان کە لە هەنگاوێکەوە بیگرە تا ژەمێك خواردن خێرایی کی دەگمەنی لەخۆگرتوەو، ئەگەر فریای نەکەویت یەخەی ئیفلیج بوون و لە ڕەو جێمانت بەدەست رەشەباوە دەبێت و، زەمانەیش بەزەیی بە نەماندا نایەتەوە.

مەبەستم لەو پێشەکیە کورتە هەڵوێستی مرۆڤە لەسەر ئاستەکانی ژیان بەهەموو بواری تایبەتی و گشتیەوە، بەڵام وەك بەرجەستەکردن پرۆژەی گۆڤاری سەردەم دەکەمە نموونە:

لە کۆمەڵگایەکی وەك کۆمەڵگای ئێمەدا، دەست بردن بۆ هەر پرۆژەیەکی جیدی، بەتایبەتی لە بواری کلتووری و فیکریدا، بەزاندنی گەلێك شوورەی حەرام کراوە کە لە سەرکوت کردن و ڕوویەڕوو بوونەوەی کۆمەلایەتیو سیاسییا رەنگ دەداتەوە، بەردەوام رێگای ئەو جۆرە پرۆژانە بە پێچ و پەناو هەڵدێرو نووناوتووندا خۆی کێش دەکات. پێش ئەوەی بکەوێتە سەرپێ دەستی لە بین نان و هەڕەشەت لەسەر سەرە، کە ئاور دەدەیتەوە بێجگە لە نائومێدی چی دی ناچنیتەوە، تەنانەت خودی نێوەندە روناکبیریەکەیش بەهۆی کۆمەڵێك پوارەو هاوکارن بە بەتەنگ هێنانەوەی ئەڵقەی گەمارۆکە. هەندێك لەو پوازانە ئەگەر بە ئاشکرا شەڕت نەکەن دەستی فریادڕەسییش نابزوێنن.

بەڵام مێژووی درەوشاوەی فیکرو رۆشن گەرایی مرۆڤ ئەوەیان لا جێهێشتووین کە ئەمە شەڕێکی حەتمیە، بەردەوام هێزی شەڕ چاکەو تاریکی و رووناکی دەستەو یەخە بوون، کۆن و تازە هەر لە ململانێ و مێژوویش وەك ئەنجام بڕیاری خۆی سەپاندوە.

لە سەرەتای دەست بەکاریماندا ئەوەمان دەزانی کە لە بەردەم ئەزموونێکی نوێدایین، هەوڵەکانی لەوەوبەرمان بێجگە لە نەرسکاری و تەمەنی زۆر کورتیان لە چەند هەوڵێکی ئەدەبی رووت تێ نەپەڕیون، خەونی ئێمەیش زۆر و زەبەندو، وێناکانیشمان بۆ ئاستی بەهرەو تواناو کادرو ساتمەکانیش پەلی نائومێدی دریژتر دەکرد. بەڵام رەنگە تەنیا مێروو لەو تیرۆژە روناکیە بترسێت کە دەچێتە قوژاخەکەیەوەو بەوە نەزانێت ئەوە رزگارەرو مایەی ژیانیەتی. ئێمەیش بەو -دەرفەتە- روناکیە گومانمان لە توانای خۆمان دامالی، ئێمە لە دەرکردنی گۆڤارێکی ئاساییدا نەك نەدەترساین بەڵکو لامان لەوە ساناتر بوو کە جێگای خەونەکانمانی تیا

بیبێتەوە، بەڵام ئەو بڕیارەی لە ناوەوەی ئێمەدا خۆی حەشاردابوو ئەو ڕاستیە بوو کە ناشێت ئەمڕۆ دووبارەکردنەوەی دوێنێ بێت بە هەموو خەسڵەت و ئەدگارەکانیەوە، بۆیە دەبێت پرۆژەکە تایبەتمەندیەکی خۆی هەبێت و لە ناو گەڕەلاوژەی دەنگەکاندا دەنگێکی ون نەبێت.

لە ماوەی دوو ساڵی ڕابردوودا سەردەم بە ئەمانەت و بەرپرسیاریەوە لە دەرگای ئەو وێستگە ڕوناکبیریەو فیکریانەی داوە کە پێویستی نەوەی نوێن، نەوەیەك لە زۆر ڕووەوە بەسەر هەواری خاڵیدا هاتوەو چ زەمینەیەکی فیکری و ئەدەبی ناو کوردی بۆ خۆش نەکراوە کە زەخیرەی گەشەسەندن و داهێنانی ئەمڕۆی بێت، ئەو بۆ دەوڵەمەندکردنی مزرو گەشەی بەهرەو توانای ئەفراندنی لەسەر زەمینەی ڕوناکبیری ترو فەلسەفەو بیری ئینسانەکانی دی خۆی پێگەیاندوە، کلتوورێکی پتەوی لە هەموو ئەو بوارانەدا نەبوە کە ڕەسەنایەتی پاراستبێت و بووبێتە سەرچاوەی داهێنانی. هەرچەند ئێمە کلتووری ئینسانی بە کلتوری خۆمان دەزانین و لاریمان لە وەرگرتنی نیە، بەڵام کێشەکە لەوەدایە کە نەوە داهێنەرەکەت بە زمانی دایکی چی وای لە بەردەستا نەبێت تا هەنگاوێکی بوێرانەو بەرجەستەتر لەوەی کە هەیە بنێت، بێگومان خەوشەکە لە نەوەکەدا نیە، بەڵکو لەو کلتوورەدایە -کە لەبەر هەر هۆیەك بێت- نە چەند بەرهەمێکی فیکری و فەلسەفی لە کتێبخانەکەیدا هەیە؛ نە ئەوەندەیش بیرمەندو ڕۆشنگەری لە بوارە مەعریفیەکاندا تیا هەڵکەوتوە کە بووبێتنە نموونەو شوێنی متمانەو پەیڕەوی لێ کردن. بۆیە لە وجودی ئەم کەلێنانەدا خوێنەری ئەمڕۆ ناچارە بە دوای بەدیلدا بگەڕێت.

ئێمە ناڵێین بەم تەمەنە کورتەی گۆڤاری سەردەمەوە زۆرمان لەو بۆشاییانە پڕکردۆتەوە. بەتایبەتی کە ئەو حەقیقەتە بزانین ژماردنی بۆشاییەکان درەنگ کۆتاییان دێت. بەڵام سەردەم دەرگایەکی واڵاو شایانی سەرنجە لە بواری کاری وەرگێڕاندا، توانی لەم ڕێگایەوە خوێنەری کورد بە کۆمەڵێك بیرمەندو فەیلەسوف و قوتابخانە ئەدەبیو ڕەخنەییەکان بناسێنێت، تا ڕادەیەکی بەرچاو پرۆسەی وەرگێڕانی لە ئاستی پەراوێز کراویەوە هێنایە سەر زەمینەی داهێنانێکی سەربەخۆو گرنگ کە پێویستیەکی ڕووناکبیریەو ئەزموونی ئاشنابوونە بە ڕوە جوان و درەوشاوەکانی ئەدەب و فیکری دنیا، وەرگێڕان هونەرێکە مەرج نیە هەر زمان زانێك ئەگەر گیانی عەشق و داهێنانی تیا نەبێت پەی بە نهێنیەکانی بەرێت.

لەم هەوڵەدا کەسانێکی پەرۆش و هوشیار بەشداریان کردین کە لە هەمان سۆنگەی ئێمەوە هەستی بەرپرسیاریەتی سەردەمیان لە ئەستۆی خۆدەزانی و سبەینێیان لە ئەمڕۆ بە کەمتر لە قەڵەم نەدەدا. بە نووسین ئەرکیان لەسەر کەم کردین و بە ڕەخنە کۆیان کردینەوە، ئەو هاوڕێیو دۆستانە مۆمێکی هەمیشە بەگڕو تاو بوون بۆ داگیرساندنەوەی مۆمەکانی لەمەودوای تەمەنی سەردەم و زیاتر ڕووناك کردنەوەی پەرێزی پەیامەکەی.

سەرنووسەر

شوباتی 2001

# فیکرو فەلسەفە





- نیوتن و لۆك — ئیمیل بریهێ
- یۆرگن هابرماس و ئەقلانیەتی کۆمیتیکا شیونخوازی — هاشم سالح
- رەخنە لە ئەقلی زانستی — بابەك ئەحمەدی



# نیوتن و لۆك

■ ئیمیل بریهێ

● و. له عه‌ره‌بییه‌وه‌: شاهۆ سه‌عید

له نێوان ئاراسته تیۆلۆجیه مه‌زنه‌كانی مالبرانش، لایبنتزو، سپینۆزا.. له نێوان ئه‌لاره فه‌لسه‌فیه قه‌به‌كانی شلینگ، هیگڵ و، كۆنت دا، سه‌ده‌ی هه‌ژده‌یه‌م وه‌ك ساته‌وه‌ختی ساردبوونه‌وه‌و حه‌وانه‌وه‌ی ئه‌قڵ ده‌رده‌كه‌وێ، ئه‌قڵێك خوازیاری پێكهێنان و بنیاتنانه.

بۆچوونه‌كان سه‌باره‌ت به هه‌ڵسه‌نگاندنی سه‌ده‌ی هه‌ژده‌یه‌م جیاوازن: ئه‌و سه‌ده‌یه له لایه‌كه‌وه بێزاری مێژونوسانی فه‌لسه‌فه‌ی بۆ لای خۆی وروژاند، ئه‌و مێژونوسانه‌ی به‌ده‌ر له ئاراسته (فه‌لسه‌فیه)كانی بركلی هیوم و كانت، جگه له چه‌ند فیكرێكی لابه‌لاو له‌به‌ریه‌كهه‌ڵوه‌شاوه، كه به ده‌گمه‌ن ره‌سه‌ن بوون و ته‌نها مه‌به‌ستیان شه‌ره قسه‌و تانه‌و ته‌شه‌رو گرووپبه‌ندی بوو، شتێكی تریان نه‌بینی. له‌لایه‌كی تره‌وه ئه‌و په‌رچه كرداره تونده‌ی كه سه‌ره‌تاكانی سه‌ده‌ی نۆزده‌یه‌م به خۆیه‌وه بینی، سه‌ده‌ی هه‌ژده‌یه‌می وه‌ك سه‌ده‌ی ره‌تكردنه‌وه‌و روخاندن و ره‌خنه وێناكرد؛ له راستیدا خه‌ڵكی جیاوازبوون له



ئیسحاق نیوتن

حوكمداندا به‌سه‌ر ئه‌و سه‌ده‌یه‌دا، هه‌ر وه‌ك چۆن جیاواز بوون له حوكمدان به‌سه‌ر شۆڕشی فه‌ره‌نسادا كه به‌هه‌ر حاڵ به به‌رهه‌می راسته‌قینه‌ی ئه‌و سه‌ده‌یه له قه‌ڵه‌م ده‌درێ.

یه‌كه‌مین خه‌سڵه‌تی سه‌ره‌تاكانی سه‌ده‌ی هه‌ژده‌یه‌م بریتی بوو له نابوتبوون و دارمانی ئه‌و



جۆن لۆک

ئاراستە مەزنانەی کە لە ژێر کاریگەری دیکارت دا هەوڵیان دەدا فەلسەفەی سروشت بە فەلسەفەی زەینییەوە گرێ بدەن. نیوتن و لۆک دوو (بیرمەند)ی ناسراو و دیاری سەدەی هەژدەیەمن: نیوتن کە بەشی بنەڕەتیی ئەندێشەکەی، واتە فەلسەفە سروشتی یان فیزیکیەکەی، جگە لە هاوبەندیەکی لاواز پەیوەندیەکەی ئەوتۆی بە تیۆرەکانیەوە سەبارەت بە بوونی ڕۆحیەوە نەبوو، ئەو بوونەی کە لە ژێر ئەنگیزەیەکی سۆفیگەرانەی شەخسیدا حەزی دەکرد بڕوای پێ بێنێ، نەک وەک بابەتێک بۆ تێڕامانی مەنهەجی کە پەیوەندیەکی نەپساوەی بە زانستەکەیەوە هەبێت لە (بواری) سروشتناسیدا؛ (لە بەرامبەردا) لۆک فەلسەفەکەی خۆی لە زەیندا دارشت کە هیچ پەیوەندیەکی گەوهەریی نەیدەبەست بە گەشەی هاوچەرخی (ئەو سەردەمە) لە زانستە ماتماتیکیو سروشتیەکان لای بویل[1] یان لای نیوتن؛ چونکە ئەگەر لۆک و بەتایبەتی هەندێ لە جێگرەوەکانی، هەروەکو بینیمان، هەوڵی ئەوەیان دابێت شێوەیەک لە پێکەوەگونجان لە نێوان زەین و جیهانی مادیدا دابمەزرێنن وەک چۆن تیۆری کێشکردنی (الجاذبیة) وێنا کردبوو، ئەوا دەبێ شتێکی تەواو جیاوازتر لەو یەکبوونە مەنهەجییە ببینین کە دیکارت هەوڵی دەدا لە نێوان بەشە جیاوازەکانی فەلسەفەدا دایبمەزرێنێ: لە راستیدا ئەو مەسەلەیە تەنها خوازەیەکی پەتی بوو بۆ وێناکردنی زەین وەک نمونەیەکی سروشت کە نیوتن پەردەی لەسەر دامالّی و، (دەیویست) خۆی بسەلمێنێ بەو وەهمەی کە دەتوانێ سەرکەوتنێک بەدەست بێنێ هاوشانی ئەو سەرکەوتنە بێت کە لە زانستە سروشتیەکاندا بەدەست هات.

جیاوازیەکە چەند گەورە بێت، ئەو لێکترازانە ریشەییەی نێوان سروشت و زەین دەست بەسەر میکری سەدەی هەژدەیەمدا دەگرێ: چونکە دەسەلاتی دوانەیی لۆک و نیوتن ئەقڵەکانی (ئەو سەردەمەی) دەنەخشاند، لە دەرەوەی ئەو مەسەلەیە شتێک لە ئارادا نەبوو، جگە لەو ناڕەزاییانەی کە پێویستە تۆماریان بکەین.

(1)

## بڵاوبوونەوەی فیکری نیوتن

با بەچەند هێڵێکی پان وێنەی ئەو گۆڕانکارییە فیکرییە بکێشین کە سەرکەوتن و بڵاوبوونەوەی میکانیکای ئاسمانی نیوتن بەدەستی هێنا: لە سەرەتای سەدەی هەژدەیەمدا سیستمی خوێندن تارادەیەک لە هەموو وڵاتەکاندا بەندبوو بە شێوەیەک لە ئایدیولۆجیای دیکارتیزمە؛ زانستی سروشتناسی روهو لە هەموو جێگەیەک برەوی سەندبوو؛ بەلام هێشتا 30 ساڵ تێنەپەڕیبوو کە ئەستێرەی لە هەموو شوێنێک خامۆش بوو؛ سەرەتا لە ئنگلتەرا دەستبەرداری بوون؛ لە ئوسکۆتلەندا سەردەمی ئەو

تا ساڵی ***1715*** درێژەی کێشا؛ راید لە ***24*** شابی ***1787*** لە میانەی قسەکانیدا دەربارەی جیمس کریگۆری پرۆفیسۆر لە زانکۆی سانت ئەندرۆز نوسیویەتی: "لەو بڕوایەدام ئەو یەکەمین پرۆفیسۆری فەلسەفە بوو کە مەزهەبی نیوتنی لە زانکۆیەکی نوسکۆتلەندی وتەوە؛ چونکە مەزهەبی دیکارتیزم لەو چاخەدا تاقە مەزهەبی راست بوو، ئەو حاڵەتەش تا ساڵی ***1715*** بەردەوام بوو". ڤۆلتێر کە هەوڵ و کۆششێکی زۆری لەگەڵ موبرتوی‌دا نواند بۆ بڵاوکردنەوەی رۆحی نیوتنی لە فەرەنسا، بڕوای وایە کە ساڵی ***1730*** مێژووی دواهەمین سەرکەوتنی ئەوە؛ دەربارەی فەلسەفەی دیکارت نوسیویەتی: "تەنها لە سەرەتای ساڵی (***1730***)یەوە، کاتێ ئەندازەناسی و سروشتناسی ئەزمونگەری ئاستێکی قوڵتریان (لە زانستدا) دۆزیەوە، فەرەنسا دەستبەرداری ئەو فەلسەفە وەهمییە بوو". هەر لەو مێژووەدا، سەرەڕای وەفاداریی فونتنبیل بۆ سیستەمی دیکارتیزم، نیوتنیەکان دزەیان کردە ئەکادیمیای زانستەکان. دواتر هۆلاند لە ساڵی (***1773***)دا توانی دەربارەی فەلسەفەی دیکارت بنوسێ: "لەمەودا ئەو فەلسەفەیە تەنها ئەو کەسانە دەبینێتەوە کە بە ڕێی دەکەن".

میکانیکای ئاسمانیی نیوتن خاوەنی دوو خەسڵەتی تەواو پێچەوانەی خەسڵەتەکانی سروشتناسی دیکارت بوو: تا دوا ئەندازە ورد بوو لە پراکتیزەکردنی ماتماتیك لە دیاردە سروشتیەکان، ڕێخۆشکەربوو لە بەردەم ناسینی دیاردە گەردوونیە گەورەکاندا (جوڵەی هەسارەکان، کێشکردنی زەوی، هەڵچون و داچونی دەریا) بەشێوەیەکی ورد ئەگەر دەرکەوتە بەراییەکان لە بەردەستدا بن؛ هەروەها بەراوێزێکی زۆر فراوانی لەو زانیاریانە بەجێهێشێت کە قابلی لێکدانەوە نەبوون، بەو پێیەی دەرکەوتە بەراییەکان لە ڕووی ماتماتیکییەوە ئەنجامگیری بۆ ئەنجام نادرێو، تەنها ئەزموونیش دەیخاتە روو. بەڵام لای دیکارت بە پێچەوانەوە بوو، لێکدانەوەی میکانیکی کە دەبوو تەواو سەراپاگیر بێت، لە حاڵەتە وردو تایبەتەکاندا هاوشانی چۆنیەتی بەڵگەنەویستەکان بوو کە هیچ پێشبینیەکی پێشوەختی نەدەدا بەدەستەوە. بەهەر حاڵ ئەم دوو خەسڵەتە لای نیوتن دوو خەسڵەتی یەکانگیر بوون: یەکەمیان بەند بوو بە داهێنان لە بواری وردەکاریەکانی ماتماتیکدا، کە تاقە زمانی هاوتای میکانیکای تازە بوو، چونکە وەك ئەندازەی شیکاری تەنها تەعبیر لە پێوانەیەکی دیاریکراو ناکات لە چرکەساتێکی دیاریکراودا، بەڵکو تەعبیریش لە چۆنیەتی جێبەجێکردنی ئەو گۆڕانە دەکا لە ڕووی تاوسەندن و ئاراستەکردنەوە لە چرکەساتێکی دیاریکراودا. بەڵام لە ڕێگای ئەو مەرجانەی کە جێبەجێکردنی ئەم ڕێسایە لەسەر رووداوە سروشتیەکان ئاگەیەنێتە ئاستی خودی ڕێساکە -کە ئەمەش خەسڵەتی دوومە- ئەوا دەکرێ بە ئاسانی وێنای مەرجە دیاریکراوەکان بکەین لەکاتی خەملاندنیاندا، کە لە ڕێگایەوە مەحاڵە ڕێسای کێشکردن بەکاربهێنین: لە حاڵ و مەرجێکی لەم جۆرەدا دانانی هەسارەیەك لە هەسارە گەڕۆکەکان بە پێوانە لەگەڵ خۆردا کێشکردنی تەنەکانی دیکەی گەردوون بە بەراورد لەگەڵ کێشکردنی خۆردا کەمبایەخە، چونکە جگە لە کێشکردنی هاوبەشی نێوان دوو تەن ناچار نیە هیچی تر لە بەرچاو بگرێ؛ بەڵام ئەگەر گریمان هۆکارە پەشێوهێنەکان لە ڕووی چەندایەتیەوە هاوتای کێشکردنی خۆرە لە سەدیمی کێشکردنە هاوبەشەکاندا (تەنانەت ئەگەر واش دابنێین کە سەدیم هەمان ئەو شتەیە کە لایبنتز باسی کردووە، گشت تیایدا بەرامبەر گشت دەوەستێ)، ئەوا قابلی جێبەجێکردن نیە.

بەڵام دەکرا لە ریزی مەرجە بەراییەکاندا چەند مەرجێکی جیاواز لە ئارادا بوونایە بێتەوەی ببونایەتە هۆی ئاڵۆزیی کێشەی میکانیزمی لە چارەسەرکردندا؛

چونکە جیاوازیەك نیە لە نێوان مەرجی ئاراستەکردنی بزاوتی هەسارە گەڕۆکەکاندا بە ئارستەی خۆی یان ئاراستەی پێچەوانەدا.

ئەم دوو خەسڵەتە لەیەك ناترازێن: چونکە چارەسەری مەسەلەکانی میکانیکای ئاسمانی پێویستی بەو پێشهاتانە هەیە کە لە روی میکانیکییەوە قابلی لێکدانەوە نین: بەمانایەکی تر، بە بڕوای نیوتن تیۆرێك دەربارەی پێکهاتنی گەردون **Cosmogonie** لە گۆڕێدا نیە، واتە لێکدانەوەیەکی زانستی بۆ بنەمای پەیوەندیە مەنوکیەکانی تەنە ئاسمانیەکان لە رووی پێگەو خێراییەوە لە ئارادا نیە؛ هەروەکو چۆن زانایەکی گەردووناسیش دەڵێ: "نیوتن لە بەرامبەر پێکهاتەی خولگەئامێزی کۆمەڵەی خۆردا توشی سەرسامی نەدەبوو"(2) بەڵام بە چ شێوازێك تەفسیری ئەو جۆرە لە شوێنی بەتاڵ بکەین کە پەلکەخوازی بۆی بەجێهێشتین؟ پەنابردن بۆ رێکەوت مەحاڵە؛ چونکە گەر گریمان هەندێ لە هەسارەکان بە رێکەوت فڕێ دراونەتە نێو کایەی کێشکردنی خۆرەوە، ئەوا جگە لە ئەگەرێکی تا دوا ئەندازە بچوك هیچ ئەگەرێك ئەوە ساغ ناکاتەوە کە ئەو هەسارانە توانیبێتیان پێگەی ئێستاو جوڵەی ئێستا وەربگرن: بۆ دەربازبوون لەو (کێشەیە) دەرەتانێك لە ئارادا نیە جگە لە توانای بوویەکی ئاقڵ کە یەکەمین گوڕی بە هەسارەکان بەخشیبێت و، بە مەبەستی خولقاندنی کۆمەڵە خۆرییە سەربەخۆکان ئەستێرەکانی بەشێوەیەکی نەگۆڕ لە دوور یەکەوە جێگیر کردبێ "نەبادا گەردونەکان بەهۆی هێزی کێشکردنەوە بەیەکدا بکێشن"(3).

میکانیکا لای نیوتن پەیوەندیی بە تیۆلۆجیاوە هەیە: یەزدان لای ئەو ئەندازە ناس و تەلارسازە، زانیویەتی چۆن توخمەکانی کۆمەڵەی خۆر پێکەوە بگونجێنێ بە شێوەیەك کە دۆخێکی هاوسەنگی نەگۆڕو بزاوتێکی یەکانگیرو خولگەیی هێناوەتە ئاراوە. زۆر ئاسانە دەرك بە ناسکی ئەو پەیوەندیەو سروشتە کاتییەکەی بکەین: لە کاتێکدا بیریارێکی وەکو ڤۆلتێر بڕوای پێدێنێت و دەیکاتە بنەمای ئاینە سروشتیەکەی، کەسانێکی زۆر لە پەیڕەوانی نیوتن هەوڵدەدەن ئەو پەراوێزە بەرتەسك بکەنەوە کە پێی وایە شتێك هەیە لە رووی میکانیکییەوە قابلی تەفسیرکردن نیە: لە میانەی لێکۆڵینەوەکەماندا دەربارەی پێکهاتنی گەردونیی لای نیوتن بۆمان دەردەکەوێ کە چ رێگە چارەیەك بۆ مەسەلەکە لەلای نیوتن گەیشتبووە بنبەست: چۆن ئەو بەشە بزاوتانەی کە ملکەچی کێشکردنن لای نیوتن دەکرێ بە شێوەیەکی پێویست بە کۆمەڵەیەکی وەك کۆمەڵەی خۆردا یەکبگرنەوە؟ ئەمە هەمان بابەتی کانت و لابلاس بوو: لابلاس چاکترین رونکردنەوەی پێشکەش کرد دەربارەی چۆنیەتی ئەو بزاوتەی کە نیوتن دەستی پێکرد بەوەی کە سرەوتن ناناسێ چونکە داهێنەری ئەو بزاوتەی بەو کەسە وێناکرد کە توانای هێشتنەوەیشی هەیە، لەمبارەیەوە وتبووی: "توانای هیچم نیە جگە لە تێبینیکردنی ئەوەی کە بە چ شێوەیەك نیوتن لەم خاڵەدا (رێکخستنی هەسارەکان) لەو میتۆدە لای داوە کە لەکاتی پراکتیزەکردندا لە چەند خاڵێکی تردا گونجاو و شیاو بووە.. داخۆ خودی ئەم رێکخستنەی هەسارەکان بەرهەمی یاساکانی جوڵە نیە، ئایا ناکرێ ئەم ئەقڵە باڵایەی کە نیوتن پەنای بۆ دەبا وێنەی رێکسختنی هەسارەکان بێت بەشێوەیەکی گشتی تر؟ ئەو دیاردەیەی کە گومانەکانی ئێمە پەی پێدەبا چیە جگە لە ماوە پەرتەکان کە لە شێوەی تەنی جیاوازدا بە گەردوونەکاندا بڵاوبوونەتەوە.. با نیگامان بگەڕێنینەوە بۆ مێژوی پێشکەوتنی ئەقڵی مرۆیی و هەڵەکانی، تا بۆمان روون ببێتەوە کە هۆکارە مەبەستگەراکان بە بەردەوامی لە سنوری زانیاریەکانی خۆیاندا لە پاشەکشێدان؟(4).

کەواتە زۆر کەس زانستی سروشتیی نیوتنیان قبوڵ کردوەو، لە هەمان کاتیشدا بە گومانەوە تەماشای تیورەکەیان کردوە لە بواری میتافیزیکیدا، دواتر زانستی سروشتی ئەو تەرزێك لە مەعقولیەتمان

پێشکەش دەکا کە تا ئەندازەیەکی زۆر جیاوازی لەگەڵ تەرزی دیکارتدا هەیە. لێکدانەوەی دیاردە لای دیکارت بەندە بە وێناکردنی ئەو بنیاتە میکانیکییەوە کە ئەو دیاردەیەی بەرهەمهێناوە، رەنگە ئەم جۆرە لێکدانەوەیەش چەندین رێگەچارەی شیاوی لێبکەوێتەوە، بەو پێیەی کە رەنگە تاقە دەرەنجامێکمان دەستکەوێ بە کۆمەڵێك بەڵگەنەویستی زۆر لە یەکتر جیاواز. نیوتن چەندین جار ئەوەی وتبوو کە هەموو گریمانەکانی دیکارتیەکان، واتە هەموو بنیاتە میکانیکیە وێناکراوەکان بۆ سەلماندنی دیاردەکان، دەبێ لە فەلسەفەی ئەزموونگەریدا بە دوور بگرین Non ***fingo hypotheses***: واتە من هیچ یەکێك لەو بەڵگانە دانامێنم کە زۆرجار دەتوانن دیاردەکان بسەلمێنن، لە کاتێکدا خودی ئەو بەڵگانە شیاونین. نیوتن بڕوا بە هیچ بەڵگەیەك ناهێنێت "ئەگەر دەرماویشتەی خودی دیاردەکان نەبێت".

ئاشکرایە کاتێ نیوتن باسی کێشکردنی گشتی دارشت، بە هیچ جۆرێك بڕوای بەوە نەدەکرد گەیشتبێتە دوا بەڵگەی ئەو دیاردانەی کە ئەو یاسایە تەفسیریان دەکا: بەڵکو تەنها مەبەستی ئەوەبوو ئەوە روون بکاتەوە کە تەنە قورسەکان بەرەو چەقی زەوی ئەکشێن بەپێی تەنها یاسایەك، تەنە شلەکانی دەریاکانیش بەرەو مانگ ئەکشێن لەکاتی هەڵچووندا، مانگ بەرەو زەوی و هەسارەکانیش رووەو خۆر ئەکشێن: بەڵگەش لەسەر یەکبوونی شوناسی ئەم یاسایە لەسەر بنەمای پێوەرە ئەزموونیەکان دامەزراوە: بۆ نموونە بەڵگەهێنانەوە لەسەر دروستیی ئیدعاکەی نیوتن بەپێی یاساکانی گالیلۆ (بەمجۆرەیە) جوڵەی تەنێکی قورس لە دوورییەکەوە وەك دووریی مانگ وەك جوڵەی خودی مانگ بەدی دەکرێ (درێژیی پلەی چەمینەوەی زەوی سەر بە توخمەکانی ئەم پێوانەیەیە؛ لە کاتێکدا ئێمە ئەوە دەزانین کە کاتێ نیوتن بەشێوەیەکی هەڵە ئەندازەی ئەو درێژییەی گرت، خەریك بوو دەسبەرداری ئەو تیۆرەی ببێ کە پێشتر سەلماندبووی؛ بە پێچەوانەی ئەوەوە پێوانەیەکی تر دووپات کرایەوە کە دواتر ئەنجام درا): بە بەراورد لەگەڵ کێشکردنی زەویدا زاراوەی کێشکردن لە هۆکاری نادیاری هەموو ئەو دیاردانەدا بەکارمات، بەڵام لە راستیدا زۆر دوور بوو لەوەی هۆکاری دیاردەکانی تێدا بەدی بکرێ، تا ئەو رادەیەی کە بە شێوەیەکی نکوڵی لێنەکراو (ئەو یاسایەی دانا) هەموو کردارێك لە دوورەوە کارێکی مەحاڵە؛ خودی یەزدان بەدەر نیە لەم پرەنسیپە؛ هەر ئەوەش بوو وای لە نیوتن کرد کە بڵێ یەزدان لە هەموو خاڵێکی شوێندا ئامادەیی هەیە، بەو پێیەی ئەو ئامادەییە ئامادەییەکی بکەرو ئاقڵانەیە، کەواتە شوێن ئامراز (***Sensorium***)ی یەزدانە. لێرەوە بە هیچ جۆرێك ناکرێ تەفسیری کێشکردن بکرێ جگە لە کردەیەك کە لە پەیوەندی و کارلێکدایە؛ بەڵام وەك پێویستە دیاردەکان ناناسین تاکو کرداری لەمجۆرەی لێبکەوێتەوە: کەواتە بۆ نمونە لە پەراوێزی فەلسەفە ئەزمونیەکەیدا گریمانەی بوونی ئەتێرێك دەخاتە روو کە مادە لە ناویدا دەسوڕێتەوە، تایبەتمەندیی دیاردەکانی ئیشکردنیش لە رێگای هێزی پاڵنانەوە دەسەلمێنێ.

بەڵام کەس بە قسەی پێشنیازی ئەم مامۆستایەی نەکرد. دالمبیر ساڵی ***1751*** لە (گوتار دەربارەی ئەنسکلۆپیدیا)دا نوسیویەتی دەڵێ: "ئارەزوەکانی جێبەجێ نەبوون، رەنگە تا زەمانێکی دوور دووریش جێبەجی نەبن". بە پێچەوانەوە وا دادەنرا کە کارەکانی نیوتن لەگەڵ دۆزینەوەی کێشکردندا مەبەستی خۆی پێکاوەو تەواو بووە. کێشکردنی گەیاندۆتە ئاستی تایبەتمەندی مادە کە قابلی کورتکردنەوە نیە هەر وەکو دیاردەی کشان و بێلایەنی: هەر ئەمەشە ئەو راڤەکردنەی لە بەرچاوی هەمواندایەو، (دالمبیر)یش بەرگری لێدەکا، دالمبیر لە وەڵامی ئەو کەسانەدا کە (نیوتن)یان تاوانبار کردبوو بەوەی پەنا دەبا بۆ چۆنیەتی پەنهانەکان وتبووی: "چ زیانێکی بە فەلسەفە گەیاندوە کاتێ زەمینەی بۆ

خۆش کردین کە وا دلنیێن دەکرێ مادە خاوەنی ئەو خەسڵەتانە بێت کە گومانمان لە بوونیان نیەو، لەو وەهمە دەربازمان بوو کە لە ناخماندا جێگیر ببوو بەوەی متمانەیەکی کۆمیدیمان هەبوو کە ئێمە شارەزای هەموو ئەو خەسڵەتانەین؟".

ئەم خاڵە تەواو پێچەوانەی ڕۆحی دیکارتییە کە لەسەرچاوەیەکی دیارو سەربەخۆوە ڕێچکە دەگرێ و دەیگەیەنێتە ناسینی ماهیەتی مادە لە ڕێگای پەیپێبردنەوە. هیچ ڕێگەچارەیەکیش لە ئارادا نیە بۆ ئەوەی شتی تازەی بخەینە پاڵ: لە ڕێگای ڕاوێژکردن بەم بیرۆکەیەوە ئینسان پەی بەو تایبەتمەندیانە دەبا کە لەگەڵ مادەدا دەگونجێن. بەڵام نیوتنیەکان لای مامۆستاکەیان بنەمایەکی جیاوازیان دۆزیەوە بۆ دەستنیشانکردنی تایبەتمەندییە گشتیەکانی مادە. لە بنەمای چوارەمی ڕێساکانی فەلسەفاندا *Regulae Philosophandi* هاتووە: "خەسڵەتەکانی ئەو تەنانەی کە ناکرێ زیادو کەم بکرێن و، دەچنەوە سەر هەموو ئەو تەنانەی کە ئەزمونکارییان تیادا دروستە، پێویستە خەسڵەتی تەواوی تەنەکان دیاری بکرێ": دوا قسەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەزموون و تێبینی. وردبوونەوەکانی لۆك دەربارەی گەوهەر لە کتێبی (هەوڵێك بۆ تێگەیشتن لە مرۆڤ)دا پشتگیری ئەم بنەمایەی نیوتن دەکا: ئەویش بڕوا بەوە دەهێنێ کە هیچ ڕێگەیەکمان لە بەردەمدا نیە بۆ ناسینی گەوهەر جگە لە ڕێگای ئەو تایبەتمەندیانەی کە خودی ئەزموونمان وەك یەکەیەکی لێك نەترازاو بۆ دەردەخا. لە کاتێکی وادا دروستە بەڵکو پێویستە لە سەرمان ئەو کێشکردنەی کە نیوتن باسی لێوە کردو ڕوونی کردەوە بگەڕێنینەوە بۆ مادە: کەواتە پێودانگ *Mesure* زەمینە خۆش دەکا بۆ ئەوەی لە شوناسی خەسڵەتێك لە خەسڵەتەکانی بکۆڵینەوە. ڤۆلتێر دەڵێ: "ئەو هێزە بەراییانەی کە سروشت بەکاریاندێنێ ناکرێ بکرێنە بابەتی قسەکردن ئەگەر ملکەچی پێوانە نەبن".

کەواتە بە بڕوای نیوتنیەکان کێشکردن خەسڵەتێکی نکوڵی لێنەکراوە لە خەسڵەتەکانی مادە، هەرچەندە بەڵگەهێنانەوە لەمبارەیەوە کارێکی سەختە. ڤۆلتێر وەرگێڕی بۆچوونێك بوو کە ئامادەییەکی بەربڵاوی هەبوو، بریتی بوو لەوەی کە زانستی سروشتی تەنها لە ڕێگای بەڵگەوە دەستنیشان دەکرێ، لە ژمارەی دیاریکراوی خەسڵەتەکانی مادەوە دەستپێدەکا کە هەستەکان پێمان دەبەخشن. لەمبارەیەوە دەڵێ: "تاکو زیاتر لە ئەندێشەدا ورد ببمەوە، ترسی مرۆڤ بۆ سەلماندنی بنەمایەکی نوێ و خەسڵەتێکی نوێی مادە زیاتر سەرسامم دەکا. ڕەنگە خەسڵەتەکانی مادە لە ژماردن نەیەن؛ چونکە لە سروشتدا هیچ شتێك لە شتێکی تر ناچێ[٥].

لێرەوە فەلسەفەی سروشت لە فەلسەفەی زەین ڕزگاری بوو، چونکە دەرکەوتە سەرەتاییەکان کە سروشت ڕاڤەدەکەن دەرکەوتی ئەزموونین، کە ئەقڵ بە هیچ کلۆجێك ناچێتە سەریو، ناکرێ هۆکارەکانیان دەستنیشان بکرێ. دواتر زنجیرەی ئەو سەختیانە دەردەکەوێ، کە زادەی ئەم ئاراستە ئەزمونگەرییە بوون لە سەدەی هەژدەدا.

بە کورتی زانستی نیوتن لە ڕووی فەلسەفییەوە توشی گومان و نادڵنیاییمان دەکا: دەکرێ ڕەوتی میکانیکی ئەو ڕووەو لاهوت یان بەرەو ماتریالیزم ئاراستەمان بکا؛ ئەو خاڵەیشی کە لێکدانەوەی لەسەر بەندە ڕوون و ئاشکرا نیە، ئەوە نازانین کە ئایا لە توانای زەیندا هەیە دووررتر لەو خەسڵەتە پەنهانانەی کە بە ئەزموون بەخشراوە بڕوانێ: شتێك هەیە لە نێوان وردیی ئەنجامەکان و شڵۆقی پرەنسیپەکاندا توشی سەرسامیمان دەکا: هەر ئەوەش خودی ئەو بابەتە ناوەکییەی لایەنێکی گرنگی فەلسەفەی سەدەی هەژدەیەمە.

(2)

## بڵاوبوونەوەی فیکری لۆك

لە (گوتار دەربارەی ئەنسکلۆپیدیا)دا دالمبیر نوسیویەتی و دەڵێ: "دەکرێ بڵێین لۆك میتافیزیکی داهێنا، هەروەکو چۆن نیوتن فیزیکی داهێنا". وشەی میتافیزیك لێرەدا، هەروەکو زۆر جار لە سەدەی هەژدەیەمدا بەکارهاتووە، ئاماژەیە بۆ کتێبەکەی لۆك (هەوڵێك بۆ تێگەیشتن لە مرۆڤ)، واتە لێکۆڵینەوە دەربارەی ئەقڵی مرۆڤ و وزەو سنورەکانی. ئەڵبەتە لۆك لەو هەوڵەداو لە بابەتی تێگەیشتندا دەربارەی بابەتە پەیوەندیدارەکان بە میتافیزیکەوە قسەی دەکرد، وەك بیرۆکەی بێکۆتایی، بابەتی ئازادیی، رۆحانیەتی دەرون، بوونی یەزدان و جیهانی دەرەکی: بەلام ئەو ئەم بابەتانەی لە خودی خۆیدا چارەسەر نەکرد، بەڵکو لە سۆنگەی ئارەزوییەوە بۆ دیاریکردنی ئەو مەودایەی کە دەکرێ زەینی مرۆیی پێی بگا ئەو کارەی لە چەند بابەتێکی لەو جۆرەدا ئەنجامدا، بوفییە (1661-1737) دەڵێ: "بابەتی میتافیزیك بریتیە لە ئەنجامدانی شیکردنەوەیەکی زۆر راست بۆ بابەتەکانی زەین بەوەی کە دادگایی کردنە ئەقڵیەکانمان دەرهەق بە شتەکان بەوپەڕی دروستیو وردییەوە ئەنجام بدەین"[6].

فیکری لۆك لە سەرەتای سەدەی هەژدەیەمەوە بە شێوەیەکی بەرفراوان لە ئەوروپا بڵاوبۆوە؛ کورتەی کۆشش *Abrege de Lessal* کە لوکلێرك ساڵی *1688* بلاوی کردەوە، وەرگێڕانەکەی کۆست *1700* بە چاپە یەك لە دوا یەکەکانیەوە، وەرگێڕانی پوختە ئینگلیزیەکە بە پێنوسی واین کە باسیە لە ساڵی *1720*دا بلاویکردەوە، رۆڵێکی زۆری بینی لە بلاوکردنەوەی بەرفراوانی ئاراستە رەسەنەکەی، دواتر بووە مایەی مشتومڕ لە بوارە زانستیەکاندا، لەوانە هەواڵەکانی کۆماری ئەدەبیات *Nouvelles de la Republique des Lettres* لە ئابی *1700*، یادگاریەکانی تریفو *Memoires de Trevoux* لە حوزەیرانی *1701*، مێژوی کاری زاناکان *Histoire des ouvrages des savants* لە شوباتی *1705*، کتێبخانەی هەڵبژاردە *Bibliotheque choisie* کە شەش بەرگەو لە ساڵی *1705*دا بڵاوکراوەتەوە. بە ماوەیەکی درێژ پێش ڤولتێر بۆفیە لە ساڵی *1717*دا بە (باسێك دەربارەی حەقیقەتە سەرەتاییەکان)دا وتبووی: "میتافیزیکی لۆك لایەکی ئەوروپای لەو وەهمانە بە ئاگاهێنایەوە کە خۆیان وەك ئاراستەی فیکری نمایش دەکرد"، ئەو مەبەستی لە مەزهەبەکانی دیکارت و مالبرانش بوو کە بە بەراورد لەگەڵ مەزهەبەکەی لۆکدا وەك پەیوەندی نێوان رۆمان و مێژو وایە. ئەو نامە فەلسەفیانەش کە ڤولتێر لە مانەوە درێژەکەیدا (*1726–1729*) لە ئنگلتەراوە لەگەڵ خۆیدا هێنایەوە، شتێکی تازەی نەهێنایە ئاراوە، جگە لە دەستەبەرکردنی سەرکەوتنێك کە پێشتر لە ئارادا بوو.

### پەراوێزەکان:

*1–روبەرت بویل: زانایەکی فیزیکی و کیمیکی ئایرەلندییە (1627–1691) یاسای پەستانی گازەکانی داناو، رۆڵی ئۆکجسینی لە سوتاندا دۆزییەوە.*

*2–لە بۆسکۆ وەرگیراوە: پێکهاتنە گەردوونییە تازەکان Les comogonies modernes پاریس 1924ن ل 52.*

*3–لیون بلوخ: فەلسەفەی نیوتن، پاریس 1908، ل 502.*

*4–بۆسکۆ: سەرچاوەی پێشوو، ل 53.*

*5–فەلسەفەی نیوتن، بەشی دووەم.*

*6–پرەنسیپەکانی میتافیزیك، چاپی بویە، ل 260.*

### سەرچاوە:

*امیل برهییە، تاریخ الفلسفة– القرن الثامن عشر، نیوتن و لوك. ت: جورج طرابیشی. (ط1: بیروت: دار الطلیعة للطباعة و النشر، 1983)، ص 5–15.*

# "یۆرگن هابرماس" و

## ئەقڵانیەتی کۆمینیکا شیۆنخوازی

▪ هاشم ساڵح

● و. لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد



یۆرگن هابر ماس

بۆ ئـەوەی بە وردی لـە تیۆریاکـەی "هابرمـاس" تێبگـەین ناچارین بـەوەی ڕونکردنـەوە لەسـەر دوو زاراوە بدەیـن: زاراوەی کـردار و زاراوەی پـەیوەندی خـوازی (بەمانا فەلسـەفیەکەی). چونکـە بـەردەوام جیاوازییەك لە نێوان مانای فەرهەنگی وشەیەك و مانا زاراوەییەکـەیدا هەیە کـە فەیلەسـوفێکی دیـاریکراو دەیهێنێتـە ئـارا. وەکـی ئاشکراشـە تەنـها مەزنـە فەیلەسوفەکان دەتوانـن زاراوەی گـەورە دابـهێنن، پاشان توێژەرەوانی دیکە لێیان وەردەگرن و دەبێتـە مولکی فیکر.

"هابرماس" لێرەدا مەبەستی لە چەمکی (کردار) کۆستژۆلکردنی حاڵـەتێکی دیاریکراوە. ئەمـەش لانـی کەم پێویستی بە دوو بکـەر یاخود دووکـەس هەیـە.. بـە بـەردەوامی حاڵـەتێکی دژوارو ناهـەموار لـە گۆڕێدایەو پێویست بە چارەسەرکردن دەکات، بۆ ئەم

مەبەستەش دوو کەس یان چەند کەسێك قسەو باسی لە بارەوە دەکەن و هەوڵی چارەسەرکردنی دەدەن.

بەمجۆرە ئەوا کردەی کۆمەلایەتی بە پێویست بریتی‌یە لە کردەیەکی کۆمنیکاشیۆنی. لەبەرئەوەی مرۆڤ بە تەنها ناتوانێت هیچ شتێك بکات. کۆمەلگاش لە رێگای گفتوگۆو پەیوەندی و دانوستان و سازشکردن و چارەسەرکردنی کێشەکانەوە بەرێوە دەچێت. واتە کێشەکان لەناو کۆمەڵداو لەسەر هەموو ئاستەکان ئالۆز دەبن و، بە دیالۆگ و پەیوەندی و دانوستان چارەسەر دەکرێت و کۆتاییان پێ دێت. ئەمەش پرۆسەیەکی بەردەوامە. چونکە نە کێشەکان کۆتاییان دێت و نە چارەسەرەکانیش، مادامەکی کۆمەلگە زیندووەو ژیان تێیدا بەردەوامە.

کردەی کۆمەلایەتی یان مومارەسەی کۆمەلایەتی، مومارەسەیەکی ئەقلانی یاخود مەبەستدار یان هەلگری مانایە. هەرچی مومارەسەیەکی بێ سەروبەرە یان ئانارشیستانەیە، بە بۆچوونی "هابرماس" بە مومارەسە لە قەڵەم نادرێت.. بەلام با بزانین مەبەستی ئەم فەیلەسوفە لە زاراوەی دووەم: کە زاراوەی (کۆمنیکاشیۆنی)یە چی‌یە؟

سەرەتا دەبینین مەبەستی ئەو لەم چەمکە نە دیالۆگەو نە گواستنەوەی زانیاریە، بۆ نمونە وەکی ئەوەی لە دەزگاکانی راگەیاندن یاخود لە کۆنفرانسەکاندا روودەدات، کاتێك هەر کەسەو باری سەرنجی خۆی دەخاتە روو. بەلکو مەبەستی "هابرماس" لایەنی پراگماتی زمانە: واتە زمان بە حوکمی سروشتی خۆی پەیوەندییەك دەخولقێنێ یاخود شتێك دێنێتە ئاراوە کە پێی دەوترێت (پەیوەندی)، ئەمەش یەکەمین ئەرك و فەرمانی زمانە. ئەم پەیوەندییە زمانەوانییەش دەبێتە مایەی پێکەوە ژیان یاخود تەبابوون لەگەڵ یەکدیدا.

بە بۆچوونی "هابرماس" زمان و تەبایی دوو شتی پێکەوە بەستراون (بێگومان زمان وەزیفەی تریشی هەیە، بۆ نمونە وەکی وەزیفەی ستاتیکی یان شیعری..). بەلام وەك پێشتریش ئاماژەمان بۆ کرد ئا لێرەدا ناڕەزایی سەرەکی دژ بە "هابرماس" بەرز دەبێتەوە، ئەویش ئەوەیە: هەمیشە زمان بە مەبەستی تەبایی یان رێککەوتن بەگەڕ ناخرێت، بەلکو لەوانەیە بەمەبەستی دیکەی وەك یاریکردن یان فریودان و لە خشتەبردنی ئەوانی دیکە بەکاربهێنرێت.

رەنگە بە رووکەش وا نیشان بدەین کە ئێمە تەباییمان دەوێت، پاشان هەوڵ بۆ بە ئەنجام گەیاندنی مەبەستێکی دیکە دەدەین کە تەواو پێچەوانەی ئەو مەبەستەیە لە سەرەتادا نیشتانماداوە. سەرەرای ئەوەش کردە یاخود مومارەسە بە پێویست هەمیشە کۆمنیکا شیۆنخوازی ئیجابی نی‌یە کە مەبەستی بەرژەوەندی گشتی دەستەجەمعی بێت. لەبەر ئەوەی رەنگە زمان یان گوتار بۆ مەبەستی جێبەجێکردنی مەرامی تایبەتی بەکاربهێنرێت، بەبێ گوێدانە بەرژەوەندی گشتی.

بەلام وەها رەخنەیەك لە "هابرماس" شاراوە نی‌یەو دەزانێت شتێکی لەو جۆرەی رووبەڕوو دەبێتەوە، هەر بۆیە ئەم مومارەسەیە بە (ستراتیژی) ناو دەبات، ئەویش بە مەرجێك کە لێرەدا مانایەکی تایبەت ببەخشینە چەمکی ستراتیژی. واتە ئەو کردە ئینتیهازیەی مەبەست لێی بەدەست هێنانی سودێکی تایبەتی- شەخسی‌یە، بەبێ ئەوەی گوێ بە تەبایی و ئاسوودەیی دەستەجەمعی نێوان مرۆڤەکان بدات، لە جەوهەردا مومارەسەیەکی (ستراتیژی)یە.. بەمجۆرە ئەوا کردەی کۆمنیکاشیۆنی بە بۆچوونی "هابرماس" پێچەوانەی کردەی ستراتیژی، یاخود مومارەسەی هەلپەرستانەیە.

بەلام لەوەش بە ئاگاین کە کردەوەکانی مرۆڤ هەرچەندە مرۆڤدۆستانەو مەزنیش بن، بەلام هەر شتێك لە ستراتیژی و هەلپەرستی تێدایە. لەبەرئەوەی مرۆڤ لە هەمان کاتدا بیر لە

بەرژەوەندی تایبەتی خۆشی دەکاتەوە. بیرکردنەوەش لە بەرژەوەندیە تایبەتیەکان پێ دەچێت ماندەرێك بێت بۆ کارکردن و چالاکی نواندن و بەدەستهێنانی دەسکەوت. هەمان شت دەکرێت دەربارەی پەیوەندی نێوان کەسەکانیش بوترێت، چونکە ئەویش بۆ خۆی لە موماره‌سەی ستراتیژی (بە مانا هابرسمایی‌یەکەی) و لە حساباتی تایبەتی خالّی نیە.

با گەر بۆ چرکە ساتێکیش بووە بیر لە پەیوەندی نێوان خاوەن کار بە کرێکارەکانی بەردەستیەوە، یان بیر لە پەیوەندی فەرمانبەرێك بە هاوەڵەکانیەوە، یاخود پەیوەندی مامۆستایان لەگەڵ یەکتری‌دا، یان تەنانەت بیر لە پەیوەندی باوکان بە فرزەندەکانیانەوەو.. هتد، بکەینەوە، تەنانەت دەکرێت بڵێین دامەزراندنی پەیوەندی دیموکراسی لە کۆمەڵگە پیشەسازییە پێشکەوتووەکاندا یان هەوڵدان بۆ بە دام و دەزگاییکردنی لە رێی پەرلەمانەوە، جگە لە پرۆسەیەك لە پرۆسەکانی پەیوەندی ستراتیژی شتێکی دیکە نی‌یە.

با لێرەدا بیر لە شێوەی مامەڵەکردنی ئەندام پەرلەمانێك بکەینەوە کە چۆن چۆنی سەوا لەگەڵ دەنگدەرانی‌دا دەکات و، چۆن تویژێك لە دەست و پێوەند دروست دەکات تا لە پێناو بەرژەوەندی خۆی‌دا کاریان پێ بکات.. بە کورتی دەتوانین زیاد لە نمونەیەك لەسەر کاروکردەوەی (ستراتیژی) بهێنینەوە کە هەموو رۆژێك کۆمەڵگای لێ پڕ دەبێت. تەنانەت دەتوانین بپرسین ئاخۆ بە راستی کردەی کۆمنیکاشیۆنی کردەیەوەك کە لە بەرژەوەندی تایبەتی بەدوور بێت لە ئارەدا هەیە؟ یاخود تەواوی کاروکردەوەکانمان (ستراتیژی) و پراگماتی و شەخسی‌یە..

لەبەر ئەم هۆیە "هابرماس" بە یۆتۆبیستی کۆمەڵایەتی یان تەنانەت بە کاڵفامیش تۆمەت بارکرا.

لەبەر ئەوەی ئەو پێی وایە خەڵکی هەموو دڵساف و چاکەخوازان و، هەوڵی پەیوەندی بەستن و دیالۆگ و پێکەوە ژیان و تەبایی دەدەن.. لە راستی‌دا ئەوەی زیاتر بێ تاقەتی دەکات ئەم تاوانبارکردنەیەتی بەوەی کەسێکی یۆتۆبی بێت، چونکە ئەو لە سروشتی مرۆڤ و خودپەرستی و خواست و مەبەستەکانیان بێ ئاگا نی‌یە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سوورە لەسەر ئەوەی بڵێت: ئەگەری پەیوەندیەکی ئەقڵانی (پەیوەندییەك لەسەر ستراتیژو بەرژەوەندی تایبەتی دانەمەزرابێت) لە ئارەدایە. ئەڵبەتە لێرەدا وشەی (ستراتیژی) بە مانا سلبیەکەی بەکارهاتووە. واتە بە مانای تاکتیکی لە واقیعداو، پێویستە ئەوەمان لەیاد نەچێت.

دەبێت بزانین تێرمی (کردەی کۆمنیکاشیۆنی) لای "هابرماس" مانای ئەگەرێکی کراوەیی هەیە، زیاد لەوەی مانای ئەمری واقیع بگەیەنێت. ئەو گریمانەی بوونی دەکات، بەڵام گەرەنتی ئەوە نادات بەشێوەیەکی بەردەوام لەسەر زەمینەی واقیع بەرجەستە بێت. هەر لەبەر ئەم هۆیە "هابرماس" باس لە یەدەگی ئەقڵانیەت یان لە ئەقڵانیەتی شاردراوە دەکات. ئەمەش دوو دەرەنجامی گرنگی لێ دەکەوێتەوە: یەکەمیان ئەوەیە کە تێرمی کردەی کۆمنیکاشیۆنی -بە مانا ئیجابیەکەی- دەرفەتی ئەوەی بۆ دەڕەخسێنێ تا ئەو ئەقڵانیەتە شاردراوەیە قوتار بکات، ئەو ئەقڵانیەتەی مۆدێرنێتی لە هەناوی خۆیدا هەڵی گرتووە. دووەمیشیان ئەوەیە کە چەمکی ئەقڵی کۆمنیکاشیۆنی بواری تازەکردنەوەی (تیۆریای رەخنەیی) قوتابخانەی فرانکفۆرتی دەداتێ، ئەو تیۆریایەی بە شێوەیەکی تایبەت هەریەك لە "ئادۆرنۆو هۆرکهایمەر" هێنایانە ئارا.

لە بەرامبەر ئەو ئەو بەربەریەت و نامرۆڤایەتیەی ئەقڵانیەتی تەکنۆلۆژی (کە ئەقڵانیەتێکی دیسپلینی

و تۆتالیتاریی‌یـه) لـه تـــەواوی بوارەکـانی ژیـانی خۆرئـاوادا دروسـتی کـرد، ئـەم دوو فەیلەســووفە هەڵگەڕانەوەو بوونـە دوو نـەیاری ئـەقڵ، لـە کاتێکدا لەوەوبـــەر بـــە توندی داکۆکیـان لێی دەکـرد.. گەورەترین تراژیدیاش ئەوەیە فەیلەسوف خۆی ببێتە دوژمنـی ئـەقڵ. "هابرماس"یش بۆ ئـەوە هـات تـا چەمکی ئەقل و ئەقلانیەت لە ئاسـەواری ئـەم رەخنـە توندوتیـژە قوتـار بکات و پێیـان بڵێت: ئـارام بـن، قوربانی بە هەموو شتێك مەدەن، هەموو شتێك وێـران مەکەن.

راسـتە ئـەقڵی رۆشـنگەری بـە لاڕێـدا بـراو، لـە مەبەسـتە سـەرەتاییەکانی خۆی دوور خرایـەوەو بـۆ مەبەستی دیکـەی نامرۆڤانـە بەگـەڕ خرا، بـەڵام ئـەم بەهانەیە بـەس نی‌یـە بۆ ئـەوەی قوربـانی بەتـەواوی دەسـکەوتەکانی مۆدێرنێتـــی و ئەقلانیـــەت بدەیـــن. ئەلبەتـە تێگەیشـتن لـەم جۆرە رەخنەیـە تەنـها لـە چوارچێوەی سیاقی مێـژووی خۆرئـاوا، ئـەزموونی ئەقلانیەت و مۆدێرنێتـی خۆرئـاوا خۆیدا دەبێت، لـە ماوەی دوو سـەد سـاڵی رابـردوودا. پێویسـتە لەسـەر خوێنـەری عـەرەبی هـەندێك هـەوڵ (یـاخود هـەوڵێکی زۆر) بدات، بۆ ئەوەی لە هۆکاری هـەموو ئـەو هێرشـە تێبگات کە لە ناو وڵاتانی مۆدێرنێتی‌دا دەکرێتە سـەر ئەقلانیەت و مۆدێرنێتی!

رەنگـە ئـەم خوێنـەرە بپرسـێت: چـۆن دەبێـت فەیلەسـوفێك کـە گـەردێك ئـەقڵ لەسـەری‌دا بێـت، پـەلاماری ئـەقڵ بـدات؟!.. بـەڵام ئـەم پرسـیارو سەرسامیە دەڕەوێتەوە، گەر هاتوو ئەو مشتومڕەمان خستەوە نـاو سیاق و چوارچێوە مێژووییـە راسـت و دروستەکەی خۆیەوە. سەرباری ئەوەش کۆمەڵگاکانی ئێمە پێویسـتیان بـە نوێبوونـەوەو ئەقلانیـەت هەیـە، ئەوە بـە پێچەوانـەی کۆمـەڵگا ئەوروپاییەکانـەوە کـە تـەواو لـە مۆدێرنێتی‌و ئەقلانیـەت تـێربوون. ئەمـەش دەمانباتەوە سـەر تەئکیدکردنـەوەی ئـەو بۆچوونـەی پێشتر باسمانکرد، ئەویش ئەوەیـە: بزاوتـی فیکـر بـە بزاوتی کۆمەڵگەو مێژوو و پێداویستییەکانیەوە گرێ دراوە.. ناتوانین لـە هیـچ تیۆریایـەکی فکـری بگـەین، گەرهاتوو لەو سیاقە مێژووییەی خۆی دەرمانهێنا کە تیایدا هاتۆتە ئاراو گەشەی تێدا کردووە.

پێویسـتە لـێرەدا ئـەوە بـە بـیر بهێنینـەوە کـە هـــەردوو پێشـــەنگی قوتابخانـــەی فرانکفـــۆرت "هۆرکهایمـەرو ئـادۆرنۆ" وەهـا سـەیری ئەقلانیـەتی نـوێی خۆرئاوایان دەکـرد کـەوا بـە پلـەی یەکـەم ئەقلانیـەتێکی ئـامێری‌و چەوسـێنەرە، لـە دیدی ئـەم ئەقلانیەتـە ئامێریـە زۆر سـاردو سڕەشـەوە هـەموو شتەکان بوونەتە (کاڵا)، لەوانەش زۆر لە بـەها روحـی و ئینسانیە بەرزو باڵاکـان. ئەقلانیـەتی سەرمایەداری تۆتالیتـاری دەسـتی دایـە سـەرکورتکردنی هـەموو ئەوانەی لـە بەرامبـەر نمونـەی تـاك رەهەندانـەی ئـەم ئەقلانیەتەدا کەوتنە بەرخورد. ستالینیەت و نازیزم گەورەترین بەرجەستەکردنی ئەو شێواندنە ترسـناك و تۆقێنەرە بوون کە دووچاری ئەقڵی خۆرئاوا بوو.

بەڵام گرفتـی ئـەم دوو مەزنـە فەیلەسوفە ئـەوە بـوو هـەر بـەوەندەوە وەسـتان کـە سـەرکۆنەی ئەقلانیـەتی خۆرئـاوا بکـەن و، رەخنـەی ئـەوەی ناراستە بکـەن کـە لـە راسـتە رێـڕای خـوی لایداوە، بـەبێ ئـەوەی ئەلتـەرناتیڤێك پێشـکەش بکـەن، تایبەتمـەندێتی "هابرمـاس"یـش لێرەدایـە: لەبـەر ئـەوەی ئـەو بۆ ئـەوە هـات تـا ئەلتـەرناتیڤێك بخاتـە بەردەسـت و، سـەرلەنوێ متمانـە بـە ئـەقڵ ببەخشینەوە.

"هابرماس" پێی وایە "ئادۆرنۆ" پەی بە بایەخ و گرنگـی پـەیوەندی ئـازاد بـردووە، ئـەو پەیوەندیـەی ئەقلانیـەت بەرهـەم دێنـێ و دەبێتـە مایـەی ئـەوەی مرۆڤایـەتی لەگـەڵ خـۆی‌دا ئاشـت بێتـەوە، بـەڵام نـەیتوانی ئـەم مەسـەلەیە تـا دوا ئاسـتەکانی خـۆی بـەرێت، ئـەویش بـەهۆی هـەژمونی ئـەقڵ- ئـامێری

بەسەر بیرکردنەوەیدا. بە مانایەکی دی "ئادۆرنۆ" متمانەی بە ئەقڵی خۆرئاوا نەمابوو، ئەشی دەتوانی ئەو متمانەیە بەدەست بخاتەوە، یاخود دەکرێت بڵێین نەیتوانی سەرلەنوێ ئەو متمانەیە دەرهەق بە ئەقڵی خۆرئاوا بەدەست بهێنێتەوە.

رەنگە دڕندەیەتی نازیزم و جەنگی دووەمی جیهانی کە ئەو کات هێشتا لە مێشك و بیرکردنەوەیدا تازەبوون و ئەو تێیدا سەرگەرمی نووسین بوو، رێگەی ئەوەیان نەدابێ تا هەڵوێستێکی هێمنانە یاخود بابەتیانە لە مەسەلەکان وەرگرێت. مەسەلەکە هەرچۆنێك بێت ئەوا "هابرماس" پێی وایە کە هێنانە ئارای چەمکی (ئەقڵ ئامێری) لە لایەن "ئادۆرنۆ"ی مامۆستایەوە شتێکی تازە بوو، بەڵام هەر لە چوارچێوەی فەلسەفەی (خودهوشیاری)دا ماوەتەوە.. فەلسەفەی (خود هوشیاری)ش پشت بە دوالیزمەی (خود/ بابەت) دەبەستێت و ، هەموو کارلێکردنێکی ئەقڵانیش لە شێوەی ئەو پرۆسەیەدا دەبینێت کە مرۆڤ بەسەر سروشتدا مومارەسەی دەکات. لەم دوالیزمەدا مرۆڤ بریتییە لە خود (بکەر) و، سروشتیش بریتییە لە بابەت (کارلێکراو)، بەم پێیە ئەوا مومارەسەی ئەقڵانیەت بە مانای مومارەسەکردنی کۆنترۆلکردن دێت، واتە کۆنترۆلکردنی سروشت. بەمجۆرە (خودهوشیاری) گۆشەگیرو دابڕاو جیهان دەکاتە جیهانێکی بە شت بوو، لە هەمان کاتدا هەژموون و باڵادەستی خۆشی بەسەردا دەسەپێنێت.

"هابرماس" پێی وایە ئەم بۆچوونە "ئادۆرنۆ" خستویەتیە روو دەربارەی ئەقڵ ئامێری لە خۆرئاوادا، راستەو جێگای گومان نییە. چونکە مەسەلەکان لە رووی مێژووییەوە وەها روویانداوەو، نابێت ئینکاری ئەوە بکەین. بەڵام کێشەکە لەوەدایە کە ئەم بۆچوونە لاواز دەردەکەوێت کاتێك سەرەوەختی ئەوە دێت دەست نیشانی پێودانگێکی گونجاو بکەین، بۆ رەخنەگرتن لەو شێواندنەی تەکنۆلۆژیا لە کۆمەڵگادا خوڵقاندویەتی. لەبەر ئەوەی نمونەی ئەو (فەلسەفەی خودهوشیاری)یەی "ئادۆرنۆ" پراکتیزەی دەکات پرۆسەی ئەو کەرتکردن یاخود شێواندنەمان نیشاندەدات کە بە هۆی ئەقڵانیەتەوە بەسەر ژیاندا هاتووە، بەبێ ئەوەی بتوانێت ئەو شتەمان بۆ دەست نیشان بکات کە بە فیعلی لە میانەی پرۆسەی بە شت بووندا قرتێنراوە، ئەو پرۆسەیەی زادەی کۆمەڵگای ئاڵوێردکردنی سەرمایەدارییە.

بە کورتیەکەی "هابرماس" دەڵێت: (چەمکی ئەقڵ ئامێری لە پێناو تەفسیرکردنی باڵادەستی خود –یاخود مرۆڤ– بەسەر سروشتدا هێنرایە ئارا، نەك بۆ ئەوە هاتبێت تا پێمان بڵێت چ زیانێك بەر ئەو شتە کەوت کە کۆنترۆلکراو دەستی بەسەردا گیرا). لێرەوە تیۆریای کردەی کۆمینکاشیۆنی دێت بۆ ئەوەی یارمەتی تیۆریای رەخنەیی بدات (یاخود کامڵی بکات). هاوکات بۆ ئەوەش دێت تا جەوهەری مەسەلەکانمان بۆ راڤە بکات.

بە بۆچوونی "هابرماس" تەنها تیۆریی کردەی کۆمنیکاشیۆنی دەتوانێت ئەو رۆڵە پاوانخوازیەی ئەقڵ ئامێری رونبکاتەوە. بۆچی ئەو دەتوانێت بەو کارە هەستێ؟ لەبەر ئەوەی دەتوانێت شوێنی نەخۆشیەکەمان بۆ دەست نیشان بکات و پێمان بڵێت ئەوەی لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا گەندەڵ و خراپ بووە، کتومت ئەو خاڵە سەرەکیەیە کە جێگای کارلێکردنی کۆمنیکاشیۆنییە لە نێوان فەردەکانی ناو کۆمەڵگایەکی زیندوودا.

چونکە گرنگترین ئاڵوێردێك لە کۆمەڵگادا روودەدات بریتییە لە گفتوگۆو گۆڕینەوەی فکرو قسەو باس. ئەم جۆرە ئاڵوێردە بەر لە ئاڵوێردی ئابووری و بازرگانی و مادی دەکەوێت، لەسەرو ئەوانەوەیە. لەبەر ئەوەی رۆح بە نرخترین شتێکەو، هەرکاتێکیش پەیوەندی لەسەر ئاستی روحی وێران بوو، یان رۆح گەندەڵ بوو یاخود ناچار بوو بەوەی ئەو شتانە بکات

کە ویستی خۆی نیە، ئەوا هەموو شتێك وێران دەبێت.

بەم پێیە ئەوا گروپی قوتابخانەی فرانکفۆرت بەهەڵەدا چوون، چونکە رەخنەکانیان لە ئاست بەشتبوونی مادی ئاڵوێردکردن لە کۆمەڵگەی سەرمایەداریدا راگرت.. بەشتبوون قوڵایی رۆحی پێکاو، بەنرخترین ئەو شتانەی گرتەوە کە مرۆڤ خاوەنیەتی: وەك ئاڵوێردی فکری و گۆڕینەوەی قسەوباسی نێوان فەردەکان. ئەم جیهانە زیندووەی پڕیەتی لە دیالۆگ و ئاڵوێردی روحی و فکری لەنێوان مرۆڤەکاندا، لە لایەن ئەقڵ ئامێری و ئەقڵانیەتی ماتماتیکییەوە –ئەقڵانیەتێك کە تەنها بیر لە سوودو دەسکەوت دەکاتەوە– هێرشی کرایە سەر. لەم سەرویەندەدا نرخی مرۆڤ لە کۆمەڵگەی سەرمایەداری تازەدا یەکسانە بەو بڕە پارەیەی لە بانکەکاندا هەیەتی، بە واتایەکی دی: مرۆڤ بووە تەنها ژمارەیەك لە ریزی ئەو ژمارە زۆرانەی لە ژماردن نایەن.. پێم بڵێ چەندت هەیە، پێت دەڵێم تۆ کێیت.. بەمجۆرە پرۆسەی بە شت بوون لە کایەی شت و کاڵاکانەوە گوازرایەوە ناو کایەی مرۆڤ خۆی. واتە مرۆڤ بووە کاڵایەك لە ریزی کاڵاکانی دیکەو، بەنرخترین شتێکی لە دەست دا کە لە ئاژەڵان و تەواوی شتەکانی دیکەی جیادەکردەوە: واتە بڵێسەی رۆحی ناخی خۆی و مرۆڤایەتی خۆی لەدەست دا. ئەم جیهانە زیندووەی لەسەر تەبایی زمانەوانی یاخود دیالۆگی کۆمنیکا شیۆنی دامەزراوە، ئەوەیە کە "هابرماس" هەوڵدەدات تا لە ئاسەواری کۆمەڵگای سەرمایەداری رزگاری بکات، کۆمەڵگایەك کە هەموو شتێکی کردۆتە کاڵاو کڕین و فرۆشتنی پێوە دەکرێت، ئەم پرۆسەیە تەنانەت مرۆڤیش دەگرێتەوە!

لێرەوە "هابرماس" دەگاتە ئەوەی بڵاوبوونەوەی ئەقڵیەتی ماتماتیکی لە خۆرئاوادا، بە پرۆسەی (کۆلۆنیالیکردنی) سەرجەم بوارەکانی ژیان بشوبهێنێت.. پێویستە لەسەر ئەقڵانیەتی مرۆڤایەتی و ئەقڵانیەتی کۆمنیکا شیۆنخوازی بەهەر شێوەیەك بووە بەرەنگاری ئەوە بێتەوە.. ئەم کۆلۆنیالیکردنە پرۆسەیەکی سەرتاپاگیر نییەو، تا ئێستا بە شاراوەیی بڕێك وزەی نادیاری ئەقڵانیەت ماوە، گەر بێت و لەسەر ئەوە رێکبکەوین کە بەراوردو هاوشێوە کردنێك لە نێوان ئەقڵانیەت و ئەقڵ ئامێری یان تەکنۆلۆژی یاخود ئەقڵیەتی ماتماتیکی ساردوسڕدا نەکەین.. لەبەر ئەوەی ئەقڵ ئامێری –یاخود ئەقڵی هەلپەرست– کە لە ئێستادا لە کۆمەڵگا سەرمایەدارییە پێشکەوتووەکاندا باوە، تەنها شێوەیەکی دیاریکراوی جۆرەکانی ئەقڵە، نەك تەواوی ئەقڵ بێت.

ئا لێرەدا "هابرماس" بە بەراورد لەگەڵ قوتابخانەی فرانکفۆرتدا گۆڕانێکی چۆنایەتی بان بەرەو پێشچوونێکی یەکلایکەرەوە دێنێتە ئاراوە، ئەویش بەو پێیەی لە نێوان ئەقڵانیەتی ئامێری و ئەقڵانیەتی کۆمنیکا شیۆنخوازیدا جیاوازیەك دەکات و، سەرلەنوێ دەست بە هەڵسەنگاندنەوەی یەکەمیان دەکاتەوە. دەبێت بزانین ئەقڵانیەتی ئامێری لە هەموو جێگایەك و بۆ هەتا هەتایە بەدو نەفرەت کراو نییە. بەڵکو بواری تایبەتی خۆی هەیەو سوودی لێ دەبینرێت، بە مەرجێك زیادەڕۆیی تێدا نەکرێت.

ئاشکرایە ئەقڵانیەتی تەکنۆلۆژی –زانستی شارستانیەتی مادی تازەی دروست کردو ناکرێت دەست بەرداری بین، گەر بمانەوێت رەوتی شارستانیەت بەردەوام بێت. هاوکات "هابرماس" پێی وایە پەلهاویشتنی ئەقڵانیەت بۆ ناو تەواوی بوارەکانی ژیانی رۆژانەمان وەها نییە کە ببێتە مایەی بەشتبوونێکی ناچاریانەی بە زۆر. بەڵکو بە پێچەوانەوە، بە ئەقڵانیکردنی ژیانگا (یاخود جیهانی ژیانی رۆژانە) یەکێك لە دیاردەکانی ژیانی تازەگەری پێکدێنێت و ناکرێت پاشەکشەی لە بەرامبەردا بکەین و دەست بەرداری بین، چونکە بە فیعلی دەبێتە مایەی ئازادکردنی رەگەزی مرۆڤایەتی. ئەمە مانای وایە کاروباری ژیانی رۆژانە لە رێی هێزێکی

پیرۆزەوە (یاخود مەسیحی)یەوە، هێزێك كە لە دەرەوە بەسەریدا سەپێنرابێت، وەك چۆن پێشترو بە درێژایی چەندین سەدە لە ئارەدا بوو، بەڕێوە ناچێت.. بەڵكو مەنووكە ژیانی رۆژانە لە كۆمەڵگادا لە ژێر سایەی پرۆسەی پەیوەندی خوازی و ئەقڵانیەتی كۆمنیكا شێۆنخوازی مرۆڤەكاندایە. هاوكات كۆدەنگیش كە بەرهەمی مشتومڕو توێژی دیموكراسیانەی ئازادە، بووە بنەمای شەرعیەت یاخود مەشروعیەتی كۆمەڵگا ئەورووپیە تازەكان. بە مانایەكی مەشروعیەت لە كۆمەڵگا ئەورووپیەكاندا لە سەرەوە (واتە ئاسمان) داگیرایە خوارێ (واتە هێنرایە سەر زەوی)، واتە مەشروعیەت لە بری ئەوەی ئاسۆیی بێت بووە ستوونی.

بەڵام "هابرماس" لە بەرامبەر شاڵاوی تەكنەلۆژی بۆ سەر ژیانگا، یاخود بۆ سەر جیهانی ژیانی رۆژانە چی دەكات؟ "هابرماس" ئەم پرۆسەیە بەكارێكی پێویست دەزانێت بۆ ژیانی نوێ، كارێك كە ناشێت دەست بەرداری بین. بەڵام ئەو لەپای ئەمەدا دەیەوێت پەی بە مەترسیەكانی چوونە ناو جیهانێكی تۆتالیتاری بەرێت، جیهانێك ئامێر بە شێوەیەك كۆنترۆڵی بكات كە هیچ بوارێك بۆ ئازادی مرۆڤ، یاخود بۆ هەوڵ و دەست پێشخەریە شەخسیەكانی نەهێڵێتەوە.

وەكی دەزانرێت هەریەك لە "جۆرج ئۆرۆیل و ئادۆرنۆ" هاتنی ئەم جیهانە تەكنەلۆژیە ئۆتۆماتیكیەیان بە كارێكی حەتمی دەزانی و، لەمەشدا كۆتایی شارستانیەتی نوێ، یاخود بەشتبوونی تەواوی ئەو شارستانیەتەیان دەبینی. هەرچی "هابرماس"ە لای خۆیەوە پێی وایە كە ئاراستەكردنی ژیان لە لایەن تەكنیك (یاخود تەكنۆلۆژیاوە) جێگای مەترسی نییە، بە مەرجێك تایبەت بێت بە جیهانی مادی یان بەدی هێنانی پێداویستیە سروشتیەكانی مرۆڤ و، دەستەبەركردنی پێشكەوتن و خۆشگوزەرانی.

بەڵام كاتێك مەسەلەكە پەیوەندی بە پێداویستیە كلتوری یاخود رەمزی یان روحیەكانی مرۆڤەوە دەبێت، ئەوا پێویستە رۆڵی ئەقڵ ئامێری راگیرێت، بۆ ئەوەی بوار لە بەردەم دیالۆگ و گفتوگۆ ناوكۆیی نێوان فەردەكان و ئەقڵانیەتی كۆمنیكا شێۆنی بكرێتەوە. بەمجۆرە "هابرماس" بە رونی جیاوازی لە نێوان ئەقڵانیەتی تەكنۆلۆژی زانستی (یان ئامێری) و، لە نێوان ئەقڵانیەتی كۆمنیكا شێۆنخوازی ئازادو دیموكراسیدا دەكات. بە كورتی دابەشكردنی جیهان بە شێوەی "ئەفلاتۆن" بۆ مادەو رۆح، ئاراستەی چەمكی ئەقڵ دەكات لای "هابرماس".

بەهۆی ئەوەی ئەقڵ ئامێری لە سەردەستی "ئادۆرنۆ"و قوتابخانەی فرانكفۆرت تێكەڵ بە زۆر لە دەلالەتی سلبی بوو، "هابرماس" ناچار بوو لە بری ئەوە تێرمی ئەقڵانیەتی وەزائیفی بەكاربهێنێت. ئەقڵانیەتی وەزائیفی تایبەتە بە بەڕێوەبردنی كاروباری تەكنۆلۆژیاو پێداویستیە مادییەكانی ژیانی رۆژانە. هاوكات ئەقڵانیەتی كۆمنیكا شێۆنخوازی كە "هابرماس" بنەما پان و بەرینەكانی دارشت، بووە بەرپرسیار لە چارەسەركردنی گیروگرفتە نامادییەكان، واتە چارەسەركردنی كێشە كلتوری و سیاسی و رەمزیەكان، گەر نەڵێین كێشە روحیەكان.

بێگومان "هابرماس" ئەقڵانیەتی كۆمنیكاشێۆنخوازی دەخاتە پێش ئەقڵانیەتی تەكنۆلۆژیەوە، لەبەر ئەوەی رۆح زۆر لە مادە بەرزو باڵاترە، هەروەها لەبەر ئەوەی ئەوە مرۆڤە كە باڵادەستە بەسەر ئامێردا، نەك ئامێر باڵادەست بێت بەسەر مرۆڤدا.. دواجار ئامێر تەنها ئامرازێكە نەك ئامانج بێت. هەرچی مرۆڤە ئەوا یەكەمین ئامانج و دواین ئامانجە!

بەمجۆرە جێگای سەرسوڕمان نییە، "هابرماس" پشتیوانی لە هەموو ئەو هێزە ئازادیخوازنە كردبێت كە رووبەڕووی لۆژیكی سەرمایەداری پاوانخواز بوونەوە، ئەو لۆژیكە سەرمایەداریەی دەیەوێت

دەست بەسەر هەموو شتێکدا بگرێت و هەموو شتێك کۆنترۆڵ بکات. بەمەش بووە جۆرێك لە ویژدانی نیشتمانی ئەڵمانی. لە بەرامبەر شاڵاوی تەکنۆلۆژیادا بۆ سەر سروشت، یاخود هەژمونی تەکنەلۆژیا بەسەر سروشتەوە، چووە پاڵ پارتی سەوزەکانی ئەڵمانیا. هەروەها پشتیوانی لە ناڕەزایی بزوتنەوەی خوێندکاران کرد، دژی هێزە راستڕەوو کۆنسێرڤاتیفەکانی ناو کۆمەڵگەی ئەڵمانی. هاوکات لە دژی ئەو سیاسەتی گەشەی ئابوورییەش وەستایەوە کە بەهەر شێوەو ڕێگایەك بێت و، پێی وا بێت مادە یاخود ئابووری پێوەری هەموو شتێکە لە ژیاندا، هێرشێکی کردە سەر لۆژیکی سەرمایەداری چاوبرسی کە بە چاوێکی سووك دەڕوانێتە بەها روحیو کلتوری و ڕەمزییەکان، واتە تەواوی ئەو شتانەی سودێکی مادی مەلموسیان تێدا نییە. هەروەها دژی ئەو کێبڕکێ بێ ڕەحمانەش وەستایەوە کە لەسەر بازاڕو بەتاڵان بردنی جیهانی سێیەم و کۆمەڵگا هەژارەکانی باشور دەکرێت، لە لایەن وڵاتانی سەرمایەداری دەوڵەمەندو خاوەن پارەوە.

لە پای ئەمانەدا "هابرماس" پێی وایە ئەو هێزی بەرخوردەی لێرەو لەوێ لەناو کۆمەڵگا خۆرئاواییە تازەکاندا سەر دەردێنن، وەك: (خوێندکاران و سەوزەکان و ڕۆشنبیران و هونەرمەندان و، هێزە سۆسیال- دیموکراتەکان و کرێکاران و هێزە روحانیە منەوەرەکان..)، بریتین لەو یەدەگی ئەقڵانیەت و ئەقڵانیەتە شاراوەیەی لە تیۆریای کردەی کۆمنیکا شیۆنیدا باسی لێکردووە. ئەمانە گەشتوونەتە ئەوەی بتوانن لە بەرامبەر لۆژیکی سەرمایەداریدا سەرهەڵبین و، وەکی هێزێکی زیندوو کە مەنتقی بەشت بوونی جیهان و حاڵەتی تێ ئاوارەبوون و، لەدەست دانی ئەرو پاراوی روحانیەت و خۆ بەدەستەوەدان رەتدەکاتەوە، هەست بە هێزو بوونی خۆیان بکەن.

"هابرماس" وەکی هەر بیریارێکی مەزن پزیشکی نەخۆشیەکانە. بەو مانایەی ئەرکی ئەو ئەوەیە دەست نیشانی نەخۆشیو کەموکوڕییەکانی مۆدێرنێتی بکات. لەبەر ئەوەی بیرمەندی گەورە ئەوەیە کە بزانێت چۆن چۆنی لە ساتەوەختێك لە ساتەوەختەکانی مێژوودا، دەست نیشانی پەتاو نەخۆشیەکانی کۆمەڵگاکەی یاخود نەتەوەکەی بکات. گەر "رینێیە دیکارت" لە سەدەی حەڤدەدا ئەوەی کردبێ، "ژان ژاك رۆسۆ" و "ئەمانوێل کانت" لە سەدەی هەژدەدا بەو کارە هەستابن و "هیگڵ و مارکس و نیچەو فرۆیدو ماکس ڤیبەر" لە سەدەی نۆزدەدا ئەو ڕۆڵەیان گێڕابێت، ئەوا بێگومان "هابرماس" لە دوادوای ئەم سەدەی بیستەمەدا ئەو کارە دەکات.

بەڵام ئەڵبەتە لە پاڵ "هابرماس"دا کەسانی دیکەش هەن. گەر ئەو شەڕانە نەبوایە کە ئەم فەیلەسوفە ئەڵمانییە لەگەڵ هاوتا فەرەنسیو ئەمریکییەکانی وەك "میشێل فۆکۆو ژاك دێریداو ریچارد رۆرتی"دا کردنی، ئەوانەی دەتوانن تیۆریایەکی وردو تۆکمەی لەم جۆرە بهێنێتە ئاراوە، لەبەر ئەوەی شەڕی فیکری لە دژی کەسانی دی سوودی زۆرە بۆ دیاریکردنی پلەو پایەی تایبەتی خۆمان، هەروەها بۆ بەئاگابوونی لە سنووری هێزو توانای خۆمان و، توانستی ئەوانی دیکەش.

هەر بیرمەندێك بە رووی لێدوان و رەخنەکردندا نەکرێتەوە -تەنانەت گەر هەندێ جاریش رەخنەی بریندارکەر بوو- ئەوا مانای وایە ئەو بیریارە لە بیرکردنەوە وەستاوە، واتە ئەو کەسە بیریار نییەو بە بیریار نادرێتە قەڵەم. دیالەکتیکی کۆمەڵایەتی - مێژوویی بە تیشکی ئەو مشتومڕە توندو مێزگردانە روناك دەبێتەوە، هەر کۆمەڵگایەکیش بواری ئەوە نەدات مانای وایە کۆمەڵگایەکی داخراو و مردووە، واتە لە ژیان و جوڵە کەوتووە. "هابرماس" بۆ خۆی سودێکی زۆری لە رەخنەگرانی مۆدێرنێتی وەرگرتووە لە داڕشتنی تیۆریاکەیدا، ئەو تیۆریایەی سەرلەنوێ

متمانە بۆ مۆدێرنێتی و ئەقڵانیەت دەگێڕێتەوە. بە بۆچوونی ئێمەش بایەخ و دووربینی ئەقڵی ئەو لێرەدایە.

وەکی ئاشکرایە فەلسەفەی رەخنەیی بەردەوام لە ساتەوەختی "نیچە"وە، درێژە بە ئیدانەکردنی ئەقڵانیەت و مۆدێرنێتی دەدات. ئەوەتا "ماکس فیبەر" لای خۆیەوە باس لە (نائومێد بوونی جیهان و خاڵی بوونی جیهان لە مانا) دەکات). لەگەڵ هاتنی سەردەمی بۆ نوێگەری و ئەقڵانیەتدا. ئەندامانی قوتابخانەی فرانکفۆرتیش پێشبینی هاتنەئارای سەردەم و قۆناغێك دەکەن کە (کۆمەڵگا بە تەواوەتی لەلایەن ئامێرو تەکنەلۆژیاوە کۆنترۆڵدەکرێت) و مرۆڤ تیایدا تەنها رۆڵێکی سلبی دەبێت.

"میشیل فۆکۆ"ش باس لە (مەرگی مرۆڤ) یاخود کۆتایی فەرد دەکات، ئەو فەردەی لە ژێر باری بونیادە ئابووری و تەکنۆلۆژیە زەبەلاحەکاندا – کۆمەڵگا تازەکان لێوان لێوە لەمان– دەپلیشێتەوە. هەرچی "مارتن هایدگەر"ە ئەوا قسە لە (هەژمونی تەکنیك) و سەرکەوتنی رۆحی ئامێرخوازی دەکات، ئەوانی دیکەش باس لە وێران بوون و لێکترازان و لەبەریەك هەڵوەشانی مانا دەکەن، لە کۆمەڵگاکانی مۆدێرنێتی یان پاش مۆدێرنێتیو.. هتد.

هەموو ئەمانە پێشبینی هەرەسی یەکجارەکی پرانسیپەکانی فەلسەفەی مرۆگەریو ئاقاری و مرۆگەرییان دەکرد کە هەریەك لە "کانت– و– گۆتە" بنەماکانیان دارشت و، بڕوایان وابوو ئەگەری بونیادنانی شارستانیەتێکی گەشەنگ و روناك بە تیشکی ئەقڵ لە ئارەدایە.

تایبەتمەندێتی "یۆرگن هابرماس" لەوەدایە کە هەموو ئەم بڕیارە تورەو رەخنە توندانە بە جدی وەردەگرێت و، تەنها بەوەوە ناوەستێت سەرکۆنەی ئەوانە بکات کە ئیدانەی مۆدێرنێتی دەکەن، واتە تەنها ئیدانەی نائەقڵانیەتی "نیچە" یان "فۆکۆ" یاخود "دێریدا" و.. هتد بکات. بەڵکو ئەو وەکی فاتحێکی چەلەنگ و قارەمان بەرەو دۆزینەوەی مانایەکی تازە بۆ ئەقل هەنگاو دەنێت. ئەوکات بە بیرۆکە سادەو ساکارەکەیەوە تووشی راچڵەکینمان دەکات: ئەو ئەقڵ لەو پەیوەندیەدا دەدۆزێتەوە کە هەموو رۆژێك پرۆسەی کۆمنیکا شیۆنی زمانەوانی یان دیالۆگکردن لە نێوانماندا دروستی دەکات. بەمجۆرە دەیەوێت لە رێگای هێنانە ئارای چەمکی (ئەقڵی کۆمنیکا شیۆنی)یەوە، سەرلەنوێ چەمکی (ئەقڵی عەمەلی) لای "ئیمانۆیل کانت" دا بڕێژێتەوە.

بونیادی ناوکۆیی بۆ کارلێکردن لە نێوان فەردەکاندا کە لە دووتوێی ئەم ئەقڵەدا هەیە، بواری ئەوەمان بۆ دەرەخسێنێ تاوەکی یەك لە بەرژەوەندیەکاندا بەشدار بین و، بەرژەوەندی بکەینە حاڵەتێکی یۆنڤیرسالی. ئەویش لە رێگای مشتومڕو گفتوگۆو قسەگۆڕینەوەوە. ئەوکات ئەخلاقیەتی گفتوگۆو دیالۆگ دیدگایەکی دیکەمان دەداتێ، بۆ سەرلەنوێ بیرکردنەوە لە سیاسەت و لە مەشروعیەت.

چونکە مەشروعیەتی راستەقینە بریتیە لەو مەشروعیەتە دیموکراسیەی لە ئەنجامی دیالۆگی ئازادانەی نێوان فەردەکان لە دایك دەبێت و دێتە ئارا، واتە دیالۆگێك کە ئاستەنگی بۆ دروست ناکرێت و شمشێری لەسەر سەر راناگیرێت. کۆدەنگی ئازادیش کە بەرەنجامی ئەمجۆرە دیالۆگە بێت بۆ خۆی لە جەوهەردا بریتیە لەو شتەی، بنەمای مەشروعیەتی دیموکراسی لە کۆمەڵگا تازەکاندا پێکدێنێت.

***پەراوێز:***

***هەردوو بەشی (1) و (2) ی ئەم باسە لە ژمارە (11) و (12)ی گۆڤاری (سەردەم)دا بڵاو بوونەتەوە.*

***سەرچاوە:***


هاشم صالح: قراءة في الفكر الاوروبي الحديث– الطبعة الاولى، **1994**.

# رەخنه له عەقڵی زانستی

■ بابەك ئەحمەدی

● و. له فارسییەوە: رێبین هەردی



هۆسێرل

یەکێك له گرنگترین خەسڵەتەکانی رۆژگاری نوێ، عەقڵباوەڕیە. رەخنەگرتن له مۆدێرنه هەرگیز له رەخنەگرتن له عەقڵباوەڕی، جیا نەبۆتەوە. رەخنەگران له گۆشەی جیاوازەوە عەقڵانیەتیان هەڵسەنگاندووە و هەر گروپێك یەکێك لەم گۆشانەی به گرنگترین لایەن، زانیووە. (بەڵام) ئەوەی زۆربەی رەخنەگران له گرنگیدا هاوبیرن، دەگەڕێتەوە بۆ یەکێك له گرنگترین بانگەشەکانی رۆشنگەران: (واتە) عەقڵی زانستی، ئەوەی که پەرەسەندن و گەشەکردنی عەقڵنیەتی زانستی دەتوانێ رێگه بۆ خۆشبەختی کۆمەڵایەتی، بکاتەوە. بەڵام جگه له ژمارەیەکی کەمی رەخنەگران، ئەوانی دی پەندەکەی سپینۆزایان بەکار نەهێناوە، یان بەو بانگەشەیه پێکەنیون یان بۆ دەرئەنجامە کاراساتاویەکانی، گریاون (بێگومان ناکرێت هەندێك لەو دەرئەنجامانه جگه له کارەسات شتێکی دی ناوبنێین) بەڵام تەنها ژمارەیەکی کەمی بیریاران هەوڵیاندا بۆ ئەوەی جەوهەری ئەو بانگەشەیه بدۆزنەوەو تێیبگەن، و گروپێکی به راستی کەمیش که به پەنجەکانی دەست دەژمێرێن، توانیان لەو رەخنانەدا بەجێیەك بگەن.

رەخنەگران، رەخنەیان لەو زانست باوەڕیە دەگرت که میراتی رۆشنگەری بوو. له راستیدا له رەخنەگرتن له "رێبازی پەرستنی زانست"دا زیاتر

سەرقاڵی پەیڕەوانی سەدەی نۆزدەهەمی ڕۆشنگەران، بەتایبەتی ئەو ماتریالیزمانە بوون کە بیرکردنەوەی دۆگمایی و "تێگەیشتنی میکانیکی بۆ گۆڕانکاری واقعی بەرجەستەیان" بڵاو کردبۆوە. کەمتر ئەو ڕەخنانە ئاراستەی بناغەی مۆدێرنە و تەفسیری ڕۆشنگەران دەکرا. ڕاستە کە لە سەیدابوونی ڕۆشنگەراندا بۆ دەستکەوتەکانی زانست (کە خۆی زادەی بێزاریان بوو لە بنەمای میتافیزیکی و فەلسەفی تێڕوانینە "نازانستیەکان" زیادەڕەویەك دەبینرا، بەڵام بەگشتی ئەوان لە گرنگترین بەرهەمەکانیاندا چاویان لە "بنەمای میتافیزیکی خودی زانست" نەنوقاندبوو، تا ڕادەیەکیش لەو مەسەلەیە تێگەیشتبوون کە خاڵە بنەڕەتی و گرنگەکانی فەلسەفەی سروشت (ئەوەی ئەمڕۆ بە زانستی فیزیکی– سروشتی، ناوی دەنێین) کورت ناکرێنەوە بۆ ئەو باوەڕانەی کە لە ئەزموون و میتۆدە ئیستیقرائی، قیاسی یان گشتگیریە (تعمیم) تیۆریەکانەوە بەدەست دێت، بەڵکو سەرچاوەکانی (ئەو خاڵە بنەڕەتی و گرنگانە) دەبێ بناسرێ، واتە دەبێ لە دانوستان و وتوێژی فەلسەفەی سروشت لەگەڵ لقەکانی دی ئەندێشەی فەلسەفیدا، ئاگاداربین.

ڕەخنەگرانی سەدەی نۆزدەهەمی "پەرەستنی زانست" کە سەرچاوەی کارەکانیان لە بەرهەمی ڕومانسیەکاندا دەدۆزیەوە، بە شێوەیەکی ئاڵۆزو نا سیستماتیك، هێرشیان دەکردە سەر ئەو ڕۆحیەتە. ئەستەمە بتوانرێ لە نوسینەکانیاندا جیاوازی نێوان "زانست" و "زانستگەری" (Scientisml) بدۆزینەوە. ئەوان نەك هەر نیشانە کۆمەڵایەتیەکانی پەرەسەندنی زانستیان لەگەڵ "نیشانەکانی زانست"دا بەیەك شست دادەنا، بەڵکو هیچ جیاوازییەکیان لە نێوان ئەم دوانەو دەرئەنجامەکانی پەرەسەندنی تەکنەلۆژیادا، نەدەکرد بەڵام ڕەخنەگران پێ بە پێی پەرەسەندنی فەلسەفەی سروشتی سەدەی نۆزدە بۆ فەلسەفەی زانستی سەدەی بیستەم (واتە لەگەڵ وردبوونەوەی (تدقیق) زمانی لۆژیك و ماتماتیکی) (ئەوانیش) زمانێکی ڕاشکاوترو وردتریان دۆزیەوە. زاراوە تازەکان پەیدابوون و باسەکان بە شێوەیەکی دروست تر بەرەو پێشەوە چوو. ئێمە بۆ ئەم وردی و ڕاشکاوییە قەرزاریی پێشکەوتنی باسی مێژووی لە بارەی زانستیشەوەین. بێگومان بەرهەمەکانی مەزنانی وەك ئەرنست کاسیرەر و ئەلکساندەر کوئایدە، یارمەتیەکی زۆری پەرەسەندنی هەم فەلسەفەی زانست و هەم ڕەخنەگرتن لەو فەلسەفەیەیان دا.

## قەیرانی عەقڵباوەڕی

ڕەخنە لە عەقڵی زانستی لە نێوەندی سەرەتای سەدەی بیستەمداو پێ بە پێی پێشکەوتنی ڕەخنەی ڕادیکالانە لە عەقڵباوەڕی و قبوڵنەکردنی دەرئەنجامە زانستی و کۆمەڵایەتیەکانی مۆدێرنە، فۆرمەلە بوو. لێرەشدا کۆنەپەرستانێك هەبوون کە درێژە بە تێڕوانینی ڕۆمانسیەکان بدەن، بەڵام لە بەرامبەر ئەمەشدا فەیلەسوفانێکیش دەستیانکرد بە لێکۆڵینەوە، هەڵسەنگاندن و ڕەخنەگرتن لە ڕوحیەتی زانستی مۆدێرن. ئەدمۆند هوسرل دامەزرێنەری دیاردەگەری، لە کۆتایی ساڵە سەختەکانی ژیانیدا – کە نازیەکان مافی وانەگوتنەوەیان لێ زەوت کردبوو، و ڕێگەی بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانیان نەدەداو لە ڕاستیدا خانەنیشن کرابوو– ڕوویکردە مەسەلەی قەیرانی زانستی ئەورووپی. چەندان ساڵ پاش مردنی هوسرل، کتێبێك کە یاداشتە فراوان و کۆمەڵە ئەسڵێکی کاملی نوسینەکانی ئەو سەردەمەی لەخۆ گرتبوو، بڵاوکرایەوەو جێگەیەکی بڵندی لە وتوێژی

فەلسەفی لە بارەی رەخنەگرتن لە زانستی ئەورووپییەوە، داگیرکرد.

ئەوەی لە باسکردنی دوا بەرهەمی هوسرل دا ئاسان و زوو لە بیر دەچێتەوە ئەو راستییەیە کە سەرەتای کارەکەی نەك رەخنەگرتن لە زانست بەڵکو رەخنەگرتن لە عەقڵباوەڕی بووە[1]. ئەو لەم بابەتەدا کارەکەی لەو خاڵەوە دەست پێکردبوو کە چەند دەیەك پێشتر نیتچە هەر لەوێوە بنەمای عەقڵباوەڕی رۆژئاوایی، خستبووە ژێر رەخنەوە. هوسرل خۆی لە وتارێکدا کە لە حەوتەم و دەیەمی مانگی مەی *1935*دا لە ڤینا بەناوی "فەلسەفە لە قەیرانی مرۆڤایەتی ئەورووپیدا" خوێندیەوە (و یەکێك لەو دوو وتاربێژیە گشتیە بوو کە لەو ساڵە شەوە زەنگانەدا خوێندیەوە) وتی "منیش دڵنیام کە قەیرانی ئەورووپا رەگی لە شێوەیەك وەرهێنانی هەڵەدا هەیە بە ئەقڵ. بەڵام ئەمە بە مانای ئەوە نیە کە بە بڕوای من عەقڵباوەڕی لە خودی خۆیدا ناپەسەندە، یان لە کۆی بوونی مرۆییدا بایەخێکی کەمی هەیە" ئەو گوتی کە "عەقڵباوەڕی بە پێی مانا رەسەنەکەی خۆی لە فەلسەفەی یونانیدا (بریتی بووە لە) روناك بونەوەی ئەقڵ لە بەردەم خۆیدا"[2]. کەوابوو خاڵی گرنگ هەمان "شێوەیەك هەڵەیە" لە عەقڵباوەڕیدا نەك "هەڵەی عەقڵباوەڕی". دەکرێت بەهەمان شێوە وا لە کۆی دوا نوسینەکانی هوسرل تێبگەین کە گرفت لە "ئاراستە وەرگرتنی مۆدێرندایە بەرەو زانست" نەك لە خودی ئەقڵنیەتی زانستیدا.

لەم رووەوە دەکرێت میتۆدی هوسرل لە لێکۆڵینەوەی پەرەسەندنی ئەندێشەی زانستیدا بە "هەڵسەنگاندنی عەقڵی زانستی" بزانرێ. هوسرل لەو یاداشتانەدا کە بۆ پێشەکی باس و کتێبەکەی نوسی بووی، پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە "زانست هۆشیاریەکی سادە ئەندێشانە نیە لە پێناوی بەرژەوەندیە تیۆریەکاندا. بەڵکو لە جەوهەری خۆیدا شێوەیەکی رەخنەکاری پەروەردە دەکات، رەخنەگرتنی رادیکاڵانە" و بۆ رونکردنەوەی ئەم رەخنەگرتنەش دەڵێ "رەخنەگرتنێك کە پرسیار لە بناغەی بنەماکان (اصول) دەکات و رێ بۆ تێگەیشتن لە پەرەسەندن و ئامانجی زانست، خۆش دەکات"[3].

ئەم خاڵەی دوایی باسێکی گرنگ دەهێنێتە پێشێ. زانست بە پێچەوانەی بڕوای فەلسەفەی مۆدێرنەوە نەك لەسەر بنەمای تیۆرە، بەڵکو لەسەر بناغەی پراکتیك راوەستاوە. دەکرێت زانست بە ئاراستە وەرگرتنێکی رەخنەگرانە بەرەو جیهان، بزانرێ. کەوابوو بەرلەوەی جیهانبینیەکی گەردونیانەی هەبێت، یەك کردارە. بێگومان ئەم خاڵە پێ لەسەر بنەمای ئەزموونی زانست دادەگرێ، بەڵام لە هەمان کاتدا نکوڵی لەو بانگەشەیەی زانست دەکات (کە بڕوای وایە) دەکرێ میتۆدێکی هەمەکی و گشتی بدۆزرێتەوە کە لە هەموو حاڵەتەکاندا کارایی وەك کارایی حاڵەتەکانی دی بێت. لە نێوان فەیلەسوفانی ئەڵمانیدا ئەم بیرکردنەوەیە لە جیاوازیەکان پێشینەی هەبووە، بەڵام رەخنەگرتنی هوسرل و بەتایبەتی پێداگرتنی لەسەر "قەیران" کە لە پانتایی عەقڵباوەڕیدا مانای خۆی وەردەگرێت، گرنگیەکی تایبەتی هەیە کە بەداخەوە لە باسکردنی دوا کتێبیدا، زۆرتر فەرامۆش دەکرێت.

## *دیاردەگەری و زانست*

هوسرل هەمیشە وشەی مۆدێرنی بۆ فەلسەفەی ئەم چەند سەدەیەی دوایی بەکار دەهێناو چەندانجار لەم بارەیەوە باسی "فەلسەفەی دیکارت بەدواوەی" کردووە، بۆ ئەو "مۆدێرن" واتە رووبەڕووبوونەوەی رۆژگاری پاش دیکارت لەگەڵ فکری فەلسەفی سەدەکانی ناوەڕاستداو بە تایبەتی (رووبەڕوبونەوە)

لەگەڵ "جیهانی یونـانی"دا. لـە قەیرانیشـدا مۆدێرنـە بـەم مانایـە بـەکارهاتووە[4]. (لـەم فەسـڵەدا قـــەیران ئاماژەیـە بـۆ دوا کتێبـی هوسـرل واتـە: "قـــەیرانی زانستە ئەورووپیـەکان و دیاردەگـەری ترانسـندنتالی". زمانی فەلسەفی هوسرل "مودێـرن"ە، واتـە هـاورێی زمـانی فەلسـەفی پـاش دیکارتـە. هوسـرلیش وەك دیکارت لەو خاڵەوە دەستی پێدەکرد کە بۆ هەریـەك لە ئێمە ئـەوە شتێکی براوەیـە کـە هوشـیارین. هـەر کەسێك دەتوانێ گومان لە هەموو شـتێك بکـات جگـە لـە یـەك شـت "هوشـیاری خـۆی". لـێرەوە زانینـی جیهانی واقعی و بابەتی (جیـهانی دەرەوەی خۆمـان) لەسەر بناغەی ئەم تاکە یەقینـە دادەمەزرێنین، واتـە لەوێوە دەست پێدەکەین کـە بنـەمای یـەقین، دانـایی ئێمەیە. فەلسەفەی دیکارت لەم گرنگترین خاڵـەدا کـە دەسـپێکی باسـەکەش بـوو، تـا دەگەیشـتە بەلگەنەویستی فەلسەفی سەرەوە، رادەوەسـتا. واتـە بە هێنانە ئارای ئـەم خاڵە کـە خـودی بیرکـەرەوە، لەبـەر ئـەوەی دەزانێـت کـە بـیر دەکاتـەوە، واتـە هوشیارە بەوەی کە هوشیارە، (کەوابوو) هەیە[5].

دیکارت لێرەدا رادەوەستێ بۆ ئـەوەی فۆرمـەلـەی فەلسـەفە عەقڵباوەڕیەکەی بکـات، (بـەلام) هوسـرل لـێرەدا راناوەسـتێت و داوامـان لێدەکـات زیـاتر لـەم دەستپێکی باسی فەلسـەفی مۆدێرنـە، بیربکەینـەوە. دەگەڕێتەوە بۆ بەلگەنەویستەکە: خود، هوشیارە کـە هوشیارە. هەر ئەوەندەی کە ئەو ئەم هوشـیاری یـان دانایـیـەی خـۆی شـیبکاتەوە، تێدەگـات کـە ئـەم هوشیاریە تەنها بەیەك شێوە دەتوانێ بوونـی هـەبێ: ***هوشیاری بەشتێکە***. هوشیاری ناتوانـێ تەنها بۆ خۆی بوونی هـەبێت. هەمیشـە بەشێوەیەکی زەروری هوشیاریە لە شتێکی دەرەوەی خۆی. کەوابوو ئەگەر (تەنیا ئەگەر) شتێك لە دەرەوەی خود بوونی هـەبێت خود، هوشـیار دەبێت. خـود ناتوانـێ وەك خودێکـی هوشیار خـاوەنی شتێك نـەبێت بـەناوی بابەتـەوە.

دانـایی پەیوەسـتە بـە "بابـەتی دانایـیـە"وە. هەلومەرجی زیهنێك (کە بەهەر شێوەیەك بێ، جۆرێك دانایە) لـە حاڵـەتی "تەنـها بـۆ خـود"ا. بـێ مانایـە، خاڵێکی گرنگ، کە بە دوای ئەم باسـەدا دێتـە پێشـێ ئەوەیە: ئێمە لـە کرداردا سـەرنج لـەوە دەدەیـن کـە هەرگیز ناتوانین بـە شـێوەیەکی ئـەزموونی لـە نێوان هەلومەرجی هوشیاری و بابەتەکانی هوشیاریدا، واتـە ئەو بابەتانەی هوشیار دەبین پێیان، جیاوازی بکەین. رەنگە لە روانگەیەکی چەمکیەوە (بـەم مانایـەش (لـە روانگـەی) تیۆریـەوە) بتوانین هێڵێکـی جیـاوازی لــە نێوانیـاندا بکێشـین، بـەلام لـە ئەزمونـە واقیعیـەکانی خۆماندا ئەم دوانە لەیەك جیانابنەوە[6].

زۆرێك لە فەیلەسوفان بە درێژایی ئەو سەدە دوورو درێژانـەی بەسـەر ئەندێشـەی فەلسـەفی رۆژاوادا تێدەپەڕێ، بڕوایان وایە کە ناتوانین (و لە ئایندەشدا هـەرگیز نـاتوانین) بزانـین کـە ئایـا بابەتـەکانی هوشیاریمان واتـە ئوبژێکتـەکانی جیـهانی دەرەوەی ئێمـە (جیـهانی دەرەکـی) بـە راسـتی بوونێکـی سەربەخۆ لە ئێمە (زیهنی ئێمە) هەیە یان نـە، و ناتوانین بزانـین کـە بـە راستی ئـەم ئوبژێکتانە هیچ پەیوەندیـەکیان بـە ئەزمونـەکانی ئێمـەوە هەیـە یـان نـە. ئەگـەر بـە گریمانـەش پەیوەندیـەکیان بـە ئەزمونەکانی ئێمـەوە هـەبێت، ئـەم پەیوەندیە بە چ شـێوەیەکە. هوسـرل لەگـەڵ ئـەم تێڕوانینـە گومـانخوازەدا نیە. ئـەو دەنوسێت بـە شـێوەیەکی بڕاوەو لـە دڵنیاییـەوە دەکرێت بڵێین ئوبژێکتـەکانی هوشیاری ئێمـە ***وەك ئوبژێکتـەکانی هوشـیاری بۆ ئێمە*** بوونیـان هەیە، جا ئیـدی چ شێوەیەکی دیاریکراویان هەبێت یان نەبێت. ئێمە دەتوانین "وەك ئوبژێکتەکانی هوشیاری ئێمە" لێیان وردبینـەوە، بێ ئەوەی پێویستمان بەو گریمان و وتوێژانە بێت کە لە بـارەی بوونـی سـەربەخۆیانەوە دروسـتدەبێ. چ بـە شـێوەیەکی پۆزەتیڤانـە، دەرئەنجامـەکانی ئـەو

وتویژانه قبولّ بکەین و چ قبولی نەکەین، بەهەرحالّ ناتوانین نکولی لەوە بکەین کە ئەو ئوبژیکتانەی جیگەی مشتومرن، لایەنی کەم بە شیوەیەك بوونیان هەیە: بابەتەکانی هوشیاری ئیمەن. خالی گرنگتر ئەوەیە کە ئیمە خیراترین و راستەوخۆ ترین ریگەی (هوشیاربوون پییان) بەهۆی ئەم گریمانە سەرەتاییەوە دەدۆزینەوە: واتە هەر ئەوەندەی ئوبژیکتیك وەك ئوبژیکتیکی هوشیاری بناسین، ئەوا زیاد لە هەموو شتیکی دی لیی بە ئاگا دەبین. ئەم ئاگاداربوون یان هوشیاریەش پیویستی بە وەلامیکی گریمانەیی لە بارەی بوونی سەربەخۆی ئوبژیکت یان نەبوونیەوە، نیە. کەوابوو هەموو خالّ و پرسیاریك لە بارەی "سەربەخۆی بوونی" ئوبژیکتەکەوە دەخەینە ناو کەوانەوە و بەم کارەش دەریدەخەین کە تا ئەندازەیەك هەولدانی فەلسەفی بۆ دۆزینەوەی وەلامیکی ئەم پرسیارە، بی ئەنجام بووەو هەر لە سەرەتاشەوە پیویست نەبووە.

دروشمی فەلسەفی بەناوبانگی هوسرل (کە بریتیە لە) "بەرەو خودی شتەکان" سەرچاوەکەی دەگەریتەوە بۆ ئەو خالەی سەرەوە: بەرەو ئەو شتانەی کە رزگاربوون لەهەر دەستنیشانکردن یان خەسلەت و سیفەتیك کە ئیمە پیمانەوە لکاندوون، یان وەك گریمانەیەك لە بارەیانەوە هیناومانەتە ئارا[7]. ئەمە یانی تیگەیشتنی شتەکان وەك چۆن دەتوانن بن (تاکە شیوەیەکی یەقینی کە دەتوانن تیایدا بن) واتە ئیدراکی شتەکان وەك ئوبژیکتەکانی دانایی هوشیاریی سوبژیکت. شیکردنەوەی دیاردەگەرانە لیکۆلینەوەی هەر شتیکە کە دەبیتە بابەتی ئەزموونمان، کاتیك کە رزگارکراو و بەتالّ لەو خالە بیتە پیشەوە کە ئایا خاوەن دیاریکردنیکی سیمانتیکیە یان نەء. ئەو ئەزموونە راستەوخۆ و حەدسیەی کە خالی بیت لە هەر دیاریکردنیکی گریمانەیی، هەر بە تەنها ئوبژیکتە مادیەکان ناگریتەوە، بەلکو دراوە ئەبستراکتەکانی وەك ئەندیشەکان، ئازارەکان هەژان و یادەوەریەکان و هەروەها زانستەکان و هونەرەکانیش دەگریتەوە. لە هەموو ئەم حالەتانەدا پرسیاری بوونی سەربەخۆ، وەلاوە دەنیین و وەك هەموو بابەتیکی دیارکراوی دی دەیخەینە ناو کەوانەوە" و تەنها ئوبژیکتەکان وەك "ناوەرۆکی هوشیاری" لەبەر چاو دەگرین. واتە وەك ئەو شتانەی بە یەقین هەن و بە هیچ شیوەیەك شتیکی گریمانەیی نین.

ئیستا با بگەریینەوە بۆ خالی سەرەکی تیروانینی هوسرل: زیهن هەمیشە بەرەو ئوبژیکتیك (بابەتیك) ئاراستە وەردەگری، یان بە زمانی هوسرل بەرەو شتیك رادەکیشری. بۆ نمونە ئوبژیکتیکی سادەیی وەك کتیبیك. دەکریت کتیبیك خۆشەویست بیت، تەنانەت وەك ئوبژیکتیکی پیرۆز دابنری. دەکریت بە بیر بهینریتەوە، کتیب دەتوانی یادەوەریەك یان هەستیکی سۆزداری لە کەسیکدا زیندو بکاتەوە. سەرجەم ناوەرۆکی فکریو هوشیاری سوبژیکت بەرەو ئەم کتیبە رادەکیشری. ئەم روکردن و ئاراستە وەرگرتنە بەرەو ئوبژیکت، خەسلەت و سیفەتی یەکتاو تایبەتمەندی زیهنە. زیهن نەك هیچ شتیکی تر، لە جیهاندا بەرەو ئوبژیکت.. واتە بەرەو شتیك لە دەرەوەی خۆی، ئاراستە وەردەگری[8]. هوسرل ئەم خەسلەتە تایبەتەی "لە بارەی شتبوونی" زیهنەوە یان ئاراستە وەرگرتنی زیهن ناو دەنی"[9]. مەبەستگەری بەرلەوەی پەیوەندی بە ئیرادەو مەبەست و خواستی ئیمەوە هەبیت، پەیوەندی بە هەمان "ئاراستە وەرگرتنەوە بەرەو ئوبژیکت" هەیە. ئەم ناوەرۆکە شیوەیەك وەسفی واقعیبوونی زاتی ئوبژیکتە کە لەسەر بناغەی ئەم وەسفە، یادەوەری و هەست و ئارەزوو و لەم بابەتە شتانە، فۆرمەلە دەبن. لیرەوە ئیدی هیچ گرنگ نیە ئایا بە راستی کتیبیك لە دنیای دەرەوەدا هەیە یان نەء، دەتوانین کتیبەکە

بخەینە ناو کەوانەوە. کتێبەکە گرنگیی نیە، (بەڵکو) خاڵی گرنگ ئەوەیە زیهنی من بەرەو ئەو رادەکێشرێ.

ئەمەیە لایەنی گرنگی کورتکردنەوەی دیاردەگەریانەیە: دەرکی ئەوەی کە هەنوکە لە دەرک کردنی ئەو خاڵەدام کە لە دەرەوەی من، لەوێدا.. کتێبێك هەیە. من هەر لەم بنەمایەوە دەست پێدەکەم، واتە لە دەرئەنجامی ئەو کورتکردنەوە دیاردەگەریانەوە (دەست پێدەکەم). هەموو کەسێك شتەکان لەم رێگایەوە دەناسێت، جا چ کتێبێك بێت یان کەهکەشانێك یان دنیای خەیاڵی ئەفسانەکان. هوسرل ئەم خاڵە بە دۆزینەوەی سەرەکی خۆی لە فەلسەفەدا دەزانێ: (واتە) بنەمای گومانهەڵنەگری هەر شێوەیەکی ناسین، جۆرێك ئاشکرابوونی بێ نێوانگەری (بدون واسطه) کە جیا نیە لە بەڵگاندنە ترانسندنتالیەکان. پڕ ئاشکرایە هوسرل لە چوارچێوەی دوانە لێکدژی "ئۆبژێکت/ سوبژێکت"دا ماوەتەوە. سوبژێکت لە جیهانی ئۆبژێکتەکاندا راوەستاوەو دەیان ناسێت، نەك لەسەر بناغەی زانینە پێشینیەکان بەڵکو لەسەر بناغەی بنەمای کورتکردنەوە کە تیایدا ئۆبژێکتەکان خۆیان وەك چۆن هەن، بە سوبژێکت دەناسێنن.

دیاردەگەری هوسرل زانست نیە، بەڵام پەیوەندی نێوان زانست و ئەقڵ دەهێنێتە ئاراوە. دیاردەگەری ناچارە بۆ وەسفکردنی ئەزمونێکی دیاریکراو (تەنانەت سادەترین ئەزمونیش) لە پەیوەندیەکانی زانست و ئەقڵ وردبێتەوە. بابەتی سەرەکی بریتیە لە ئەزموونی دور لەهەر دەستنیشانکردنێکی زانستی. دیارە خەسڵەتی مەبەستگەری ئەم ئەزموونە بەهۆی زانستەوە نازانرێت، بەڵام تەنانەت سەرەتاترین رێساکانی ناسین و ئیدراکی ئەم ئەزموونە، گۆڕان بەسەر تێگەیشتنی زانستدا دەهێنێت. دەکرێ بە سەرنجدان لە ئەزمونە پەتی و سادەکانی مرۆڤ، تێبگەین کە "دراوەکانی زانستە مرۆییەکان" تا چ ئەندازەیەك بە سادەیی هەڵدەبژێرین و پێوەرو رێکخەری ئەم زانستانەش تا چ ئەندازەیەك ناوردبینانە دەست نیشاندەکرێن. بەهۆی شێوازی کورتکردنەوەی دیاردەگەریانەوە دەتوانین لایەنە مێژوویی، کۆمەلایەتی، کلتوری و تاکانەی (فردی) هەر ئەزمونێك وەلاوە بنێین و بگەڕێینەوە بۆ ئەو رەگەزە سەرەتاییانەی دورستیانکردووە.

بە وتەی "لاکمان" ئامانجی سەرەکی دیاردەگەر "وەسفی بونیادە گشتیەکانی ئاراستە وەرگرتنی خودە لە جیهاندا، نەك رونکردنەوەی خەسڵەتە هەمەکیەکانی جیهانی بابەتی"[10]. دیاردەگەری بەر لە هەر شتێك بنەمایەکی رەخنەکاری فەلسەفیە. میتۆدەکەی کورتکردنەوە یان "ئاپۆخە"یە. لە "لێکۆڵینەوە لۆژیکیەکان"ی (1900–1913) هوسرلیشدا باسی چەمکی کورتکردنەوە دیاردەگەرانە کراوە، ئەگەرچی لەوێدا بەو ناوەوە نەهاتووە. ئەم زاراوەیە بۆ یەکەمجار لە "بیرۆکە رێخۆشکەرەکاندا" (1913) بە وردی رونکراوەتەوە[11]. هەر شتێك (هەر ئۆبژێکتێك)ی ئەم جیهانە بۆ ئێمە دەردەکەوێت. هەر شێوەیەکی دەرکەوتن، تەنانەت سادەترین شێوەشی، ئاشکرا بوونی ***شتێکە***. هوشیاری ئێمە بە شتێکەوە بەرەو ئەو شتەیە. ئەم ئاشکرابوونە هەمیشە کۆمەڵێ "باوەڕ" یان گریمانەی لەگەڵدایە، شتگەلێکی وەك کاردانەوەی سروشتی، نرخاندن، ئاراستە وەرگرتنی هەستی و سۆزدارانە. کەوابوو پەیوەندیەك هەیە لە نێوان ئەوەی ئاشکرا دەبێت (***noema***) و ئەوەی بەرەو ئاشکرا بوون دەچێتە پێشێ (***noesis***).

## كتێبی قەیران

دوا یاداشتەکانی هوسرل کە پاش مردنی لە **1954** بە شێوەی کتێبیکی قەبارە گەورەو بەناونیشانی "قەیرانی زانستە ئەوروپییەکان و دیاردەگەری ترانسندنتال" بڵاوکرایەوە، دەرئەنجام –و بە مانایەکیش بەردەوامی– کارەکانی پیشوی بوو لە بواری دیاردەگەریدا. هوسرل لەدوا ساڵەکانی تەمەنیدا وتاریکی لە ڤیناو پراگ خویندبۆوە کە هەندیك لە بنەماکانی "قەیران"ی تیا رونکردبۆوە. ئەمڕۆ دەقی ئەم وتارانە وەك پاشکۆیەکی کتیبەکە بڵاوکراونەتەوە. ناوی وتارەکەی ڤینا "مەی **1935**" "فەلسەفە لە قەیرانی مرۆڤگەری ئەوروپیدا" بوو کە لە کتیبی قەیراندا بە ناوی "قەیرانی مرۆڤگەری ئەوروپی و فەلسەفە" وە هاتووە. ناوی وتارەکەی پراگ (دیسامبر– **1934**) برتیی بوو لە "قەیرانی زانستە ئەوروپییەکان و دەروونناسی". هوسرل داوای لە خوینەرانی کردبوو ئەم باسە پیشکەشکراوانە وەك "پیشەکیەك بۆ دیاردەگەری" دابنین. ئەمە خالیکە کە چەندان جار لە بارەی کتیبی قەیرانیشەوە، دوبارەی کردۆتەوە.

هەریەك لەو کتێبانەی هوسرل نوسی: وەك "لێکۆڵینەوەی لۆژیکیەکان"، تیێزە رێخۆشکەرەکان بۆ جۆرێك لە دیاردەگەری"، "تێڕامانە دیکارتیەکان" (**1927**)، لۆژیکی وێنەیی و لۆژیکی تراسندتالی (**1929**).." هەریەك لەمانە وەك پێشەکیەك وابوون بۆ هەندێك لایەنی دیاردەگەری تراسندنتالی. "قەیران"یش هەر لەم بابەتە کتێبانەیە. خودی هوسرل ناوینا "ئاراستە وەرگرتنێکی دیاردەگەریانە بۆ ناسینی ژیانگا" کە "پێویستی مێژوویی دیاردەگەری" لە هەلومەرجی هەنوکەیی فەلسەفەدا، سەقامگیر دەکات. نوسینی ئەم هەموو یاداشتە گەورانە بریتی بوو لە "پەیامی هوسرل" دەرهەق بە هەلومەرجێك کە هوسرل بە قەیراناوی ناوی دەبرد. ئەو گومانی نەبوو کە سەردەمی ئێمە، سەردەمی قەیرانی فکرو زانستی ئەوروپیە، واتە قەیرانی جیهانی مۆدێرنە بە مانا گشتیەکەی، چونکە فکری مۆدێرن "گەردونیە". ئەو سەرچاوەی قەیرانی "ناسینی زانستی و فەلسەفی" دەگەڕانەوە بۆ بابەتگەری (ئوبژێکتیڤیزم)ی زانستی مۆدێرن، واتە بۆ ئەو تێڕوانینە دیکارتیەی (بڕوای وایە) دەکرێ جیهانی واقعی لە رێگەی رێسا ماتماتیکیو چەندایەتیەکانەوە، بناسرێ. هوسرل کە تەمەنێك هەوڵیدا بوو بۆ ئەوەی دەریبخات دیاردەگەری تراسندنتالی (یان بە وتەی خۆی فەلسەفەی واقعی) دەبێ جیهان دوور لەو یەقینانەی دەپێوڕێن" بناسێ، نەیدەتوانی لە بەرامبەر دەرئەنجامەکانی "کورتکردنەوەی هەموو شتێك بۆ یاسا بابەتیەکان (ئوبژێکتیڤەکان)" هەروا بێدەنگ و بێلایەن بێت.

قەیران تەنها کورت ناکرێتەوە بۆ قەیرانێکی زانستی و فکری. ئەگەرچی بابەتی سەرەکی کتێبەکەی برتیی بوو لەمە، بەلام لە چەند بۆنەیەکی جیاوازدا گوتویێتی کە ئەم قەیرانە، قەیرانێکی جیهانی و "مەعنەویە"[12]. قەیرانێك کە تەنها باسی کۆمەڵێ یان زنجیرەیەك گرفتی پراکتیکی یان تەکنیکی ناکات، بەڵکو لە بنەڕەتدا قەیرانی بەهاکانە. دەکرێ بە تەفسیرێکی سۆسیۆلۆجیانە بڵێین کە رۆژگاری نوێ، رۆژگاری قەیرانەکانە: بێکاری، هەڵئاوسان، جەنگە جیهانیو ناوچەییەکان، قاتوقڕی، دابەشکردنی هەڵەی دەستکەوتەکان، لەنێوچونی هاوسەنگی ژینگە، بوونی رژێمە دیسپۆتیزم و تۆتالیتارەکان کە سود لە شێوازی نامرۆڤانە بۆ بەردەوامبوونی دەسەڵاتیان وەردەگرن،ترس لەبەکارهێنانی چەکی ئەتۆمی.. هەموو ئەمانە ناونیشانی سەرەکی ئەو

هەوالانەن کە مانگە دەستکردەکان هاوکات لە سەرتاسەری دنیادا بلاوی دەکەنەوە. پیشبینی لایەنە مەعنەویەکانی قەیران لەو سەردەمەدا کە ستالینیزم و فاشیزم لەسەر دەسەلات بوون، گران نەبوو. بەلام خالی بنەرەتی ئەوەیە کە کتیبەکەی هوسرل هیشتا زیندووەو بە هەمان ئەندازەی جاران شەوکەتی خۆی پاراستووەو باسی رۆژگاری خۆمان و ژیانگای خۆمان دەکات.

هەندیك لیکۆلەرەوە ئیستاش بروایان وایە ئەو زنجیرە وتارەی بونە هۆی (نوسینی) کتیبی قەیران، هاوکات لەگەڵ وتارەکانی هوسرل لە پراگ و ڤییەنادا، لە ماوەی نیوان سیەکاندا شکلی خۆی وەرگرت.. بەلام لە راستیدا دەبێ بۆ سەرچاوەی سەرەکی کتیبەکەی بگەرێینەوە بۆ سالەکانی پاش جەنگی جیهانی یەکەم. هوسرل لە **1919**دا دەیویست کتیبیك لە بارەی عەقلباوەری مۆدیرنەوە بنوسێ، بەردەوامی ئەم ویستە بووە هۆی یەکەم نەخشەی کتیبی "قەیران". بیگومان ئەو خالەی کە "قەیران" لە رۆژە دۆزەخیەکانی دەسەلاتی هیتلەردا نوسراوە (کاتێ هوسرل نائومید و تەنیا بوو، زۆر لە هاورییان و خویندکارانی جییان هیشتبوو)، کاریگەری لەسەر رۆحیەتی گشتی و شیوازی نوسینی دەقەکە هەبووە. تالی ژیان لە ژیر دەسەلاتی رژیمیکی تۆتالیتاردا کە بێ پەیوەندی بە سەردەمی مۆدیرنەوە لە دایك نەبووە، بە وتەی هوسرل زەنگی مەترسیەك بوو سەبارەت بەوەی کە رەنگە مۆدیرنە جاریکی دیش ئەزمونی لەم چەشنە بهینیتە ئاراوە. بە بروای هوسرل مرۆڤی مۆدیرن چەمکی ئامانج یان *Telos*ی لە دەستداوە. زانستی دوور لە روانگەی ئامانجخوازانە، لە کرداری راستەقینەی رۆژانەیدا بووە بە شتیکی ویرانکەر. زانستی مۆدیرن (کە لە سەردەمی رینسانەوە لە دایك بووە) "دەلالەتی بلندەگی (متعالی) خۆی لە بیرچۆتەوە. هەنوکە لە چاوی هوسرلەوە کە لە سەرەمەرگدا بوو، پەیامی دیاردەگەری، رۆشنگەری ئەندیشەکان نیە، بەلکو ئاشکراکردنی رەنگەزیکی مەعنەوی بوو.

وشەی "ئەوروپایی" لە ناونیشانی کتیبەکەدا لە مانای فکری مۆدیرن و رەنگە بکرێ بلیین بەمانای مۆدیرنەیە. خودی هوسرل (دەلیت) مەبەستی لە بەکارهینانی (وشەی ئەوروپا) "سەنجدانە لە تیروانینی بالادەست". ئەم خالە تارادەیەك بیرهینەرەوەی بەکارهینانی سیفەتی ئەوروپای پاش نهیلیزمە لە دوا بەرهەمەکانی نیتچەدا. "ئەوروپایی"ش بۆ نیتچە بە مانای هەمەکی "هەلومەرجی ئەمرۆیی و بالادەستی میتافیزیکی رۆژئاوای" دەهات. مەسەلەکە ئەوەیە کە کاتێ نمونەی بالادەست و بەهیزی مۆدیرنە، لە بنەمای میتافیزیکی فکری ئەوروپیەوە دەستی پیکردو پیشکەش بە جیهان کرا، کەوابوو "هیچ باوەری" و قەیرانەکانیشی خەسلەتیکی "ئەوروپیان" هەیە. هوسرل لە بەشیك لەو یاداشتانەدا کە لە بلاوکراوەی *filosofia* لە بلگراد (*1936*) بلاویکردەوە، جەختی لەسەر ئەوە کرد کە کاتێ دەلیین زانستی ئەوروپی یان قەیرانی ئەوروپی، مەبەست زانست و قەیرانی مۆدیرنە. ئەو ناونیشانە لاوەکیەی هوسرل بۆ ئەم بەشە چاپکراوەی هەلبژارد، سەرنج راکیشە: "پیشەکیەك بۆ فەلسەفەی دیاردەگەری". واتە لە ریگەیەکی دیەوە دیسانەوە خەریکی دیاردەگەری دەبین، بەلام لە چوارچیوەی فەلسەفەیەکدا لیی دەروانین. هەر لەم بەشە بلاوکراوەدا جەخت لەسەر ئەوە کراوە کە "زانست بەو شیوەیەی گالیلۆ بناغەکەی دارشتووە" ناتوانێ رینماکەری فەلسەفەیەکی لەم چەشنە بیت. ناوی "گالیلۆ"ش وەك ناوی "ئەوروپایی" زۆرتر رەمزیە، ناونیشانیکی گشتیە بۆ دەست نیشانکردن و روونکردنەوەی رەوتی

تیگەیشتنی زانست و "ڕوحیەتی باڵادەست بەسەر فیزیای هاوچەرخدا".

دەبێ ئەوەمان لەیاد بێت کە هوسرل مێژونوسی فیکری زانستی نەبوو، بە ئاشکراش تیروانینەکانی لە ژێر کاریگەری بیریارانی وەك "کوئایرە"و "کاسیرەر"دایە.

ڕیکخستنی یاداشتەکان لە "قەیران"دا بەو شێوەیەی "ژرار گرانیل" لە وەرگیرانە فەرەنسیەکەیدا ڕەچاوی کردووە، بەم شیوەیەیە: نیوەی پەرەکانی کتیبەکە یاداشتە سەرەکیەکانە، نیوەکەی دیشی لە پاشکۆو زیادکردنەکان پیکهاتووە. نیوەی یەکەم لە حەفتاو سێ پارچە پیکهاتووە کە لە سێ بەشی جیاوازدا هاتوون. ناونیشانی بەشی یەکەم بریتیە لە "قەیرانی زانستەکان وەك دەربرینی قەیرانی رادیکالی ژیان، لە مرۆڤگەری ئەوروپیدا" کە لە حەفتا پارچە پیکهاتووە. لەم پارچانەدا باسی ئەمانە کراوە: چەمکی "قەیران"، "گۆرانی زانست بۆ زانینی دراوە هەبووەکان"، زەمینەی فکریو فەلسەفی ئەم گۆرانە لە رینسانس بەدواوە، شکستی "زانستی هەمەلایەن" و دروشمی فەلسەفی مۆدیرن. پارچەی حەوتەم ئامانجەکانی کتێبەکە ڕوندەکاتەوە. هوسرل لە سەرەتای ئەم پارچەیەدا دەپرسێ ئەرکی "ئێمەی فەیلەسوفانی ئەمڕۆ" لە بەرامبەر قەیراندا چیە؟ و بە ریتمێکی تاڵیش رەخنە لە هایدگەر دەگرێت بەبێ ئەوەی ناوی بهێنێ[13]. (لە جێیەکی دی کتێبەکەدا هێرش دەکاتە سەر رەخنەکانی هایدگەرو "فەلسەفەکەی (کە بۆتە) مۆدەی ڕۆژ" دژی دیکارت[14]. ئەو کارەکەی خۆی بە "لە دایکبوو لە ناو قوتابخانەی فەیلەسوفە راستەقینەکانی نەریتی گەورەی فەلسەفەدا" دەزانێ کە دەبێ لە کاری "ئەدیبە فەیلەسوف نماکان" جیا بکرێتەوە.

بەشی دوهەمی کتێبی "قەیران" بەناوی "بۆ ڕونکردنەوەی سەرچاوەی دوالیزمی مۆدێرن لە نێوان ئوبژێکتیڤزمی فیزیایو سوبژێکتیڤیزی ترانسندنتالیدا" لە پارچەی هەشتەمەوە تا پارچەی بیست و حەوتەم بەردەوام دەبێت. ئەم پارچانە لە بارەی گرنگی "ماتماتیکی کردنی" زانستی مۆدێرنەوەن و باسی فیزیا لە گالیلۆ بەدواوە دەکەن و لەم ناوەشدا هوسرل باسی دیکارت (ئەم بونیادنەرەی عەقڵباوەڕی مودێرن) دەکات (پارچەکانی شانزە تا بیست و یەك). بەشی سێهەمی کتێبەکە لە پارچەی بیست و هەشتەوە تا پارچەی هەفتاو سێ بەردەوام دەبێ. ناوی ئەم بەشە "ڕونکردنەوەی چەمکی ترانسندنتالیە". ئەم بەشە خۆی لە دوو بەش پێکهاتووە. یەکەمیان لە بارەی ژیانگاو جێگەی زانستە لە ناویدا.. لەم ئاراستەیەدا پارچەی پەنجاو سێ گرنگیەکی تایبەتی لە باسکردنی مۆدێرنەدا هەیە. هوسرل لەم پارچەیەدا باسی "ناکۆکیەکی چارەسەر هەڵنەگر" دەکات. ناکۆکی سوبژێکتی مرۆڤ: بونەوەرێك هەیە کە هەم سوبژێکتە (خودە) و هەم ئوبژێکتە (بابەتە). ئەم باسەی هوسرل لە بەرهەمەکانی میشل فۆکۆدا کامڵتر کراوە. بەشی دوهەمی دیدێکی رەخنەگرانەیە بۆ "دەرونناسی هاوچەرخ" و تاوتوێی "شکستی شایەنی بەزەیی" ئەم بوارە دەکات. ئەم بەشە تا رادەیەك بەردەوامی کارەکانی پێشوی هوسرلە.

بەڵام نیوەی دوهەمی کتێبەکە واتە بەشی پاشکۆو زیادەکان خۆی لە دوو بەش پێکهاتووە. بەشی یەکەم لە سێ وتار پێکهاتووە. بەشێك لە وتاربێژیەکەی پراگ، دەقی وتاربێژیەکەی ڤیێناو وتارێکی گرنگ لە بارەی "ماتماتیکی کردنی سروشت لە زانستی مۆدێرن" دا کە مێژوی نوسینی ئەم وتارە دەگەڕێتەوە بۆ پێش ساڵی *1928*. بەشی دوهەم لە زیاد لە دو سەد پەڕەدا دەقی ئەو یاداشتانەیە کە

هوسرل دەیویست هێواش هێواش بیخاتە سەر حەفتاو سێ پارچە سەرەکیەکەی کتێبی "قەیران" یان ویستبێتی بەرگێکی دوهەم ئامادە بکات. بەرگێکە کە جگە لەم یاداشتانە چ شتێکی دیمان لە بارەیەوە لەبەردەستدا نیە. "ئۆژن فینک"ی فەیلەسوفی دیاردەگەرو هاوڕێی هوسرل لە نوسینێکدا دەریخستوە کە لە پرۆژەی سەرەکی هوسرلدا بەشی سەرەکی ئەم "درێژەی کتێبە" لە بارەی ناکۆکیەکانی دەروونناسی مۆدێرنەوە بوو، بۆ ئەوەی لە کۆتاییدا بکرێ باسی چەمکە میتافیزیکیەکان بکرێ[15].

ئەگەر بمانەوێت بزانین رەخنەی هوسرل لە عەقڵنیەت چیە، دەبێ سیو چوار پارچەی یەکەمی کتێبی *قەیران* بخوێنینەوە[16]. ئەم پارچانە بە مانای ئەمڕێی وشەکە وەك "بونیادشکاندنی" فەلسەفەی مۆدێرنە. واتە بەر لەوەی دەس بە رەخنەکاری بەهۆی پێش گریمانەکانەوە بکەن، لە حوکمی شیکردنەوەی (فەلسەفەی مۆدێرندان) بەهۆی "بێلایەن کردنی دەلالەتە مانایەکانی". ئەم پارچانە دەریدەخەن کە خودی فەلسەفە سنورو بواری خۆی، دەست نیشان کردووەو چیدیش ناتوانێ لەو سنورو بوارانە زیاتر بڕوا چونکە خۆی لەسەر بنەمای ئەم سنورداریتیە، پێناس کردووە. لە پارچەی دوازدەهەمدا دەخوێنینەوە کە "بڕیار بوو فەلسەفە لە بنەڕەتدا واتە لەلای پێشینان (یونانیەکان) "زانست بێت" واتە هوشیاری گشتی بێت لە بارەی هەمەکی هەبووەوە، نەك هوشیاریەکی ئالۆزو رێژەیی لە بارەی رووداوەکانەوە، بەلکو هوشیاریەکی عاقڵانە یان ئەپستیمە"[17]. هەرچەندە فەلسەفەی دێرنیش بیرۆکەیەکی دروستی لە بارەی عەقڵنیەت و زانستی هەمەلایەنەوە نەبوو، بەڵام دەکرێ ئەوە ببینرێ کە نمونەی مۆدێرن بە تەواوی لەم هەمەکیە دورکەوتۆتەوە. هوسرل دەنوسێ هەنوکە "خەیاڵی دەستگەیشتن بە فەلسەفە وەك زانستێك، زانستێکی جدی و وردبین، کۆتایی پێهاتووە"[18].

هوسرل لە وتاریێژی ڤیێنادا جەختی لەوە کردبوو کە ئەوەی دەیڵێت، ئاشکراکەری قەیرانێکە کە عەقڵباوەڕیو "باوەڕهێنان بە زانست" بوونە هۆی دروست بوونی. هەنوکەو ئەمانە خۆیان "لەو تیورانەدا شاردۆتەوە کە نامۆن بە جیهان". هوسرل جەخت لەوە دەکات کە هیچ پابەندی ئەو تیڕوانینە نادروستە نیە کە "بڕوای بەوە هەیە زانست مرۆڤ عاقڵتر دەکات و چارەنوسی زانستیش بەرهەم هێنانی مرۆڤایەتیەکە کە چارەنووسی خۆی لەدەست دەگرێ"[19]. بەڵام نابێ ئەم رەخنەیە لە عەقڵباوەڕی بە مانای قبوڵکردنی "ناعەقڵانی" بزانرێ.. ناعەقڵانیەتێك کە هەمیشە هوسرل بە هاوڕێی "گومانخوازی" دەزانی. مەسەلەی هوسرل ئەوەیە کە "عەقڵباوەڕی بەلاڕێدا چوە"[20]. ئەم باوەڕهێنانە بە زانست ئاك رەهەندانەیە، ئەگەرچی فەیلەسوفان هەمیشە لە سەرەتادا تاك رەهەندانە دەڕوانن. هوسرل حسابی خۆی لەو "فەلسەفە ناعەقڵانیە" جیادەکاتەوە کە سەرقاڵی رەخنەگرتنە لە هەمەکی فکری فەلسەفی لە رینسانس بەدواوەو وا رەفتار دەکات وەك ئەوەی بتوانێ سیمای سادەخوازانەی (ئەو هەمەکیە) ئاشکرا بکات. بەڵام ئەم سادەخوازیە کە هوسرل ناوی دەنا "ئوبژێکتیڤزم" لە هەمان "سادەخوازی فەلسەفەی ناعەقڵانی" دەچێ[21].

"وردبوونەوەی ئامانجخوازانەو مێژوویی" لە سەرچاوەکانی هەلومەرجی قەیراناوی ئەمڕۆ، تەنها بەرهەمی کاریگەری هەلومەرجی مێژوویی نیە لەسەر هوسرل، بەلکو پتر دەرئەنجامی پێشکەوتنی وتوێژەکانی دیاردەگەریە. لە راستیدا بەشی دوو درێژی سێهەم لە نیوەی یەکەمی کتێبی "قەیران"، بەر لە هەر شتێك لە بارەی "ئەو نەگونجانەی نێوان جیهانی راستەقینەی ژیانەوەیە لەگەڵ دیدگای

دەروونناسیدا". خودی هوسرل پارچەکانی بەشی دوەم و سیهەمی بە "پێشەکیەك بۆ باسە سەرەکیەکە" دەزانێ[22]. بەڵام باسی سەرەکی بریتیە لە "تێگەیشتن لە ڕۆژگاری هاوچەرخ". هوسرل خۆی دەڵێت "من فەیلەسوفی سەردەمم، سەردەمی هەنوکە، هەم"[23]. مەسەلەکە ئەوەیە کە قەیرانی ڕۆژگاری نوێ نە بۆ هەلومەرجی ئۆبژێکتیڤ کورت ئەکرێتەوەو نە تەنانەت بۆ عەقڵانیەتی فەلسەفی، "بەلکو ئەمە قەیرانێکە پەیوەندی بە ڕۆحی (*Geist*) ئەوروپاییەوە" هەیەو دەکرێت ئەم خاڵەی دوایی بە سەرنجدان لە گرنگی تیروانینی ئامانجخوازانە لە میاردەگەریدا، بەنزیکبونەوە لە چەمکی هیگلی ڕوحی سەردەم، بزانرێ. هوسرل لە پارچەی حەفتاو سێی ***قەیراندا*** باسی "فەلسەفەی وەك قولبونەوە لە بارەی خودی مرۆڤەوە یان خۆ بەدیهێنانی عەقڵ" کردووە. لەویدا بە ئاشکرا هەندێك زاراوەی هیگلی بەکارهیناوە[24]. لەم پارچەیەدا ئەو مەسەلەیەی هوسرل ڕەچاوی کردووە لێکۆڵینەوەی زانستی هەمەکیە. من یەك نەفس (یەك خود)م کە تەنها لەناو کۆمەڵی "خود"دا مانام هەیە. مرۆڤ لەناو ڕەوتێکی "پەرەسەندنی مێژوویی" ***Histirzat*** ژیانی مرۆڤایەتیدایە، پەرەسەندنێك لە خۆیدا. لێرەدا چەمکی "لە خۆیدا" دەگەڕێتەوە بۆ پەرەسەندنی ئوبژێکتیڤ کە (لە بنەڕەتدا) بیرۆکەیەکی هیگلیە. کاتێ هوسرل دەنوسێ "عەقڵ خەسڵەتی سەرەکی مرۆڤە، مەبەستم لە مرۆڤ بونەوەرێکی زیندووە لە کردارە شەخسی و عادەتەکانیدا. ئەم ژیانە وەك ژیانێکی شەخسی لە جوڵەیەکی (صیروره) بەردەوامدایە، لە ڕێگەی مەبەستدارێتی پەرەسەندنەوە. ئەوەی دەرئەنجامی ئەم ژیانەیە، خودی مرۆڤە. بوونی جوڵەیەکی (صیروره) بەردەوامە"[25].

هوسرل لەم پارچەیەدا دەمانخاتە هەمان فەزای زمانی و فکری فینۆمۆلۆژیای ڕۆح (ی هیگڵەوە). بەڵام نابێ لەم لێکچونەوە ئەو دەرئەنجامە وەربگرین کە لە ***قەیراندا*** تەنانەت تنۆکێك لە "فەلسەفەی مێژوو" بە شاراوەی هەیە. هوسرل خۆ لە "سەرچاوەکانی ئەندازە"دا (کە پارچەیەکە وەك پارچەی ئۆهەمی "قەیران") دەنوسێ: "لێکۆڵینەوەکانی ئێمە مێژووییە بەڵام نەك بە مانا باوەکەی. ئەو بابەتانەی باسیدەکەین گەلێك مەسەلەی قوڵ دەهێننە پێشێ کە بۆ مێژووی باو نائاشنایە. ئەو مەسەلانەی کە بەهەر شێوەیەك بووە و بەشێوەی تایبەتی خۆیان، بێگومان مێژوویین"[26]. پاشان نمونە لە "ئەندازیاری گالیلۆ" دەهێنێتەوە. مێژوو لە ***قەیراندا*** "مێژووی فکری مۆدێرنە". کەوابوو نابێ بیری "عەقڵ لە مێژوودا"ی هیگلمان بکەوێتەوە، چونکە بۆ هوسرل خاڵی گرنگ وەهمی بوونی تاکەکەس لە وەهمێکدا کە ناوی مێژوی لێنراوە. دیارە هوسرل باسی زانستی وەك پرۆسەیەکی مێژوویی کردوە کە "نەریتی" تایبەتی خۆی هەیە (واتە شێوەی تایبەتی خۆی هەیە بۆ ڕووبەڕووبونەوەی جیهان). وشەی نەریت کە پاشتر ڕۆڵێکی گرنگ لە هێرمۆنتیکای هانزگئورگ گادامێردا دەبینێ، لە ***قەیراندا*** بەتایبەتی لە "سەرچاوەی ئەندازە"دا بەکارهێنراوە: "بوونی مرۆی ئێمە لەناو جەرگەی ژمارەیەکی بێ شوماری نەریتەکاندا دەجوڵێتەوە. سەرجەم جیهانی کلتوری لە هەموو شکڵەکانیدا، لە نەریتدا بوونی هەیە"[27]. هوسرل دەڵێت نەریت مرۆییە، واتە لە کردارە مرۆییەکانەوە سەرچاوە دەگرێت و لە نێوان تاکەکانی مرۆڤدا درێژەی دەدرێتێ.

بەدیهاتنی خەونی فەلسەفە وەك زانستێکی جدی و وردبین کە هوسرل لە ***قەیراندا*** بە خەونێکی دەزانی کە کۆتایی پێهاتووە، لەو ڕووەوە مومکین نیە

چونکە لە رۆژگاری ئێمەدا "زانست بەهیچ شێوەیەك شتێکی نیە پێمان بڵێ"[28]. سەردەمێك نیتچە گوتبووی: "خەسڵەتی سەرەکی سەدەی نۆزدە سەرکەوتنی زانست نەبوو، بەڵکو سەرکەوتنی میتۆدی زانستی بوو بەسەر زانستدا" هوسرل ئەم خاڵەی قبوڵەو دەیگەڕێنێتەوە بۆ ئاراستەی دریژخایەنی زانستی مۆدێرن. ئەو "تیرامانە دیکارتیەکان" بەم خاڵە کۆتایی پێدێنێ کە ئازادی، تێگەیشتنی زەرورەتەکانی جیهانی ئۆبژێکت نیە (تەنانەت لەو جێگایانەشدا کە بە وردبینیەکی زانستیانەوە، دەرخرابن). بەڵکو مەسەلەیەکە سوبژێکتیڤە و ژیان جوڵەی سوبژێکتە بەرەو لای خۆی. لە کاتێکدا زانست هەرگیز جگە لە "ئامانجی بەیانکردنی راستەوخۆی ئۆبژێکتیڤ" هیچ ئامانجێکی دی نەبووە[29].

هوسرل لە پارچەی بیست و هەشتەمی کتێبی "چەند تێزێکی ڕێخۆشکەر بۆ جۆرێك لە دیاردەگەری" باسی پەیوەندی هوشیاری و جیهانی کردووە. دەڵێت ئەم پەیوەندیە لەو شوێنەدا کە دەگۆڕێ بۆ "پەیوەندیەکی ئەنتۆلۆژیانە، دەچێتە سەرو "رێکەوتنامەو دەلالەتەکانەوە". یەکێك لە هۆکارەکانی دژایەتی هوسرل لەگەڵ دەروونناسیدا ئەوەیە کە "دەروونناسی توانای تێگەیشتنی لەم پەیوەندیە نیە"[30]. لەم کتێبەشدا دیسانەوە جیاوازی نێوان زانستی دۆگمایی و ئاراستە وەرگرتنی دیاردەگەریانە، بەر لە هەموو شتێك گەڕێنراوەتەوە بۆ نەتوانینی زانست لە هاوڕێکردنی رەخنەدا. لە نێوان "زانستی ئەندازیارانە لە سروشت" و دەروونناسیدا پەیوەندیەك هەیە. پەیوەندیەك کە لە فەلسەفەی سپینۆزا بەدواوە هەمیشە بناغەی سەرەکی دۆزینەوەی یاساکانی زیهنی مرۆڤ و ئۆبژێکتیڤزمی فەلسەفەی سروشت بووە. بە بڕوای هوسرل بیرۆکەی سەربەخۆی سروشت لە کردارەکانی سوبژێکتیڤ (ئەو باوەڕەی کە سروشت یاسای براوەو ماتماتیکی و چەندایەتی خۆی هەیە)، چەمکی عەقڵ و دواجار بناغەی عەقڵباوەڕی دەخاتە ژێر پرسیارەوە و جۆرێك جیاوازی نارەخنەگرانە لە نێوان دنیای تەنەکان (دنیای مادیو سروشتی) و دنیای بیر (سوبژێکت) دەهێنێتە پێشێ. بەڵام دیاردەگەری دەریدەخات کە زیهن، جیهانی ئۆبژێکت (بابەت) "ئادۆزییتەوە"، بەڵکو لە دروستکردنی پەیوەندی خود بە ئۆبژێکتەوە، لایەنێکی تازە بە ئامادەبوونی ئۆبژێکت دەبەخشێ. چەمکی "ژیانگا" کە هوسرل هێناویەتە پێشێ دەبێت جیاوازی یان دوالیزمی رۆح (سوبژێکتی ترانسندنتال) و مادە (دنیای ئۆبژێکت کە بابەتی زانستە) لەناو ببات. دنیایەکی کراوەیە کە لەگەڵ جیهانی ئەبستراکتی ئاسینی زانستیدا، کۆمەڵێ جیاوازی هەیە.

## *ماتماتیکی کردنی سروشت*

گالیلۆ لە *وتارەکاندا* (ژمارەی 232) نوسیویتی:

"فەیلەسوف لە بەرامبەر کتێبێکی مەزندا راوەستاوە کە لە بەردەم چاوی هەمومانیشدا کراوەتەوە: جیهان. بەڵام ئێمە هیچ لەم کتێبە تێناگەین گەر ئاشنای ئەو زمان و زاراوانە نەبین کە بەکاری دەهێنێ. جیهان بە زمانی ماتماتیك نوسراوەو زاراوە سەرەکیەکانی سێگۆشەو بازنەو شکڵە ئەندازەییەکانی دین. بێ زانینی ئەم زمانە مرۆڤ ناتوانێ هیچ شتێك لەم جیهانە تێبگات و لە پێچوپەنا تەپینیئامێزەکانیدا گرفتار دەبێ"[32].

دیدی زانستی مۆدێرن بەم "زمانە ماتماتیکیە" دەدوێ. پاش میکانیکی سیارات ئیدی بناغەی کۆنی جیهانبینی فەلسەفی بایەخی خۆی لەدەست داو ئەو ئارەزۆکە ماتماتیکیەی کە بە جوڵەیان دابوو، ڕیساکانی باڵادەستی سەدە دوور دریژەکانی گۆری.

دیدی ئامانجخوازانە پاشەکشێی کردو جیهان وەك دەزگایەکی ماتماتیکی لێهات. هەر لەم جیهانە گالیلۆ -نیوتنیەدایە کە ئەزموون دەبێ بە دۆزینەوەی یاسا ماتماتیکیەکانی سروشت، بکات. زانایەکی فیزیای مەزن چەند سەدەیەك پاش گالیلۆ لە وتارێکدا لە زانکۆی ئۆکسفۆرد (ژوئن **1933**) گەڕایەوە بۆ ئەم خاڵە. ئەنیشتاین وتی:

"ئەزمونی ئێمە تا ئێستا ئەو باوەڕەی ئاراستەکردووە کە سروشت بریتیە لە بەدیهاتنی سادەترین ئەو بیرانەی دەکرێ بەشێوەیەکی ماتماتیکی وێنایان بکەین. من بڕوایەکی پتەوم بەوە هەیە کە دەکرێت بەهۆی بونیادە ماتماتیکیە پەتیەکان، پەی بە چەمك و پەیوەندیە یاسائامێزەکانی نێوانیان ببرێ کە کلیلی تێگەیشتنی دیاردە سروشتیەکانە. ڕەنگە تاقیکردنەوە، چەمکە ماتماتیکیە گونجاوەکان بە بیردا بهێنێ، بەڵام بێگومان ناکرێ چەمکەکان لە تاقیکردنەوەوە هەڵێنجێنین. دیارە تاقیکردنەوە تەنها مەحەکی سودمەندی فیزیکی هەر بینایەکی ماتماتیکیە، بەڵام بنەمای خولقێنەر لەناو ماتماتیکدایە"[33].

ئەم قسانە لە مانای ئەوە نیە کە لە فکری زانایانی پاش ڕێنسانسدا هیچ پاشماوەیەك لە بنەماکانی میتافزیکیا نەماوە یان چەمکە بنەڕەتیەکانی زانستی تازە، هیچ کاریگەریەکی لەلایەن جیهانبینی و دیدی فەلسەفی زانایانەوە، وەرنەگرتووە. میتافیزیکی ماتماتیکی- میکانیکی زانستی تازە (زانستی نیوتنی)، خاڵێکی کەمتر ناسراوە کە دەبێت بزانرێت و کاری هوسرلیش لە "قەیران"دا هەوڵدانە بۆ زانینی ڕادەی کارگەریی میتافیزیك لە زانستی تازەدا، تەنانەت دەکرێ بە مانایەك بڵێین کە یەکێك لە ئەرکەکانی هوسرل دۆزینەوەی کایگەری دیدگا نازانستیەکانی زانایە، لەسەر تیورە زانستەکانیان، بە تایبەت لەسەر "ماتماتیکی کردنی جیهان و سروشت". "بە بەڵگەنەویست دانانی" تەفسیری ماتماتیکانە بۆ جیهان و ڕەدکردنەوەی هەموو تەفسیرێکی ناماتماتیکانەی سروشت، ڕەگ و ریشەی لە دیدێکی میتافیزیکدایە کە ئەلێکساندەر کوئایەر لە کتێبی "لە جیهانی داخراوەوە بۆ دنیای بێکۆتای"دا (**1957**) خستوێتیە ژێر باس[34].

دنیای کلاسیکی سەقفێکی هەبوو کە بریتی بوو لە ئاسمانی داخراو. زەوی لە ناوەندی ئەم جیهانەدا بوو: بێ جوڵە، سەقامگیرو بەهێز. بەڵام میکانیکی سەیارات ئاسمانی وەك کۆمەڵێ ژمارەی بێکۆتایی پیشاندا. یەکێتی پتەو و دەرونیشی بە دەرئەنجامی یاسا ماتماتیکیەکان دانا کە بەسەر بەشەکانیدا (اجزاء) حوکمڕانی دەکات. زەوی سوڕاوەو ناسەقامگیر، ئەم بونەوەرە کەرامەتمەندە لە جیهانێکدا کە تەوەرو ناوەندی سەرەکی هەرچیەك بوو، بێگومان زەوی نەبوو ئیدی جگە لە ڕەگەزێك یا پێڕەوێکی یاسا ماتماتیکیەکان هیچی دی نەبوو. هەنوکە سێبەری مەرگ بەسەر جیهاندا کەوتبو. چیدی خاك بە پیرۆزو نەمر، نەدەزانرا. ئاسمانیش چیدی نەك سەقفێك نەبوو، بەڵکو بێکۆتاییەك بوو کە بێدەنگیەکەی تەنانەت دڵی فەیلەسوفێکی ئیمانداری وەك باسکالی دەهێنایە لەرزین و لە ڕاستیدا پاش نکوڵیکردن لە ناوەندێتی زەوی لەناو کۆی بونەوەرەکاندا، ئیدی ڕێگایەکی ئەوتۆ بۆ نکوڵیکردن لە (بوونی) هێزی باڵاو خودا، نەمابوو. ڕۆژگاری نوێ بە بەرپرسیاری و دواجار بە ترسە گەورەکان و دڵەڕاوکێ بێ حسابەکان، دەستی پێکرد. گوتاری عەقڵباوەڕی هەم باسی ئەو ترسانەی دەکردو هەم باسی ئەو بەرپرسیاریە. کتێبی جیهان! لە کۆمەڵێ وشە پێکهاتووە کە خود هەموو ئەو وشانە دەهێنینەوە ئاراوە، ئیدی لەسەر عەقڵی مرۆڤە ئەم وشانە بەیەکەوە ببەستێ و گوزەرانی مانادارییان

لێدروست بکات. کانت لە *"بنەما میتافیزیکیەکانی زانستە سروشتیەکان"دا* (1786) ئاماژەی بۆ ئەم خاڵە کردووە. ئەزموونی سروشت لە لایەك و تێگەیشتنی ئەقڵنی ئەم ئەزمونە لەلایەکی دیەوە، مەعریفەی زانستیە. سەردەرهێنان لە بنەما ئەقڵنیەکان (ئەرکی) میتافیزیکە کە "نا ئەزمونیە". بەڵام هەموو شتێکی ئەزمونی قابیلی ئەندازەگیریەو پەیوەست دەبێ بە ماتماتیکەوە. بەپێی ئەم تێڕوانینەش زانست ئەگەر بە ماتماتیکەوە نەبەسترێتەوە، جگە لە هونەرێکی سیستماتیك هیچی دی نابێت.

بەم شێوەیە "لۆژیکی ماتماتیك" کەم تا زۆر بە هاوشانی لۆژیکی شاراوە و کۆتایی جیهانی کلاسیك دادەنرێ. ئەو خاڵەی کە یاساکان، دوا یاساو رەها (مطلق) نین و بونیان پەیوەستە بە هەلومەرجە سروشتی –کۆمەڵایەتیەکانەوە، لە دیدی زانایانی پاش رێنسانس شاراوە نەبووە. بەڵام ئەم خاڵەیان ئەوەندە بە گرنگ نەدەزانی و دەیانگوت لەم جیهانە هەبوودا بە هەر شێوەیەك بێت و بەم دراوە دیاریکراوانەوە، ناسین جگە لە رێی لۆژیکی ماتماتیکیەوە مومکین نیە. لە کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاستدا رۆحیەتی باڵادەستی زانستی، "ئەرستۆیی" بوو. چەندایەتی تەنها بە یەکێك لە وتەزاکان دادەنرا و "ماتماتیکیکردنی سەرجەم دیاردەکان" بە هیچ شێوەیەك بە شێوازێکی پەسەندکراو دانەدەنرا. لە بەرامبەر ئەمەدا، تێڕوانینێکی بەهێزی دی کە تێڕوانینی نۆ ئەفلاتۆنیەکان بوو، جیهانیان لە جەوهەردا (بە جیهانێکی) "ئەندازەیی" دەناسی. ئەم تێڕوانینە کە لە ماوەی نێوان سەدەکانی دوانزە تا پانزەدا لە پلەی دوهەمی گرنگیدا دەهات، کارێکی قوڵی کردە سەر فکری رێنسانس. ئەمڕۆ کاریگەری ئەم تێڕوانینە لەسەر گالیلۆ و کوپرنیکۆس زانراوە. چەمکی "هاوسەنگێتی" جوڵەی جیهان کەلە نوسینەکانیاندا چەندانجار هاتووە، چەمکێکی نۆ ئەفلاتۆنیەتیە و ئەو تێزەی لەگەڵ خۆیدا هەلگرتووە کە تاکە شێوەی ئەقڵنی بۆ دۆزینەوەی هاوسەنگێتی جوڵە، سود وەرگرتنە لە شێوازە ماتماتیکیەکان. سەرەڕای ئەمە بە پێی تێڕوانینی میتافیزیکی زانایانی رێنسانس، دروستکردنی جیهان هاوکات بوو لەگەڵ "یاسای ژمارەکان" و لێرەوە جیهانی دەرەوە تەنها بەجێبەجێبوونی رێکخستنی ماتماتیکی دەزانرا.

کپلەر لە دەمی ئەفلاتۆنەوە دەڵێت خودا بەردەوام خەریکی "ئەندازیاریکردنە" و گالیلۆش تا ئەو جێگەیە چووە پێشێ کە دەیگوت سەرجەم سروشت جگە رێکخستنێکی ماتماتیکی، هیچی دی نیە[35]. ئەگەر ئەم حوکمانە وەك تێزێکی بنەڕەتی قبولکەین، ئەوکات دەبێ ئەوەش قبولبکەین کە لۆژیك تا جێگایەك بایەخی هەیە کە لەگەڵ رێسا ماتماتیکیەکاندا بێتەوەو "بونیادی ماتماتیکی جیهان" لە رێی ئەندازیاری و ماتماتیك و لۆژیکی ماتماتیکیەوە نەبێ، ناناسرێ. لە تێڕوانینی زانستی نوێدا ئەم "شیکارە ماتماتیکیەی" سروشت، تاکە شێوازی راستەو هەرکاتێکیش پێشینان لەبەر هەر هۆو شێوەیەك ئەم شێوازەیان بەکارهێنا، بە دەرئەنجامی دروست گەیشتن و هەرکاتێکیش رویان لەم شیکردنەوەیە وەرگێڕا، هەندێك حوکمی بێ نرخیان پێشکەشکرد. بورهانی ماتماتیکی *تا ئەو شوێنەی* سەری لێدەردەکەین بە ئاماژەیەك دانرا بۆ زانینی خولقێنەر (خالق). ئەم "تا ئەو شوێنەی کە.." بە هیچ شێوەیەك بە مانای شێوەیەك گومانخوازی و رێژەگەری نیە. تەنها هەنگاوی یەکەم پیشان دەدات لە رێگایەکدا کە دواجار دۆزیومانەتەوەو بڕوامان بە دروستی کردووە. گالیلۆ ئەم خاڵەی بە یەقین و بڕاوە دەزانی کە هەر ئەم زانینە کەمە لە ماتماتیکدا (کە دیارە بە هیچ

شێوەیەك بەراورد ناكرێ بە دانایی پەروەردگاری دروستكەری جیهان))، تاكە شێوازێكی راستە كە دەكرێو دەبێ پەرەی پێ بدرێ.

لە نێوان ئەم دیدگایەی گالیلۆو تێروانینی دیكارتدا چونیەكیەكی تەواو هەیە. بۆ دیكارتیش ماتماتیك رێخۆشكەری دانایی بوو. ماتماتیك و بەتایبەتی شیكاری ئەندازەیی كە خودی دیكارت چەند خاڵێكی تازەی تیا هێنابووە پێشی و چەند خاڵێكی تازەی داهێنابوو، بە میتودی سەرەكی هاوجوتكردنی سەرجەم زانستە مرۆییەكان دەژمێرێ. تەجریدی مەلومەرجەكانی جیهان بریتیە لە تەسەوراتی ئەندازەیی. لێرەوە فیزیا تا ئەو دەمەی لەگەڵ ماتماتیكدا دێتەوە، واقعیە. جیهانی یەكەم، جیهانی دەزگای ماتماتیكیە. جەوهەرەكەی چەندایەتیە. جیهانی دووەم" جێی ئامادی یان جیهانی فكرە، دنیایەكی نا ماتماتیكی (نابەردەوام). فیزیا، زانستی جیهانی یەكەمە. نیوتن باسی "بونیادی ماتماتیكی فەلسەفەی سروشتی" دەكردو لە كتێبەكەشیدا كە هەر بەم ناونیشانەوە بوو، دەینوسی لەبەر ئەوەی دەتوانرێ حوكمەكانی كتێبەكە بە میتودی ماتماتیكی بسەلمێنرێ، كەوابوو راستبونیان دەبێتە بناغەی پەیدابوونی زانستێكی تازە. ئەزمونگەران كە باوەڕێكی لەم چەشنەیان بە دوا حوجەتی ماتماتیك نەبوو، دواجار لە بەردەم ئەو رەخنەو هێرشانەدا كە هیوم كردیە سەر بناغەی فەلسەفەكەیان، مەیدانیان چۆلكردو كار گەیشتە دەستی ئەو عەقڵباوەڕانەی كە بە شێوەیەكی تازە پێیان لەسەر لایەنی ماتماتیكی رێكسختنی جیهان دادەگرت. یەكێك لە گەورەترین ئەم فەیلەسوفانە كە (لایبنیتز)ە پێشتر ئاماژەی بۆ ئەم شێوە تازەیەی باوەڕهێنان بە هێزە عەقڵی ماتماتیكی كردبوو. ئەو لە "وتارێكی تازە لە بارەی هێزی تێگەیشتنی مرۆڤ"ەوە (1703) كە خۆی وەلامێكە بۆ "جۆن لۆك"، چەندانجار باسی ئەم خاڵەی كرد.. بە تایبەتی لە فەسڵەكانی شەشەم و حەوتەمی كتێبی چوارەمی ئەم وتارەدا، بنەمای ماتماتیكی نەك هەر لە جیهاندا بەڵكو لە ئەقڵنیەتی مرۆڤ و لە زماندا، خستە ژێر لێكۆڵینەوە[36].

رەنگە بۆ تێگەیشتن لە بنەمای میتافیزیكی زانستی مۆدێرن، خراپ نەبێت ئاماژە بۆ گرنگی ناسینی ماتماتیكی لە ئاسۆیەكی فكری دیدا بكەین. لە "تیمائوس"ی ئەفلاتونا كە بابەتەكەی بریتیە لە پەیوەندی مرۆڤ و جیهان، باسی "دروستكردنی جیهان" دەكرێت. بناغەی باسەكەی ئەفلاتون نمونەی ماتماتیكە. ئەو باسی "تەناسوب" دەكات و بۆ رونكردنەوەشی سود لە "زانستی ژمارەكان" وەردەگرێ[37]. بناغەی ئەم باسە لە "كۆمار"یشدا دوبارە بۆتەوە. لە كۆماردا باسی "زانینی ماتماتیكی" كردووە. لە پارچەی "552"دا دەخوێنینەوە كە "زانستێكی سادە" هەیە كە هەموو هونەرو زانستەكان پێویستیان پێیەتی كە ئەویش زانستی حساب و ژمارەیە. ئەم زانستە سەروكاری لەگەڵ ژمارەیەداو "ژمارەكان بەرەو هەقیقەت رێنمایمان دەكەن"[38]. پاشان رونیدەكاتەوە كە "ئەندازە" رۆحی مرۆڤ بەرەو بوونی نەمری رێنمایی دەكاو جگە لە "ناسینی بوونی نەمر، نەگۆڕ نیە". بەڵام دواجار:

هیچ كەس ناتوانێ نكوڵی لەوە بكات كە هیچ زانینێك ناتوانێ لە بوونی راستەقینەی شتێك بگات. چونكە هەموو هونەرو زانینەكان یان سەروكاریان لەگەڵ خەیاڵ و باوەڕو ئارەزووە مرۆییەكاندایە، یان خەڵكی بۆ ئەو مەبەستە دۆزیویانەتەوەو بڵاویان كردۆتەوە تا بەهۆیەوە شتێك دروستكراوە، بپارێزن. ئەو زانینانەش كە گوتمان دەكرێ بەهۆیانەوە لە بوونی راستی نزیك بینەوە، وەك ئەندازەو زانینە هاوشێوەكانی، سێبەرێكی بوونی هەقیقی دەبینن

چونکە لەکاری خۆیاندا یارمەتی لە گریمانە نەسەلمینراوەکان وەردەگرن و بەدەست لینەدراوی دەیانهێڵنەوە، چونکە ناتوانن لە ریگەی دیالیکتیکەوە بچنە ناو قوڵاییانەوە.. ئایا دەکرێ شتیك کە لە سەرەتاکەیەوە بە نەزانراویك دەست پیبکاو ناوەراست و کۆتاییەکەشی لە کۆمەڵێ نەزانراو پیکەوە گرێ بدرێ، ناوی زانینی لیبنرێ؟"[39].

فکری عەقڵانیی و باوەربوون بە توانای مرۆڤ بۆ تیگەیشتنی عەقڵانی بون، زادەی دنیای مۆدیرن نیە. یونانیەکان بیریان لە عەقلباوەری دەکردەوە. لەسەر ئەم بنەما فیکریەش بوو کە میتافیزیکی ئەرستۆ پیکهات. پەیوەندی عەقڵنیەت بە ماتماتیکەوە یەکیکە لە بابەتە گرنگەکانی کتیبی مو (کتیبی سیانزەهەم) لە "*میتافیزیك*" دا. لیرەدا ئەرستۆ وتویژ لەگەڵ ئەفلاتۆن و ماتماتیك زانایانی سەردەمەکەیدا دەکات و قبولی ناکات کە "شتە ماتماتیکیەکان" بونیان هەبیت لەوانە (واتە شتە ماتماتیکیەکان) نە بە جەوهەریك دادەنیت و نە بونیشیان بە پیشینەتر لە بوونی شتە هەستپیکراوەکان دادەنیت، بەلکو تەنها لەروی چەمکیەوەیە کە پیشینەیان هەیە"[40]. ئەرستۆ لە فەسلی شەشەمی "کتیبی مو"دا هیرش دەکاتە سەر ئەو جیهانبینیەی کە ژمارە بە بنەمای میتافیزیکی بوون دادەنێ. پاشان لە ناسنیی ماتماتیکی دەکۆلیتەوە. دواجار لە کۆتایی "کتیبی مو"دا باسی زانینی بە مانای کردەگی دەکات کە نزیکە لەو شتەوەی ئەمرۆ "تیگەیشتنی ماتماتیکی" پیدەلین. "چونکە ناسین وەك چاوگی ناسین: "*to epistasthai*" بە دوو مانا دیت: لە لایەك بە مانای زەبرەکی و لە لایەکیش بە مانای کردەگی. هەنوکە "هیز یان توانا" کە وەك مادە، هەمەکی و دیاری نەکراوە.. بابەتەکەشی هەمەکی و دیارینەکراوە. بەلام "کردەگی بوون" دیاریکراوەو بابەتەکەشی دیاریکراوە. چونکە ئەمە "شتیکە" و بابەتەکەشی هەر ئەم "یەك شتەیە"[41].

لە سەدەکانی ناوەراستدا عەقلباوەری کە پابەندبوو بە "تیگەیشتنی بابەتی دیارینەکراوە" و بووە هاوریی تەفسیری دینی بۆ جیهان و ریکخستنی جیهان، بە دەربرینیکی وردتریش بە تەواوی بووە پاشکۆی. ناتوانرێ (لە هەندی حالەتی ئاوارتەدا نەبێ) بە مانای مۆدیرن (یان تەنانەت بە مانای یۆنانی وشەی عەقڵ) باسی خەسلەتی بالادەستی لە فکری فەلسەفی سەدەکانی ناوەراستدا بکرێ. تیگەیشتنی پەیوەندی مرۆڤ و جیهان، بە شیوەیەکی قوڵ رەنگیکی دینی هەبوو. لە پاش رینسانس ئەم لایەنە بالادەستە، کەمرەنگترو بیهیزتر بوو. پەرەسەندنی زانستەکانی فیزیا لەسەر بناغەی ئیدراکی ماتماتیکی، بەشیوەی هیواش بەلام بەردەوام، ریگەی خۆشکرد بۆ ئەوەی فەیلەسوفان لە "باسکردنی مەسەلە مرۆییەکاندا" لە گوتاری دینی دورکەنەوە. بەلام ئەم جیابونەوەیە بووە هۆی بالادەستی دیدگایەکی دی کە دەکرێ لە روی جیهانی فەلسەفی (و گەردونناسیەوە) بە (کوپرینکی – گالیلۆ– نیوتنی) ناوبنرێ. ئەم دیدگا تازەیە لە بناغەدا لەسەر هەمان ریسای بوونی جیهانی وەك کۆمەڵێ ریسای ماتماتیکی، دامەزرابوو. بەلام جیهانی مرۆیی هەر شکلیك بەخۆیەوە وەربگرێ، دواجار جیهانی ئەزمونە مرۆییەکانە. جیهانیکە کە تا رادەیەکیش دروستکراوی خودی مرۆڤە. بە وتەی لاکمان خەسلەتی ئامادەبوونی بابەتی و ئوبژیکتی واقعە کۆمەلایەتیەکان (بەهەر شکلیك کە بە گریمانە وەربیگرین) بەستراوە بە بونیادی هەمەکی ئاراستەوەرگرتنی زیهنەوە بەرەو جیهان[42]. لیرەدا خالیکی گرنگ دیتە پیشێ: پیدەچێ کە دەربرینی وردی ئەوەی چۆن خەسلەتەکانی ئوبژیکت بەستراون بەم بونیادە هەمەکیەی ئاراستەوەرگرتنی خودەوە

بەرەو جیهان، هەروەها ئەوەی کە ئەو بونیادانەی باسی دەکەین بە وردی چین، کۆمەڵێ پرسیاری گرنگن کە زانستی ئەزمونگەری وەڵامێکی بۆیان نیە. بە هاوکاری شیکردنەوەی ماتماتیکیشەوە ناتوانرێ وەڵامێك بۆ ئەم پرسیارانە بدۆزرێتەوە، لایەنی کەم تا ئێستا کەس وەڵامێکی نەدۆزیوەتەوە.

هوسرل لە *"قەیران"* دا دەریخستووە کە نەك هەر سەرجەم جۆرە شکڵ و دەرئەنجامە تیوری– فەلسەفی و کردارییەکانی ئاراستەوەرگرتنی خود بەرەو جیهان، لە نەریتێکی دێرینەوە هاتوون، بەڵکو خودی ئەو باوەڕەی کە ئێمە دەبێ ئاراستە وەرگرتنێکی تیوریمان بەرەو جیهان هەبێت، خۆی بەرهەم و بەشێکی "نەریت"ە. بۆ تێگەیشتن لە دەستکەوتەکانی گالیلۆ دەبێ "ئەو میراتەی بەو گەیشتووە" واتە "زانستی هەنوکەو ئامادەبوونی ئەندازە" لەبەرچاو بگرین، بەڵام گرنگتر لەمە ئەوەیە دەبێ ئەو خاڵە بزانین کە پێویستی ئاراستەوەرگرتنی تیوری واتە پێویستی بیرۆکەی زانست و ئامانج و پەیامی دۆزینەوەی ڕاستیەکان لە بارەی جیهانەوە، خۆی بەستراوە بە نەریتی یۆنانی فەلسەفەوە. نەریتێك کە جیاوازی دەکرد لە نێوان ناسین (شکڵی دەرکەوتن) لەگەڵ جیهاندا (واقعیەت).

یەکێك لە گرنگترین بابەتەکانی لێکۆڵینەوەی دیاردەگەری، ئەزمونە. شیکردنەوەی دەروونناسیانەی ئەزموون، لە چوارچێوەی "زانستی ئەزمونگەری"دا شکڵ وەردەگرێ کە ئەزمون بە ڕوداوێکی بابەتی لە جیهانی ئەمبریکیدا (بە وتەی موریس میرلۆ پونتی جیهانی ئەزمونهەڵگر) دادەنێ و هەر گشتگیرکردنێکی تیوری، مەعریفی و هەر هەڵێنجانێك، دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەم بنەما "ئەزمونهەڵگرە". بەڵام دیاردەگەری ئەم لایەنە بابەتی، ئەمبریکی و مێژوییە وەلاوە دەنێ و باسی *جەوهەری* ئەزموون دەکات. ئەزموون بەهۆی داهێنەری خەیاڵ یان زیهنەوە شکڵ وەردەگرێ، وەك چۆن ژماردن بەهۆی ژماردنی یەکەکان و دواجار بەهۆی یەکە ئەژمارهەڵگرەکانەوە، مومکین دەبێت. بەڵام دیاردەگەری بە بیرمان دەهێنێتەوە کە شکڵە پەتیە ئەندازەییەکان لە واقعیەتی شکڵە هەستپێکراو، مادی و هەبووەکان جیایە. ئەزمونکردنی هەر هەست، هەر ئیدراکێکی حسی یان هەر داوەریەك، لایەنێکی "دەگمەن و پەتی" هەیە کە دەبێ بدۆزرێتەوە. حساب بە ئەژماردن و ئەندازە بە شکڵ وەرگرتنەوە، هیچ کامیان بە زانستێکی ئەزمونگەری ناژمێرێن. لێرەدا ئێمە بەرامبەر *بونیادەکان* ڕاوەستاوین نەك بەرامبەر دراوە ئەزمونیەکان. زانستە ماتماتیکیەکان سەروکاریان لەگەڵ پەیوەندیە دەرونیەکانی ڕەگەزەکانی شتێکدایەو نەك لەگەڵ پەیوەندی شتێکی هەمەکی بە شتەکانی دیەوە. هوسرل لە *"لێکۆڵینەوە لۆژیکیەکاندا"* ناوی ناون "زانستگەلێك لە بارەی جەوهەر" یان "زانستەکانی ئایدتیك" (لە فەلسەفەی هوسرلدا هەمیشە ***eidos*** بە مانای جەوهەر هاتووە).

بە بڕوای هوسرل زانین بەهۆی پەیوەندی وەرگرتنی حوکمەکان بە یەکدیەوە، بەدەستدێت. گوزارەکان کاتێك بەیەکەوە گرێ دەدرێن، ئاماژە بۆ جۆرێك لە ئەزموون دەکەن. لە ڕاستیدا بەهۆی ئەم بنەما ئەزمونیەوەیە کە پێکەوە گرێدانی حوکمەکان، بە بایەخدار دەژمێرێت. بەڵام ئەم ئەزمونە کە لە فەلسەفەدا زۆرتر پێی دەڵێن "ئیدراك بە مانای گشتی"، لە بارەی ئامادەبوونی دراوەکانی جیهانی بابەتیەوەیە. بەدەر لەو کەموکوڕیانەی کە فەیلەسوفان (لە گومانخوازەکانی یۆنانەوە تا ئەمڕۆ) لە بارەی ئەم ئیدراکی هەستیەوە ژماردویانە، زۆرێك لە بیریاران، ئەوانە بە تاکە ڕێگەی ناسینی جیهانی دەرەوە دەزانن: بەڵام هوسرل دەڵێ کە جیاوازی هەیە لە نێوان ئەم ئەزمونانەو شێوەیەکی دی ئەزموندا. ئەمجۆرەی دوەم ئێمە بە جۆرەکان و

بونیادەکان و پەیوەندیە مانابیەکان ئاشنا دەکات کە هوسرل ناویان دەنێ "شـهودە بنەڕەتیـەکان" یـا "(بابەتـەکانی) ئـایدتیك". ئـەم ئەزمونانـە خۆبـەخۆ ئاشکران، بەشێوەیەك لایەنێکی پیشینەییان هەیەو ناڕادەیەك لە حوکمە پیشینەکانی ذانت دەچن. کاتێ دەڵێین لە دوو دەنگدا "دوو نۆت"ی جیاواز یەکێکیان ڕاستای لەرزینی زیاترە لـەوی دیان، هـەمان بونیـادی پێش ئـەزمونی زیـهن قسـە دەکـات، کـە دەڵێـین هوشیاری هەمیشە هوشیارێکە بە شتێك، یان دەڵێـین 1+2 =2+1.

لە ئـەفلاتون بـەدواوە زۆرێـك لـە فەیلەسـوفان جیاوازیدەکەن لە نێوان "بـوون وەك چۆن لـە خۆیـدا هەیە" لەگەڵ "بوونی پێناس کراو" (قابیلی گۆڕین بە پێی ئیدراکی هەستی یان بە پێی پێداس یـان..). بە بڕوای ئەوان دەتوانین یەکـەمیان بزانـین، بەلام ئەمـە ناسینێکی بنەڕەتیە کە ڕەگ و ڕیشەو بنەمای بوونـی هەر شـتێك روندەکاتـەوە، ناسـینێك کـە *episteme* ناودەنرێ (ئەم وشـەیەی ئەپسـتیمەتان لـە یـاد بێـت چونکـە لـە فەسـڵەکانی دوایـیدا بـە تایبـەتی لـە رونکردنـەوەی تـێڕوانینی فۆکـۆ لـە بـارەی دابڕانـە زانستیەکانەوە، گرنگیەکی زۆری هەیە). بەلام ناسـین بە پێی پێناسە کە بوونـی پێناسـەکراو دەهێنێتـە پێشـێ، زانینێکـی هەمـەکی و بڕاوە نیـە، لایـەنێکی کـاتی هەیەو بـە ئاسـانی دەکـرێ بـەتاڵ بێتـەوە. یونانیـەکان کـە لـە بەرامبـەر ئەپسـتیمەیان دادەنـا، پێیاندەگوت *Doxo* دۆخا. ناسینی یەکەم بەدەرە لە هـەموو پێناسـێکی پێشـینەیی، پەیوەندیـەکی بـە پێناسە ڕێکخۆشکەر و ڕێژەییەکانـەوە نیە کـە بـە هاتنیان کاتیە. بـە پێچەوانـەوە ناسـینی دوهـەم بەمشێوەیە نیە. ئەپستیم یـان یەکـەم شـکڵی ناسین گرنگیەکی زۆری لـە دیاردەگـەری هوسـرلدا هەیـە، هەمان "ناسینی دور لە هەر دیاریکردنێکی زیادە"یە. خاڵی گرنگ و سەرنج ڕاکێشەر ئەوەیە کە ئەپستیم لە باسی یونانیەکاندا لە بارەی ئەندازەشەوە، گرنگیەکی زۆری هەبوو. لەهەر کۆمەڵگایەکدا چەند سـەرەتاییش بێت، هونەری ئەندازەگیری و مەساحە هەیە. سـنوری وردبونەوەو شێوەی بەکارهێنانی وردبونەوە، دەکـرێ بەستراپێت بە ئامێری تەکنیکیەوە. و لـێرەوە دەشـی بەهۆی کـارایی تـەکنیکی و تەکنەلۆژیـەوە، بگۆڕێت. واتـە ئامانجـە عەمەلیـەکان مانـا بـە "چـەمکی وردبونەوە" دەدات و هـەر لـێرەوە ئەرستۆ دەیگوت کـە "وردبونـەوە" سـنوردارە. بـەلام "بیرۆکـەی وردبونـەوە" وەك هـەموو بیرۆکەیەکی دی، دەچێتـە سـەرو ئـەم سـنوردارێتیانەی، زادەی ئامانجـە عەمەلیەکانن و بە وتـەی هوسرل لـە "ئاسـۆی بـێ سنوردا" رادەوەستێ.

یۆنانیـەکان شـکڵە ئەندازەییـەکانیان بـە "هەلومەرجی نمونەی دەرکەوتنی بوون وەك چون کە هەیـە" دەزانـی. بۆ سەلماندنی ئەمـە هـەر ئـەوەندە بەسە وتوێژەکانی (محاورات) ئەفلاتون وردبینەوە بـۆ ئەوەی بزانین کە ئەندازە بـە شـکڵی کامڵی ئەپستیم دەزانرا. مامۆستایی و بالادەستی بەسەر میتۆدەکانی ئـەندازەدا، بـە مامۆسـتایی و لـێزانی لـە لۆژیکـدا دادەنرا، گـالیلۆ ئـەو سـەردەمە کـە ئـەندازەی بـە "نمونـەی زانینـی راسـتەقینە" دادەنـا، ئـەم دیـدە ئەفلاتۆنیەی قبوڵ بـوو. بە وتـەی هوسـرل "فیزیای گالیلۆیی لە راستیدا ئەفلاتۆنیە" گالیلۆ کە ئـەندازەی بە نمونەی ناسین و زانین دادەنا، ئەوەندە هـەوڵی بۆ سەلماندنی ئـەم حوکمـە نـەدا، لـە راسـتیدا ئـەم حوکمەی وەك حوکمێکی بڕاوە وەرگرت کە پێویستی بە تـاوتوێکردنی رەخنەگرانە نیـە. قبوڵینـەکرد کـە هەریـەك لـە زانسـتە سروشـتیەکان بە پێوەرێکـی ئەندازەیی هەڵسەنگێنرێن و وەك نۆ ئەفلاتۆنیەکانیش جیاوازیکرد لە نێوان شکڵی دەرکـەوتنی هەستپێکراو و یـان بینینـی یـان دەرککردنـی سروشـت لەگـەڵ هەقیقەتەکەیدا واتە بناغە یان بونیـادە ئـەندازەیی —

ماتماتیکیەکەی. ئاشکراکردنی ئەم بونیادە شاراوەیە بە کاری هەر زانستێکی تازە زانرا. زانستی فیزیا یەکێك لەم زانستە تازانە بوو کە دەبێ "لۆژیکی ماتماتیکی دەرونی سروشت" ئاشکرا بکا. دیارە گالیلۆو دیکارت و نیوتن باسی "ماتماتیکیکردنی سروشت"یان نەکرد. ئەوان نەیاندەگوت کە سروشت "ماتماتیکی دەکەن" بەلکو دەیانگوت کە کارەکەیان لەوە زیاتر نیە کە جەوهەری ماتماتیکی سروشت، ئاشکرا بکەن. بەم شێوەیە شێوەی دەرکەوتنی بەستراو بە شوێن و کاتیشەوە، بە نمونەیی دەکرا، واتە دەگەڕێنرایەوە بۆ بنەما، ماتماتیکیەکەی خۆی. جوڵە بە پێی ئەم ڕوانینە گۆڕینی جێگا بوو لە ناو کاتداو دەبەسترایەوە بە بنەمای ماتماتیکی – ئەندازەییەوە.

نمونەیی شکڵی ئەندازەیی، سنوردارێتی دەهێنایە پێشێ. بەلام نەك هەر میتودەکانی ئەندازەگیری، بەلکو ڕێساکانی فیزیاش بەردەوام لەم سنوردارێتیە تێدەپەڕین. وردبونەوەی ماتماتیکی –ئەندازەیی لە پانتای سنوردارێتیدا ڕاوەستاوە، بەلام بیرۆکەی "بێ سنوری" واتە "ئاسۆی فراوان و کراوە" خۆی دەسەپێنێ. یەکەمیان پەیوەستە بە ئامانجە عەمەلیەکانەوە، بەلام دوهەمیان لەو زیاتر دەڕوا. یەکەمیان بەستراوە بە چەندایەتی جێگەو کاتەوە، دوهەمیان بەستراوە بە چۆنایەتیەوە. ئەندازە تەنها پەیوەندی بە جێگەو فەزاوە هەیە، نەك بە چۆنایەتیەوە. هەموان بەردەوام "بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆو بە یارمەتی هۆکارگەلێك" ئەندازەی چۆنایەتی دەکەن و بە قابیلی موحاسەبەی ماتماتیکی دادەنێن.

پاش لیونارد ئۆلەری ماتماتیك زانی سویسی و نامەکەی کە لە ساڵی ***1748***دا پێشکەکەش بە فەرهەنگستانی پاشایەتی پرۆس کرا، واتە ***"ئەندێشەگەلێك لە بارەی زمان و جێگا"*** وە ئەو بیرە هاتە پێشەوە کە هەرچەندە چەمکەکانی کات و جێگە لە فیزیادا بەستراوە بە چەمکە فەلسەفیەکانی "کاتی ڕەها" و "جێگەی ڕەها"وە، بەلام دەبێ بۆ باسکردنیان لە بواری فیزیاوە دەست پێبکرێ. بەم فکرە نەك هەر فیزیا لە فەلسەفە سەربەخۆ بوو، بەلکو بە وتەی کانت "زانست خۆی وەك پانتایی ڕاستەقینە دەرخست". زانست لە سەرەتای سەدەی نۆزدەدا، دراوێکی سەربەخۆو ڕاستەقینە بوو کە مێژووی تایبەتی خۆی هەبوو. لەگەڵ هوسرلدا بوو کە زانست بوو بە کێشەیەك یان مەسەلەیەکی چارەسەر نەکراو. هوسرل چالاکیەکانی زانستی بەو شێوەیەی لە سەدە مۆدێرنەکاندا پەرەی سەندبوو بە "کارکردنی ماشینێك" چونیەك زانی. واتە زانستی یەکسانکرد بەکارکردنی دەزگاکان سیستەمێکی داخراو کە لە خۆیدا کار دەکات. بێگومان ئەمە چەمکێکی فەلسەفەی دەزگایە، بەلام وشەی ماشێن مانایەکی لە پیشەسازی مۆدێرن و تەکنەلۆژی تازەدایە کە نەیدەتوانی لە دیدی وردبینی هوسرل ون بێت: کارکردنێك بە تەواوی میکانیکی و دیاریکراو کە خولقێنەری دەرئەنجامی تازە نیە، گۆڕانی بەسەردا نایەت، مەگەر تەنها بەپێی هۆیەکی قابیلی ناسین یان قابیلی حسابکردن و لەڕەوی چەندایەتیەوە قابیلی ئەندازەگیری "خراپ بێ" یان "خراپ کار بکات". هەرکاتێك ڕێسا ڕواڵەتیەکانی شێوەی کارکردنی ماشینمان زانی، دەتوانین کاری پێبکەین. ئەو ڕێسایانەی کە پێشتر دیاریکراون. میتۆدە زانستیەکان دادەهێنرێن، ڕێسابەند ئەکرێن، دەکەونە کارو هاوجوت لەگەڵ یاساو نەریتی ئەقڵنیەتی زانستیدا، بەکارهێنانیان دەبێ بە ڕێساو نەریت. بەمشێوەیە ناسینی زانستی، جگە لە بەکارهێنانی سەرکەوتوانەی میتۆدە زانستیەکانی هیچی دی نیە. "کارگوزارانی زانست" ئەو کەسانەی کە "بە دەرەنجامی عەمەلی" دەگەن.

بەڵام بە بڕوای هوسرل کاری فەیلەسوف کورت نابێتەوە بۆ ئەم کارە. پرسیاری فەیلەسوف پرسیارێکی رادیکاڵە (واتە دەبێ پەی بە رەگی شتەکان و سەرچاوەکانیان بەرێ". فەیلەسوف بەکاری واقعی عەمەلی، بەڵام میکانیکی ماشین رازی نابێت. ئەوە ئیدی مەسەلەیەکی لاوەکیە بپرسین ماشێن چۆن کاردەکات؟ بە تایبەتی کاتێ کە وەڵامێکی دروستمان بۆ ئەم پرسیارە نەدۆزیوەتەوە: "بۆچی کاردەکات". ئامانجی زانین "رەگی دروستکەری کارە"، واتە هەلومەرج و سنورەکانی کار. لە دیاردەگەری هوسرلدا کە (کە لایەنی کەم لە سەرەتای رێدا هاوسەفەری دیکارتە) جیهان ئەوە نیە کە بەرچاو دەکەوێت، چونکە "چاو و ئەوەی بەرچاو دەکەوێت، خۆیان بابەتی دیاریکراون". بابەتگەلێکن کە بەهۆی پێشگریمان و تێزەکانەوە شکڵ وەردەگرن. جیهان لە چاوی دیاردەگردا "بابەتی ئەزموون"ە جیهانێکە کە تیایدا لە دایک دەبین، کاردەکەین و لەگەڵ ژیان لەگەڵ ئەوانی دیدا، پەیوەندیەك بە سروشت و کۆمەڵگاوە دەکەین کە تا رادەیەك سەربەخۆ لە جۆری کار، نیەت و ئامانجی ئێمە، شکڵ وەردەگرێ. لەم "ژیانگایە"دا (*Lebens welt*) هەموو شتێك مانا یان دەلالەتی مرۆیی وەردەگرێ. رێسا زانستیەکان پاش ئەم گۆڕانە دروست دەبن، لە کاتێکدا رێسا زانستیەکان ئەوەیە کە ئێمە بگەڕێنێتەوە بۆ پێش ئەم گۆڕانە.

ڤیلهام دیلتای رەخنەی لە فەلسەفەی ئەزمونگەری ئینگلیزی دەگرت کە "خاوەن کلتوری مێژوویی" نیە. هانز گئورگ گادامێر لە کتێبی "هەقیقەت و میتۆد"دا (*1960*) ئاماژە بەوە دەکات کە ئەم خاوەن ئەزموونە دەرئەنجامی تێگەیشتنێکی تایبەتە بۆ ئەزموون. ئەزموون تەنها کاتێك کە لە دوبارە بونەوەدا بسەلمێنرێ، نرخی هەیە. "بەڵام ئەم خاڵە بە مانای ئەوەیە کە ئەزموون مێژووی خۆی لەناو ببات". گادامێر بە بیردا دەهێنێتەوە کە لە رۆژگاری نزیك لە ئێمەدا، هوسرل سەرنجی لەم خاڵە داوە کە زانست "ئەزموون دەکات بەشتێکی نمونەیی". بەڵام ئەوەش دەڵێ کە خودی هوسرل لەم تاك رەهەندیەی میتۆدی زانستی مۆدێرن، رزگاری نەبوو "چونکە ئەو جیهانی نمونەی ئەزموونە زانستیە وردەکانی تا ئاستی ئەزمونێکی رەسەنی جیهان، گشتگیرکرد". لە ئەنجامدا هەوڵی هوسرل بۆ تێگەیشتنی نامێژووی ئەزمونێکی رەسەن، گرفتئامێز بوو"[43]. بەڵام ئەو خاڵەی لێرەدا لە چاوی گادامێر ون بووە، جەختکردنی هوسرلە لەسەر ژیانگا کە هەلومەرجی مێژوویی ئەزموون دیاری دەکات.

### ژیانگا

بە بڕوای هوسرل هەریەك لە ئێمە لە جیهانێکی تایبەتی خۆماندا دەژین. "ژیانگا" دوا جێگە و رەنگە بکرێ بڵێین جێگەی هاوبەش"ی ژیانی هەموومانە. ئاسۆی ژیانمان لە جیهاندا، "ژیانگا"یە، جیهانێکە کە تیایدا بیردەکەینەوە، لە راستیدا هەر ئەم جیهانەیە کە بیر دروست دەکات. جیهانێکە کە "لەوێدا هەیە" و "لە پێشەوە دانراوە"، جیهانێك کە "دنیای راستەقینەو پێش تیوریە". ژیانگا، بە هەمان سادەیی چەمکی ئاراستە وەرگرتنی سروشتیە، چەمکێك کە لەو بەرهەمانەدا کە هوسرل پێش "قەیران" نوسی بووی، دەورێکی گرنگی هەبوو. ئاراستە وەرگرتنی دیاردەگەرانە، ئەزمونێکی پەتی لە جیهان دەهێنێتە پێش، ئەزمونێکی رەها لە هەر دەست نیشانکردنێکی تیۆری و تەنانەت گرنگتر لەمەش (رەها لەمەر) واقعیبوون یان نەبوونی ئوبژێکتەکانی هوشیاری. لە ژیانگادا ئەزمونێکی یەکسەری، بێ هاریکاری راستەوخۆ هەر دەستنیشانکردنی، شکل وەردەگرێ

ئەگەرچی چەمکی "ژیانگا" لە هەمەکیەتی خۆیدا بۆ یەکەمجار لە پارچەکانی کتێبی قەیراندا باسکراوە، بەلام پێشینەی سەرهەلدانی دەگەڕێتەوە بۆ زۆر پێشتر. یەکەم ئاماژەی هوسرل بۆ "چەمکی سادەو پەتی جیهانێك کە تیایدا دەژین" دەگەڕێتەوە بۆ سالی **1915** و بۆ پاشکۆی سیانزەهەم لە پارچەی **64** بەرگی دوەەمی "بیرۆکە ڕێخۆشکەر"ەکان. واتە لەو نوسینانەدایە کە پاش مردنی هوسرل بلاوبونەوە. لەو پارچەیەدا دەخوێنینەوە کە دنیای رۆح "ئامادەیی ئەنتۆلۆجی جیاواز لە جیهانی سروشتی" هەیە، کەوابوو ناکرێ "بە قولبونەوە لە ژیانی سروشتی لە رۆح بگەین"[44].

رۆح بە پێچەوانەی سروشتەوە لایەنێکی رەهای هەیە، "جەوهەرێکی کراوەیە بە روی جیهان"دا کە دەیخاتە سەرو یاساکانی سروشتەوە. ئایا دەکرێ سەرچاوەی ئەم جیاکاریە لەو جیاوازیەدا بدۆزینەوە کە دیلتای و ریکارت لە نێوان جیهانی سروشتی و جیهانی کۆمەلایەتی یان مرۆییدا، دەیانکرد؟ بێگومان ئەم خالە یەکسەر بە بیردا دێت، بەلام سەرچاوەی ئەم جیاوازیە لە ئاستێکی قولتردا دەدۆزرێتەوە، هوسرل لە *"قەیران"* دا مێژویەکی کورتکراوەی دنیای مۆدێرن یان جیهانی فکرئامێزی مۆدێرنەی پێشکەش کردووە. ئەو ئەم مێژووەی لە گالیلۆوە دەست پێکردووەو تا رۆژگاری نۆکانتیەکان، درێژەی پێداوە. رۆحیەتی هەمەکی ئەم سەردەمە جۆرێك گەڕانەوەیە بۆ چەمکی "جەوهەری ناسین"، چەمکێکی ئەفلاتونی و دژ بە ئەرستۆیی. بەپێی ئەم باسە بابەتی هەست پێکراو لە رێگەی لاسایکردنەوەیەکی ناکاملەوە لە زیهندا دروست دەکرێتەوەو ئەم دروستکرنەوەیەش لەسەر بناغەی گریمانگەلێکی پتەو و رێساگەلێکی پتەو، ئەنجام دەدرێ. رێساگەلێك کە لە فەلسەفەی پاش رێنسانسدا (کە لە زۆر لایەنی سەرەکیەوە ئەفلاتونی بوو)، "دەربڕینێکی نمونەیی ماتماتیکی-ئەندازەیی" وەردەگرێ[45].

مرۆڤی مۆدێرن وا دەزانێ کە لە نێوان فکری خۆی و ئەوەی تاوتوێی دەکات واتە سروشت، جۆرێك چونیەکی (هاو جەوهەری) هەیە. مێژوی فکری فەلسەفی مۆدێرن، مێژووی ئەم خەیالەیە کە رێساکانی کارکردنی زیهن و رێساکانی جیهان، هەر یەکێکە. زیهن بە لەوحێکی پاك دادەنرێ کە لەبەر ئەوەی لەسەر بناغەی رێسا چەندایەتیەکان دروستکراوە و دامەزراوە. کەوابوو دەتوانێ ریسا ماتمکاتیکیەکانی جیهان دەرك بکات و بینوسێ؛ لێرەوە لەگەل "دنیای سروشتیدا" هاوڕێ دەبێو بە مانایەك ئەو دنیایەی پیشان دەداتەوە، دەبێ بە بەرەیەکی نوسراو. دیکارت لە ئاماژەیەکدا بۆ گالیلۆ (لەو نامانەدا کە لە نیوەی دوەەمی سالی **1638**دا بۆ سن و فەرمای نوسیووە"[46]، باسی ئەمەی کردووە. ئەو باسی چونیەکی جەوهەری ماتماتیکی سروشت و زیهن دەکات. هوسرل لە "قەیران"دا ئەم خالە رەد ئەکاتەوە"[47]. بنەمای ئەم رەدکردنەوەیەش باوەڕهێنانێتی بە بوونی ژیانگا. جیهانی واقعی لەگەل دنیای خەیالی کە دروستکراوی دیکارت و گالیلۆیە، یەکێك نیە.

ژیانگا دنیای ئەزمونە رۆژانەییەکانی ئێمەیە و لەکات و شوێندا بلاودەبێتەوە، بەشێوەیەك کە ئەزمونەکانی ئێمە بە یەکەوە گرێ دەدات. هەر شتێك یانی خۆی لە ژیانگا دەدۆزێتەوەو دەناسێ. پاش ئەمە ژیانگا بۆ هەر کەسێك دەبێ بە رێسا وەك بابەتی ئاسایی و ئاشنا. لە دیاردە سروشتیەکانەوە (وەك جێگۆڕکێی شەو و رۆژ، تێپەڕینی وەرزەکان)وە بیگرە تا چەمکەکان، شتەکان بە وتەی هوسرل بە پێی "عادەتە وجودیەکانی خۆیان پۆلبەند دەکرێن، نەك بە پێی ئەزمونی رۆژانە، یان بە پێی نمونە زانستیەکان. ئێمە بە پێی پێویستیە زانستی و

پراگماتیەکان، بەرنامە ریژی دەکەین. هەر شتیك لە ژیانگادا خۆی دەناسینێ و لەگەڵ زیهنی سوبژێکت یان "بناس"دا پەیوەندیەکی تایبەتی وەردەگرێ. هەرکەس ئەزموونی تایبەتی خۆی لە ژیانگادا، دەدۆزێتەوە. هەرکەس لەناو دنیای جۆراوجۆردا دەژی کە بە هۆی راهاتنیکی دریژخایەنەوە، نکولی لە نەگونجانیان لەگەڵ یەکدیدا دەکات. لەیەك رۆژدا چەند رۆلیکی کۆمەلایەتی بەرفراوان دەبینێ و کاردانەوەی دەرونی دژ بەیەك پیشان دەدات. ژیانی کۆمەلایەتی ئەم ئەزمونە فەردیانە دروست دەکات و لەکۆی ئەو ئەزمونانە یەك تاکە کەس و لە کوێ "ئەزمونی" تاکەکانیش، وینەیەك بۆ جیهان و ژیان (و شیوەکانی ژیان) دەخولقینێ. لە ژیانگادا پەیوەندیە "نیو-زیهنیەکان" واتە پەیوەندی نیوان تاکەکان، و تیروانینیان بۆ خۆیان، پەیوەندیان بە یەکدیەوەو بە ژیانی کۆمەلایەتی و دواجار "تیروانینە زانستیەکان" دروست دەبیت. چۆن دەتوانرێ سود لەم تیروانینانە بۆ ناسینی جیهان وەربگیرێ لە کاتیکدا جیهان خۆی ئەو تیروانینانەی دروستکردبێ، لە جیی سیمای واقعی دیاردەکان و پەیوەندیەکان، داینابیت؟

هوسرل لە "قەیران"دا بە جەختەوە (چەندانجار) نوسیویتی کە ژیانگا یەکیك لە خالەکان لە نیوان نۆریك لە خالە فەلسەفیەکانی دی نیە. ئەم دنیا دیاریکراو و هەبوو، کە تیایدا دەژین، مەسەلەیەکی سەرجەم فەلسەفیە، مەسەلەی گەردونی و بالادەست کە پەیوەندیە نیو زیهنیەکان و زمان دروست دەکات.

"هەرکەس لە سەرەتاوە وەك ئەندامی کۆمەلگایەکی زمانی و بە هۆیەوە ئاگاداری لە ژیار پەیدا دەکات. ئادەمیزاد وەك مرۆڤ، ئەودیو جیهان-جیهانیك کە تیایدا تاکەکان هەن، کە لە بارەیەوە قسە لەگەڵ یەکدیدا دەکەن و دەتوانن لە بارەیەوە قسە بکەن- و هەروەها زمان، بەشیوەیەکی لیك جیانەبۆوە بەستراون بە یەکەوە، بەردەوام دەکرێ لەم یەکیتیە دانەبراوەی نیوانیان دلنیا بین - یەکیتیەك کە بە شیوەیەکی ئاسایی لەیەك ئاسۆدا جیگە دەگرێ"[48].

هوسرل لە "سەرچاوەکانی ئەندازە"دا لەمە زیاتر ئاماژە بۆ زمان ناکات، بەلام ئاشکرایە کە ئامادەبوون لە جیهاندا و ئامادەبوونی مانا لە زماندا بەیەك شت دەزانێ. خالیك کە کەوتۆتە بەر رەخنەی ژاك دیریدا.

ئەزمونە زانستیەکان لە چ ریگەیەکەوە بەیان دەکرین و دەگویزرینەوە؟ لە ریگای زمانەوە، واتە لە ریی سیستەمیکی ئاماژەوە کە خۆی پەیوەستە بە ماوەی نیوان دال و مەدلولەوە. ماوەیەکی ئەبر کە بە وتەی دیریدا "بێ توانایی ئاماژە" دروست دەکات. ئەو ئوبژکتلیزمەی فەلسەفەی تازە کە هیوم بە "مەرجی سەرەکی گەیشتن بە دانانی" دادەنا، ئەو کاتەی لە چوارچیوەی ئاماژە زمانناسیەکاندا دەردەبرێ، جگە لە دەربرینی نمونەیەك یان ئارەزوویەك شتیکی زیاتر نیە. یاسا براوەو یەقینەکانی دنیای ئوبژیکت کە فەیلەسوفان لە دیکارت بەدواوە دلیان پێ خۆش بووە، هەرکاتیك بە زمان دەردەبرێ، جگە لە ماوەو "وەبونی مانا" هیچی دی نیە. ئەگەرچی هوسرل هیندە جەختی لەم خالە نەکردووە، بەلام دەکرێ بلیین کە ئەمەش یەکیك لە دەرئەنجامەکانی باسەکەی ئەوە لە بواری ژیانگادا بە تایبەتی کە هوسرل لە هەندیك شویندا ژیانگای بە "جیهانی کلتور" ناونابوو[49]. ئەم تیروانینەش لە تیروانینی هابرماسەوە بۆ ژیانگا نزیکە کە چەند ساڵ دوای هوسرل لە کتیبی "لۆژیکی زانستە کۆمەلایەتیەکان"دا (1982) کە تیایدا باسی "جیهانی کۆمەلایەتی- کلتوری دەوروبەرمان" وەك "ژیانگا کردووە"[50].

بەلام دەبێ گرنگترین بەکارهینانی "ژیانگا" لە پاش هوسرلەوە لەبەرهەمەکانی ئالفرید شوتزی

کۆمەڵناسـدا بدۆزرێنـەوە. شـوتزیش وەك هوسـرل "ژیانگـا" بـە دنیـای سـادەی ئەزموونـە پێـش زانستیەکان دەزانێ کـە لـە زانستی مۆدێرندا نکوڵی لێکراوەو لە جێی ئـەو دنیایەکی راستەوخۆ ئـەقڵنی واتە جیهانێك کە بە زانستی– ماتماتیکی دەردەبـڕێ، دانیشتووە. لـە جێی واقعیـەت، خـەیاڵ دانیشتووە. شۆتزیش قبوڵیدەکات کە زانسـت تەنها دەستکەوتی کلتورێکی تایبەتە کە رەگی لە ژیانگادا هەیەو رێبازی پەرستنی ئەم زانسـتەش رێگـە نـادات کـە ئـەم خاڵە واقعیو سادەیە، بناسرێت. قەیرانی زانستی ئـەورووپی یـان رۆژئـاوایی لـەوێدا ئاشـکرا دەبێـت کـە دەستکەوتەکانی زانست نەك ئاراستەی ژیانگا، بـەڵکو ئاراستەی یاسا بـڕاوەو ماتماتیکیـەکانی سروشـت بکـات. ئـەم قەیرانـە، مەعنەویە، چونکـە نکوڵی لـە لایەنە مرۆییو سـوبژێکتەکانی ژیانگا دەکـات. شۆتز دەریدەخات کـە هـەر لەبـەر ئـەم هۆیە کۆمەڵناسی، زانست نیە، مەگەر مانایەکی تازە بۆ زانست لەبەرچاو بگریـن. میتودەکـانی ئەزمونگەرانـە نیـە، مەگـەر تێگەیشـتنێکی دیاردەگەریانـە بـۆ ئـەزموون بێتـە ئـاراوە، واتـە تێگەیشتنێك کـە ئەگـەری ناسـینی "واقعیەتی چەند لایەنە" ئامادە بکات[51].

بە بڕوای شۆتز ئێمە لە جیهانی ژیـانی رۆژانـەدا، واتە لە ژیانگادا، رۆڵی جۆراوجۆر لە ئەستۆ دەگریـن. دنیاکـانی ژیـانی ئێمـە زۆرن، لـە جیـهانی خەیاڵـە شەخسیەکانەوە بیگرە تـا دنیـای خەونـەکان، دنیـای ئەزمونە هونەریەکان، دنیای تیۆرەکان و.. ئێمـە بـەم دنیایانە راهاتووین، (راهاتوین) بـە گۆڕینـی پێگـەمان لـەناویاندا، بـە گۆڕینـی رەنگـەکان، بـەڵام لـە ژیـانی مەرکەسێکدا رەنگە ساتێك بێتە پێشی کە چیدی ئەم چەند لایەنیە قبوڵ نەکات. ئەو ساتە گەر پـەیدا بـوو، پیشانمان دەدات کە ئێمـە تـا ئێسـتا "لـە قـەیران"دا ژیانمان بەسەر بردووە.

عـەقڵی زانسـتی بـەو شـێوەیەی کەوتۆتـە بـەر رەخنەی هوسرل و شۆتز، دەرئەنجامێکی ژیانگایە، و بە شێوەیەکی ئاسـایش هیـچ دژایەتیـەك لـەنێوانیاندا نیـە. دژایـەتیی ئـەو کاتـە دەردەکـەوێت کـە جیـهانی زانسـت، واتـە دنیـای ناسینی سروشت کـە بـە پێـی تێڕوانینـە زانسـتی– ماتماتیکیـە گالیلۆئاسـاکان داڕێـژراوە، بـە تاکـە ئامـانجی ژیـانی کۆمەلایـەتی دەناسرێ. ئا لێرەدایە کە نکوڵـی لـە دنیـای ئەزمونـە دیاریکراوەکـان واتـە لـە ژیانگا– کـە پەیوەسـتە بـە ئاسۆی زیـهنی مرۆڤـەوە– بـە پێـی بابـەتیبونێکی نمونـەیی، دەکرێـت. بـە مانایـەکی دی پـەیوەندی ئاسۆی زیهنی مرۆیی بە دنیای ئوبژێکتـەوە لەبـەرچاو ناگیرێت. هوسرل دەنوسـێ: "زانسـتی ئوبژێکتیـڤ پرسیارگەلێك ناپرسێت لەسەر زەمینەی ئـەم جیهانـە نەبێت، جیهانێك کە لە سەرەتاوە هەیەو ژیـانی پێش زانستیە. زانستی ئوبژێکتیڤ وەك هـەر شێوەیەکی پراکتیـك بوونـی ئـەو جیهانـە بـە پێشـگریمانە وەردەگرێ، بەڵام ئەو ئامانجەی لـە پێـش خۆیـدا دایدەنێ گۆڕینـی زانینـی پێش زانستیە. زانینێکـی، ناکامڵ کە دەبێ کامڵ بکرێ، چ لە نـاوەڕۆکیداو چ لـە بەردەوامیدا. بـەڵام بیرۆکـەی تەناسـوب (کـە بـەکاری دەهێنێ) بێ ئەندازە دورە لە جیهانێکـەوە کـە خۆی دیـاریکراوە، هـەروەها دورە لـەو راسـتیانەی کـە شیکردنەوەکانی هـەواڵ بـە دەستیەوە دەدەن. ئـەو راستیانەی کـە بـە شێوەیەکی نمونـەیی بە زانسـتی نـاودەبرێن.. راسـتیگەلێك لـە خۆیـدا[64]. زانسـت کۆمـەڵێ ئـەنگێزەی لـە ژیانگـادا هەیـە، هـەر بـەم مانایەش دەکرێ باسی ئەنگێزەی تەکنـەلۆژی بکـرێ. یەکێك لە لایەنـەکانی "قـەیرانی زانسـت" نـەگونجانی گەشـەکردنی تەکنەلۆژیـە لەگـەڵ پێویسـتیەکانی ژیانگـادا. لـە کتێبێکدا کە هوسرل نوسـی و پـاش مردنی بـە ناونیشـانی "ئـەزموون و دارەری: کۆمـەڵێ لێکۆڵینـەوە لـە بارەی جینالۆجیـای لۆژیك"ەوە لـە هـابورگ (*1948*) بڵاوکراوەیە، هوسرل باسـی ئـەم خاڵەی کـردووە. لـە پارچـەی دەهـەمی پێشـەکی کتێبەکـەدا ئامـاژەی بـۆ لایـەنی وێرانکـەری بـە نمونەییکردنی زانست لە دنیای ئـەزمون و ژیانگـادا، کردووە[55]. دەکـرێ بـەپێی باسـەکانی ئـەم پارچەیە باسی لایەنی وێرانکەری تەکنـەلۆژیا بکـرێ، بـەڵام چ لەم پارچەیەو چ لە کتێبی "قەیران"دا بە شێوەیەکی

راستەوخۆ، باسی ئەم لایەنە نەکراوە، دیارە هوسرل نەیدەویست لە تیۆری "بە نمونەییکردنی دنیای زانست"ەوە باسی دەرئەنجامە عەمەلیەکانی بکات. بەلام ئەم خاڵە لە خزمەتی تێزی سەرەکی "قەیران" و دوا یاداشتەکانی هوسرل واتە "پرۆژەی پێشەکیەکی تازە بۆ دیاردەگەری" دایە، بەلام بە شێوەیەکی شاراوە خاڵی تازەو گرنگ دەهێنێتە پێشێ کە لە وتوێژەکانی ئەمڕۆی فەلسەفەی زانستدا، گرنگی وەرگرتووە.

لە سەرەتای ئەم باسەدا لەسەر "ژیانگا"، نوسیم کە هوسرل لە رەخنەگرتندا لە "ماتماتیکیکردنی جیهان" دەیگوت کە زانستی مۆدێرن لەو دنیایەوە دەست پێدەکات کە خۆی دروستیکردووە، نەك لە دنیای واقعیەوە. درێژەی ئەم باسە رایکێشاین بۆ رێنمای کتێبەکەی هوسرل لە بارەی چەمکی دنیای واقعی و ژیانگاوە، ئێستا با سەرنج لە خاڵێکی بدەین کە هوسرلیش ئاماژەی بۆ کردووە "دنیایەك کە زانستی مۆدێرن دروستیکردوە". پێشکەوتنی زانستی مۆدێرن، بە تایبەتی لەو شوێنەدا کە دەرئەنجامە عەمەلی و پراکتیکیەکانی دێتە پێشی، گەیشتوە بە ئەزمونی بابەتە راستەوخۆ "تەرکیبی" یا "دروستکراوەکان" لە ژنتیك و بەشێوەیەکی گشتی لە لقەکانی بایەلۆجیادا دەکرێ ئەم خاڵە بە ئاسانی بسەلمێنرێ. ئەوەی بابەتی تاوتوێکردنی زانستیە ئەو پێکانەیە کە راستەوخۆ بە شێوەیەکی دروستکراو و بەپێی کۆمەڵێ پێش گریمانە، دروست بوون. دیارە ئەمە بە مانای ئەوە نیە زانستی ئەمڕۆ کاری بەسەر جیهانی دراوەکان و "دنیای سروشتیەوە" نیە. بەلام خاڵی گرنگ ئەوەیە کە ئەزموونی ئەم دنیایە چیدی بە بنەمای پێشکەوتنی زانستی نازمێرێت. ئەوەی لەم پێشکەوتنەدا خاڵی بنەڕەتیە، ئەزمونەکان و پاشان جیهانی گریمانەکان و ئەو تیورانەیە کە "لە بابەتی ئاوارتە دروستکراودا" دەچنە پێشێ. ئەمە لایەنێکی گرنگی ئاماژەکەی هوسرلە کە لە دامێنی ئەو باسەیە کە لە بارەی ژیانگاوە کردویتی و تا ئێستاش بە پێی پێویست ئاوڕی لێنەدراوەتەوە.

هوسرل لە کۆتایی ژیانیشیدا هەر درێژەی بە خەباتی سەرجەم تەمەنی خۆی بۆ زانست دا. هیچ ئەوەی نەشاردەوە کە ئەم خەباتەی بۆ پتەوکردنی بناغەکانی دیاردەگەری درێژە پێداوە. لێرەوە کارەکەی لە "قەیران"دا جیاوازیەکی سەرەکی لەگەڵ بەرهەمەکانی پێشودا نیە. من لەم فەسڵەدا کارم بەسەر ئەم ئامانجەی هوسرلەوە نەبوو. واتە باسی گرنگی "قەیران"م لە پەرەسەندنی تیورەی دیاردەگەریدا، نەکرد. ئەوەی لە باسی مۆدێرنەدا بۆ ئێمە جێی سەرنجە ئەو خاڵەیە کە بە بڕوای هوسرل قەیران لە تێڕوانینی ئێمەدا بۆ زانست خۆی حەشارداوە. کێشە عەمەل (تەکنیکی) کۆمەلایەتیەکان دەرئەنجامی لۆژیکی قەیرانن. هوسرل وەك کۆنایرە، کاسیرەر و چەند بیریارێکی رۆژگارەکەی، لە زانستەوە دەستی پێکرد. لە فەسڵی دواییدا باسی فەیلەسوفێك دەکەم کە لە جێگەیەکی دیەوە دەستی پێکردووە: لە چارەنوسی میتافیزیکی تەکنەلۆژیەوە.

### پەراوێزەکان:

1-P.Ricceur, A l'ecole de la phenomenologie, Paris, 1986, pp, 285- 295.

2-E.Husserl, La crise des sciences europeennes et la Phenomenologie transendantale. tra. G. Granel, Paris, 1989, pp. 371-372.

3-Ibid, p. 311.

4-Ibid, p. 17.

5-P. Ricoeur, A l'ecole de la phenomenogie, pp. 161-167.

6–تەماشای دەقی گفتوگۆی هربرت دریفوس بکەن لە:

B. Magee ed, The Great Philosophers, Oxford 1987, pp. 254- 260.

*وەرگێڕانی فارسی ئەم کتێبە لە:*

*ب. مگی. فلاسفه. بزرگ، اشنایی با فلسفه غرب، ترجمەی ع. فولادوند، تهران، 1372، ص ص 424–413.*

*7–احمدی، ب، ساختار و تاویل متن، تهران، 1370، ج2، ص ص 549– 544.*

8-E. Husserl, L'idee de la phenomenologie, tra. A. Lowit. Paris, 1993, pp. 51-66.

9-E. Levinas, Theorie de l'intuition dans la phenomenologie de Husserl. Paris. 1984, pp. 109-142.

10-T. Luckmann ed. Phenomenology and Sociology, London, 1978, p.6.

11-E. Husserl, Idees directrices pour une phenomenologia. tra. P.Ricoeur, Paris, 1985, pp. 97-99.

12-P. Trotignon, Le coeur de la raison, Husserl at la crise du monde moderne, Paris, 1986.

13-E, Husserl, La crise..., pp. 22-24.

14-Ibid, p. 486.

15—ئەم یادداشتەی فنینك لە وەرگێڕانی ئینگلیزی "قەیران"دا هاتووە.

E. Husserl., The Crisis of the European Sciences and Transcendental Phenomenology, tra. D. Carr, Evanston, 1970.

16-G. Granel, Le sens du temps et de la perception chez E. Husserl, Paris, 1968, pp. 196-218.

17-E. Hussrl, La crise..., p. 75.

18-Ibid, p. 563.

19-Ibid, p. 370.

20-Ibid, p.373.

21-Ibid, p. 374.

22-Ibid, p. 481.

23-Ibid, p. 546.

24-Ibid, p. 298.

25-Ibid, p. 301.

ئەم پارچە لە دەقی ئەلمانی "و وەرگێڕانی فەرەنسیدا" لەگەڵ پارچەی 73دا هاتووە بەڵام لە وەرگێڕانە ئینگلیزیەکەی "قەیران"دا وەك پاشکۆ هاتووە (لا 341—335) بۆ ڕونکردنەوەی زمانی هیگڵی ئەم پارچەیە، تەماشای پێشەکی وەرگێڕی ئینگلیزی بکە.

26-Ibid, p. 403.

27-Ibid, p. 404.

28-Ibid, p. 10.

29-P. Ricoeur, A l'ecole de la phenomenogie, p. 78.

30-E, Husserl, Idees dirctices..., pp. 91-93.

31-Ibid, pp. 202- 204.

32-Galilee, L'essayeur. tra C. Chauvire, Paris, 1980.

33—ج. برنشتاین، اینشـتاین، ترجمەی ا. بیرشك، تهران 1361، ص 124.

34-A. Koyre, From the Closed World to the Infinit Universe, John Hopkins Univerity Press, 1957.

35—ا. ا. برت، مبادی ما بعد الطبیعی علیوم نوین، ترجمەی ع. سروش، تهران 1369، ص 61.

36-G. WL eibnig, Nouveaux essais sur l'entendement humain, Paris, 1966. pp. 350- 377.

37—افلاطون، دوره آثار، ترجمەی م. ح. لطفی، تهران 1367، قطعەهای 36—35، ص 1886 و نیز قطعەهای 38—37 ص 1847.

38—هـ. س. پ. ص 1145.

39—هـ. س پ. ص 1157.

40—ارسطو، متافیزیك، ترجمەی ش. خراسانی، تهران، 1366، ص 422.

41—هـ. س. پ: 458— 457.

42-T. Luckman ed, phenomenology and Sociology, p. 11.

43-H. G. Gadamer, Truth and Method, London, 1979, p. 311.

44-P. Trotignon, La coeur de la raison, p. 247.

45-E. Husserl, La crise...., pp. 27- 28.

46-R. Descartes, Oeuvres et lettres, ed A. Bridoux Paris, 1970, pp. 995- 1000.

47-E. Husserl, La crise..., pp. 91-94.

48-Ibid, pp. 408- 409.

49-Ibid, p. 213.

50-J. Habermas, Logique des sciences sociales et autres essais, tra R. Rochitz, Paris, 1987, p. 131. pp. 142-145.

51-A. Schutz, T. Luckmann, The Structures of the Life - World, Northwestern U. F, 1973

هەروەها تەماشای وتارەکەی وشـوتز "On Multiple Realities" بکە لە:

A. Schutz, Collected Papers, vol. 1, The Hague, 1962, pp. 207- 259.

52-E. Husserl. La crise..., pp. 144-145.

53-Ibid, p. 149.

54-Ibid, p. 126.

55-E. Husserl, Experience and Judgment, tra J. S. Churchill, K, Amerkis, London, 1973. pp. 41- 46.

**تێبینی:**

ئەمە وەرگێڕانی فەسڵی دوەمی کتێبی "مدرنیتە و اندیشەو انتقادی)ی کە لە نوسینی بابەکی ئەحمەدیە.

# شەقڵی نووسینەوە چیە؟

■ ڕۆلان بارت

● و. لە فارسییەوە: عەبدولخالق یەعقوبی

ئێمە دەزانین کە زمان پەیکەرەیەکە پێکهاتووە لە چەندین یاساو ڕێساو خووخدەی هاوبەش لە نێوان سەرلەبەری نووسەرانی سەردەمێك. واتە ئەوەی زمان چەشنی جۆرە (زات و) سروشتێك بەنێو وتەکانی نووسەردا تێدەپەڕێ، بەبێ ئەوەی هیچ (ڕواڵەت و) ڕوخسارێکی پێببەخشێ یا پاراوی بکا:

زمان وەك بازنەیەکی بەدیهاتوو لە هەندێك هەقیقەتە کە لە دەرەوەی (ئەو بازنەیەدا) تەنیا قورسایی (چڕکالش) ئاخاوتنێکی تاکە کەسییخەریکی دامەزراندنی خۆی دەبێ. زمان، کەم و زۆر، وەك ئاسمان، کە زەوی لە ئامێزی خۆی دەگرێ، سەرلەبەری دامێنانی ئەدەبیی دەگرێتە خۆیو لەو ئاستەی ئەوان دەگەن بەیەك هێلانەیەکی ئاسیاو بۆ مرۆڤ پێکدێ. زمان زێتر لەوەی پاشەکەوتێ بێ لە هەندێ دەسمایە جۆرە ئاسۆیەکە: واتە هاوکات هەم سنورە، هەمیش ڕوانگە، کورت و کرماتجی مەیدانێکی دڵنیاکەرە لە پانتاییەکی ڕێك و پێك. نووسەر بە واتای ڕاستی خۆی شتێك (لەو مەیدانە) ناهێنێتە



ڕۆلان بارت

دەرێ: بۆ نووسەر زمان زێتر سنورێکە کە بەزاندنی ئەو سنوورە رەنگینێ ئەوپەڕی سروشتی زمان بێکبێنێ: زمان قەڵەمڕەوی هەڵسوکەوتێك و پێناسەو چاوەڕوانیی ئیمکانێکە. زمان جێگەو پێگەی ئەرکی کۆمەڵایەتی نیە، بەڵکو تەنیا هەر رەنگدانەوەیەکی ناهەڵبژاردەیی‌و میراتێکی دابەشنەکراوی مرۆڤەکانە نەك نووسەرەکان. زمان لە دەرەوەی (بازنەی) ئایینی ئەدەبیی دەمێنێتەوە، زمان بەهۆی ناساندن، نەك هەڵبژاردن، ئۆبژەیەکی کۆمەڵایەتییە. کەس ناتوانێ لافی ئەوە لێبدا کە بەبێ داب و دەستوورێکی تایبەت ئازادیی نووسەر بوونی خۆی لەناو نێوبژێکەری خۆڕاگری زماندا بگونجێنێ. چونکی سەرومڕی مێژوو لە رێگای کاملبوون و یەکپارچەییەکی هاوچەشنی سروشت لە پشت زمانەوە راوەستاوە. هەروەها زمان بۆ نووسەر تەنیا ئاسۆیەکی ئینسانییە کە لە دوورەوە ئاشنایەتییەکی مەنفی پێکدێنێ. ئەگەر بێین و بڵێین کامو و کۆنێنۆ بەزمانێکی وەکوو یەك قسە دەکەن وەکوو ئەوەیە وای دابنێین کە دەتوانین لە رێگای چەشنێك هارکێشەی دیفرانسییەلەوە شیمانەی (احتمال) سەرلەبەری زمانە کەونارایی یان داماتووییەکان، کە ئەوان بەکاری ناهێنن، حسێب کەین: زمانی نووسەر، کە لە نێوان شێوە بەسەرچوو و شێوە نەناسراوەکاندا ئاوێزانە، زێتر لەوەی بە قووڵاییەك بێتە ئەژمار ئاستێکی نیهاییە، جێگەو پێگەی هەندەسیی سەرپاکی ئەو شتانەیە کە نووسەر نەیدەتوانی بەبێ لە کیس دانی مانای خۆڕاگری سلوك و بزاڤی بنەڕەتی خۆی وەك بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی دەریانبڕێ، وەك ئۆرفێ[1] کە ئاوڕی داوەو چاوی لە پشت سەری خۆی کرد.

کەوایە زمان لەم دیوی ئەدەبەوەیە. شێواز، کەم و زۆر، لە ژوور ئەدەبەوەیە: وێنەکان، لەحنی دەربڕین و وشەکان لەزات و رابردووی نووسەرەوە پێکدێن و بەرەبەرە دەگۆڕێن و دەبنە هەڵسوکەوتە خۆکردەکانی هونەرەکەی. بەمجۆرە زمانێکی سەربەخۆ لەژێر سەردێڕی شێواز دەق دەگرێ کە تەنیا لە ئۆستوورەناسی تاکەکەسیی‌و شاراوەی نووسەرو ئەو پێش بوونەی گوتارەوە (پێش هستی گفتار) سەرهەڵدەدا، ئەو شوێنەی کە یەکەمین جووتگەلی واژەو شتەکان دەق دەگرن و سەرلەبەری دەروونمایە زمانپییەکانی بوونی ئەو بەجارێك و بۆ هەمیشە خۆدەگرن و بنج دادەکوتن. شێواز، هەرچەندەش نەرم و نیانیی تیابێ، دیسان بەردەوام شتێکی رەق و تەقی هەر هەیە. شێواز فۆرمێکە بەبێ ئامانجێکی دەستنیشانکراو و بەرهەمی دوورخستنەوەیەکی بەزۆرە نەك بە ئیختیار، زمان چەشنی لایەنی ئەستوونیی‌و تاکی بیرکردنەوەیە. ئەو شوێنانەی زمان بۆیان دەگەڕێتەوە لە رادەی ژیانناسیدا نە تێپەڕیون و نە مێژوون: شێواز "شتی" نووسەر، گلەیی، بەندیخانەو تەنیایی ئەون. شێواز رەوتێکی داخراوی تاکەکەسییە، روون و بێ سرنجە لە هەمبەر کۆمەڵدا کە بە هیچ کلۆجێك حاسڵی هەڵبژاردن یان پشکنینێك لە ئەدەبدا نیە، بەڵکو بەشێکی تاکەکەسیی لە داب و نەریتی ئاینێکە کە لە قووڵایی ئۆستوورەییەکانی نووسەرەوە سەرهەڵدەداو لە دەرەوەی سنوورەکانی ئیختیاری خۆیەتی. شێواز دەنگی جوانکاریی شتێکی شاراوە و سەیرو سەمەرەیەو وەك پێداویستییەك دەجووڵێتەوە، وەك بڵێی شێواز لەم هەڵدانە گیا ئاسایانەدا شتێك نیە جگە لە مەسخێکی پووچەڵ و لاسارانەو بەشێکە لە (توێژی) ژێرەوەی زمان، ئەو بەشەی کە بە سنوری نێوان شتەکان و جیهانی دەرەوە لە قەڵەم دەدرێ. شێواز بە راستی و دروستی دیاردەیەکی چەشنی رووانی گیاو بازدانێکی میراتیی (جۆرە گەوهەرو سروشتێکە. هەروەها ئاماژە (و چەمکە لاوەکیەکانی)

شێواز بەرەو قووڵاییەکەی ڕۆچوون، گوتار بنەمایەکی ئاسۆیی هەیە، ڕاز و نهێنییەکانی لەسەر هەمان مێڵن کە وازەکانی لەسەرن و ئەو شتەی دەیشارێتەوە لە درێژایی زنجیرەکەیدا ئاشکرا دەبێ. لە گوتاردا، هەموو شتێك لە بەرامبەر ئێمەدایەو ئامادەیە بۆ کەڵك لێوەرگرتنی ڕاستەوخۆی ئێمە و وازەکان، بێدەنگی و بزاڤیان بەرەو مانایەکی وێڵکراو بە پەلە دەڕۆن: گوتار کەرەسەیەکی لێخوڕینە ڕاست دەڕواو سەری وەخت دەگا. بەڵام شێواز، بە پێچەوانە، تەنیا لایەنێکی ئەستوونیی هەیە کە دەچێتە نێو بیرەوەری تاکەکەسیی مرۆڤ و لە ڕێگای هەندێ ئەزموونی مادی دەگا بە پێچەڵاو پلووچی. شێواز هیچ کات شتێك نیە جگە لە خوازە، واتە هاوئاهەنگییەکە لە نێوان مەبەستی ئەدەبیی و بنەمای زاتیی نووسەر (دەبێ وەبیرتان بێنینەوە کە بنەما نیشتنی بەردەوامبوونە). هەروەها شێواز هەمیشە یەك ڕازە، بەڵام لایەنی شاراوەی کارکردەکانی لە سروشتی بەبزاوت و هەمووکات تێپەڕیی زمانەوە سەرچاوە ناگرێ. ڕازی شێواز بیرەوەرییەکی شاراوەیە لە زاتی نووسەردا. چاکەی ئاماژە ئاسابوونی شێواز دیاردەیەك نیە بۆ وەدەسهێنانی خێرایی (سرعت)– بە پێچەوانەی گوتار کە نەگوتراوەکان لەودا وەك بۆشایی زمان دەمێننەوە– بەڵکو دیاردەیەکە کە پێوەندیی بە قورساییەوە هەیە، چونکی ئەو شتەی لەژێر سەردێڕی شێوازدا قایم و قووڵ دەمێنێتەوەو لە ڕەق و تەقیی یان نەرم و نیانیی وێنەکانیدا کۆدەبێتەوە، پاژگەلێکە لە ڕاستەقینەیەکی یەکسەر نامۆ لەگەڵ زمان: مۆجزەی ئەم بازدانە میراتییە چەشنێك کردەی ئەوپەڕی ئەدەبیی پێکدێنێ کە مرۆڤ دەگەیەنێتە بەر دەروازەی دەسەڵاتی جادووگەریی. شێواز، بەهۆی شوێنەزای خۆی، لە دەرەوەی هونەرە، واتە لە دەرەوەی ئەو بوونانەیە کە نووسەر بە کۆمەڵەوە دەلکێنن. کەوایە، دەکرێ نووسەران بە کەسانێك بزانین کە لە چاو تەنیایی شێواز هێمنایەتی هونەر بە باشتر دەزانن.

ژێد نموونەیەکە لەو نووسەرە بێ شێوازانە کە شێوە ڕووبەڕووبوونەوە جوانکارییانەکەی، چێژی مۆدێرن لە (هەناوی) هەندێ شێوەی کلاسیك دێنێتە دەرێ. ڕێك وەك چۆن "سێن سانێن" لە "باخ" و "پۆلێن" لە "شوبێرت" ئیلهامی وەردەگرت. لە بەرامبەریدا، شیعری مۆدێرن، بۆ وێنە شیعری هۆگۆ، ڕمبۆ یان شار پاراوە لە شێوازو تەنیا بە هۆی چاکەی بەنیازی شیعر بوون، بە هونەر لە قەڵەم دەدرێ. ئەم دەس ئاواڵەییەی شێواز، واتە پێوەندیی سەرتاپا سەرپەستی نێوان زمان و هاوزادی زاتییەکەیەتی کە نووسەر چەشنی (جۆرە) کورت و تازەییەکی ئەوەرتر لە مێژوو دەنوێنێ.

کەوایە ئاسۆیی بوونی زمان و ئەستوونیی بوونی شێواز تایبەتمەندیگەلێکی سروشتیی بۆ نووسەر دێننە ئاراوە، چونکی نووسەر هیچ کامیان بەتەنیایی هەڵنابژێرێ. زمان کارکردێکی مەنفی هەیەو سنووری سەرەتایی ئیمکانە. شێواز پێداویستیەکە کە مەل و مەرجی نووسەر بە زمانەکەیەوە دەلکێنێ. نووسەر لە زماندا هەست بە ئاشنایەتی مێژوو و لە شێوازدا هەست بە ئاشنایەتی ڕابردووی خۆی دەکا. نووسەر لە هەردوو باردا ڕووی لەیەك جۆر سروشتە، واتە ڕووی لە کۆمەڵێ شتی ئاشنایە پێکهاتوو لە هەندێ شێوە کە هێزو توانایان تەنیا لە چەشنی هێزێکی کارتێکەرە و لە شوێنێك بۆ حسێب کردنی چەندایەتیی و لە شوێنێکی تر بۆ گۆڕینی بارودۆخی

چۆنێتیی بەکاردەچێ، بەلام هیچ کات بە کەلکی داوەریی یان دەلالەت کردن بە هەڵبژاردنێك نایا.

کەوایە هەر فۆرمێك لە هەمان کاتدا (خۆی جۆرە) بەهایەکە. بەم هۆیە، لە نێوان زمان و شێوازدا شوێنێك بۆ راستەقینەیەکی فۆرمیی تر لە گۆڕێدایە، شەقڵی نووسینەوە. لەهەر فۆرمێکی ئەدەبیی‌دا ئەو شتەی (وەك کێشەیەك) لە ئارادایە هەڵبژاردنی جۆرە لەحن و جۆرە شێوەیەکە و راست لێرەدایە کە نووسەر (تایبەتمەندی) تاکەکەسێتی وەدەس دێنێ، چونکی ئالێرەدایە کە خۆی نیشاندەدا. کێشەی زمان و شێواز لە زۆر گشت پێچەڵاوپلووچییەکانی زماندایە. زمان و شێواز دەسکەوتی سروشتیی زەمانەو تاکە کەس چەشنی بوونەوەرێکی ژین ناسانەیە. بەلام رەچەڵەکی (هویت) فۆرمیی نووسەر تەنیا لە دەرەوەی رەوتی فۆرمە زمانیی و یاسا خۆڕاگرەکانی شێوازدایە کە بە راستی بنج دادەکوتن، ئەو شوێنەی کە زنجیرە نووسراوەکە سەرەتا لە سروشتێکی زمانناسیانەی تەواو بەستەزمانانەدا دەگونجێ و لە ئاکامدا دەبێتە نیشانەیەکی گشتیی و هەڵبژاردنی کردەوەی ئینسانیی‌و سەلمێنراوی باش. ئەم زنجیرە نووسراوەیە، نووسەر تووشی بارودۆخێکی هەست بزوێن یان خەمهێنەر دەکاو فۆرمی سروشتیی و هەروەتر تاقانەی گوتاری خۆی تێکەڵ بە مێژوویەکی بەربلاوی دیکە دەکا[2]. زمان و شێواز هێزێکی کوێرەوە بوون، شەقڵی نووسینەوە کردەیەکە پێوەندیی بە مێژووەوە هەیە. زمان و شێواز ئۆبژەن، بەلام شەقڵی نووسینەوە کارکردو بۆنەیەکە لە نێوان داهێنان و کۆمەڵدا. شەقڵی نووسینەوە زمانێکی ئەدەبییە کە بەهۆی ئامانجی کۆمەلایەتیی خۆی ئاڵ و گۆڕی بەسەردا هاتووە. شەقڵی نووسینەوە فۆرمێکە کە بۆ خزمەتکردن بە ئامانجی ئینسانی بەکاردەچێ و هەر بۆیە پێوەندیی بە قەیرانە گەورەکانی مێژووەوە هەیە. بۆ نموونە مێریمێ (*Merimee*) و فێنێلۆن (*Fenelon*)[3] لە روانگەی دیاردەکانی زمانناسی و جۆری شێواز لە یەکدی جیادەبنەوە، بەلام سەرەڕای ئەمانە لە زمانێك کەلك وەردەگرن کە مەبەستێکی لێکچووی هەیە، روانگەیەکی لێکچوویان لە بارەی فۆرم و دەروونمایەدا هەیە، رێکوپێکییەکی قەراردادیی هاوچەشن قبووڵ دەکەن و هەروەها شێوەگەلی فەنیی لێکچوو بەکاردێنن. ئەوان سەرەڕای ئەوەی کە سەدەیەك و نیویان بەین بوو، بە شێوەیەکی لێکچوو لە ئامرازێکی کەم و زۆر لێکچوو لەباری بارودۆخ و (چۆنێتی) بەکارهێنان کەلك وەردەگرن: بە کورتی دەکرێ بڵێین هەردووکیان یەك جۆر شەقڵی نووسینەوەیان هەیە. بە پێچەوانە، مریەمێ و لۆترێ ئامۆن، مالارمێ و سێلین، ژیدو کۆنێنۆ، کلۆدێل و کامو کە لە یەك قۆناغی مێژووی زمانی ئێمەدا قسەیان کردووە (و شتیان نووسیوە)، شەقڵی نووسینەوەی زۆر جیاواز لە یەکیان هەیە. هەموو شتێك ئەوان لە یەك جیادەکاتەوە: لەحن، شێوەی دەربڕین، ئامانج، ئەسلگەلی ئەخلاقیی، سروشتیی بوونی (زمانی) دەبڕین، بەمجۆرە، ئەوانە کە لە یەك زەماندا دەژین و بەیەك زمان دەدوێن، لە گۆشەنیگای شەقڵی نووسینەوەوە زۆر لێك جیاوازن و هەر بەهۆی ئەم جیاوازییانەوە بە تەواویی لەیەك جیادەبنەوە.

ئەم شەقڵی نووسینەوانە ئەوەی راستی بێ پێکەوە جیاوازن، بەلام دەشکرێ لەگەڵ یەك

بەراوردیان کەین (و هەڵیانسەنگێنین)، چونکی بەرهەمی پرۆسەیەکی لێکچوون، واتە گەڕانی نووسەر بەدوای کەڵك وەرگرتنێکی کۆمەڵایەتی لە فۆرمی خۆی و هەڵبژاردنی ئەو فۆرمەدا. شەقڵی نووسینەوە، کە لە ناوەندی دژوارییەکانی ئەدەبدایەو بەدیهێنەری ئەو دژوارییانەیە، لە بنەڕەتدا، ئەخلاقی فۆرم و هەڵبژاردنی پانتاییەکی کۆمەڵایەتییە کە نووسەر لەوەها پانتاییەکدا بڕیار دەدا سروشتی زمانی خۆی دامەزرێنێ. بەڵام ئەم پانتاییە کۆمەڵایەتییە بە هیچ کلۆجێك هەر بە بەکارهێنەرانی (بەرهەمەکانی) ئەو نابەسترێتەوە. نووسەر ناتوانێ گروپێکی کۆمەڵایەتی گوڵبژێر بکاو (هەر) بۆ ئەو گرووپە بنووسێ: نووسەر باش دەزانێ مەگین ئەو جارانەی کە هەڵدەکەوێ شۆڕشێك رووبدا، دەنا زێتر لە هەمان گروپی کۆمەڵایەتی خۆی وەرگرێکی تری نیە. هەڵبژاردنی نووسەر لەسەر بناغەی خودئاگایی دامەزراوە، نەك کەڵك وەرگرتن (و بەرژەوەندی). شەقڵی نووسینەوەی نووسەر جۆرێك بیرکردنەوەیە لە ئەدەب نەك بەرفراوانکردنی سنورەکانی (ئەدەب). یان بە وتەیەکی پڕ بە پێستر، نووسەر ناتوانێ ئەو هۆکارە لەبەرچاوانەی کە بەسەر بەکارهێنانی ئەدەبدا زاڵن بگۆڕێ (ئەم هۆکارە سەرتاپا مێژووییانە لە دەرەوەی دەسەڵاتی نووسەردان، تەنانەت ئەگەر بەوردیش تێیانبگا) و هەر بۆیە بەشێوەیەکی خۆخوازانە، نیاز (و پێداویستیی) بە زمانێکی سەربەخۆ لە دەلاقەی سەرچاوەکانی ئەم زمانەوە دەبینێ نەك (لە دەلاقەی) لایەنگەلی بەکارهێنانییەوە. بەمجۆرە، نووسینەوە خۆی راستەقینەیەکی تەماوییە: لە لایەکەوە بە دڵنیاییەوە (دەکرێ بڵێین) لە رووبەڕووبوونەوەی نووسەر و کۆمەڵگاکەیەوە سەرهەڵدەدا، لە لایەکی ترەوە، ئەم ئامانجە کۆمەڵایەتییە بە شێوەیەکی داخهێنەر تاکوو شوێنەزا ئامرازییەکانی داهێنان پاشەکشە بە نووسەر دەکا. مێژوو، کە لە ئامادەکردنی نووسەر بەزمانێکەوە کە بە سەربەستی بەکاریبێ نۆش داماوە، خواستی زمانێك کە بە سەربەستی پێکهاتووە لەبەردەست نووسەردا دەنێ.

بەمجۆرە، هەڵبژاردن و پاشان بەرپرسایەتی "شەقڵی نووسینەوە" چەشنێك ئازادیی بەدی دێنێ، بەڵام ئەم ئازادییە، بەپێی ساتە جیاجیاکانی مێژوو، سنوری جۆراوجۆری هەیە. ئەم هەلە بۆ نووسەر نەرەخساوە کە (بێت) و شەقڵی نووسینەوەی خۆی لە نێوان جۆرە عەمبارێکی چەکی هەمیشەیی فۆرمە ئەدەبییەکاندا گوڵبژێر بکا. ئەو شەقڵی نووسینەوانەی کە دەگونجێ نووسەرێك هەیبێ لە ژێر گوشاری مێژوو و سوننەتدا دەق دەگرن: مێژووی نووسینەوە بوونی هەیە. بەڵام ئەم مێژووە تووشی دووفاقێتییەك بووە: راست لەوکاتەدا کە مێژووی گشتی، دژواریی نوێی زمانی ئەدەبی پێشکەش دەکا یان دایدەسەپێنێ، شەقڵی نووسینەوە هەروا سەرریێژ لە بیرەوەری بەکاربردنەکانی پێشووی خۆیەتی، چونکی زمان هیچ کات بەستەزمان نیە: وشەکان مێشکێکی دووهەمیشیان هەیە کە بە چەشنێکی رەمزاوی لەنێو دەلالەتە نوێیەکاندا رێگای خۆیان دەگرنەبەر. شەقڵی نووسینەوە رێك هەر ئەم ئاشتییەی نێوان ئازادی و بیرەوەرییەو خودی ئەم ئازادییەش خاوەنی مێشك (و بیرەوەرییە) و تەنیا لە کردەی هەڵبژاردندا، ئازاد لە قەڵەم دەدرێ نەك لە رەوتی درێژەپێدانی خۆیدا. بێ

شک من ئێمڕۆ دەتوانم ئەم یان ئەو شەقڵی نووسینەوەیە هەڵبژێرم و بەم کارە لەسەر ئازادیی خۆم پێدابگرم و لافی نوێخوازی یان سوونەت گەرایی لێبدەم. بەڵام مومکین نیە شەقڵی نووسینەوە بۆ ماوەیەکی زۆر، درێژە بدەم بەبێ ئەوەی بەرە بەرە ببمە بەندیی وشەکانی کەسێکی تر یان تەنانەت (وشەکانی) خۆم. بۆچوونێکی زەینیی لاسار، کە لە گشت شەقڵی پێشووی نووسینەوە و تەنانەت لە رابردووی نووسینەوەی خودی من سەرهەڵدەدا، بەسەر دەنگی ئێستای وشەکانمدا زاڵ دەبێ. هەر ئێرێکی نووسراوە چەشنی توخمەیەکی کیمیاییە کە سەرەتا روون و بێ لایەنەو پاش ماوەیەک سەرلەبەری رابردوویەک، چەشنی زەڕەی ئاوێزان تێیدا، بەدی دێ و ئەم زەڕانە سات لەگەڵ سات زێتر بلووریی دەبن و قورساییەکی پتریان دەبێ. شەقڵی نووسینەوەش، وەکو ئازادی تەنیا یەک چرکەساتە، بەڵام یەک لە روونترین چرکە ساتەکانی مێژووە، چونکی مێژوو، هەمووکات و بەر لە هەموو شتێك، هەڵبژاردن و سنوورەکانی ئەم هەڵبژاردنەیە، چونکی شەقڵی نووسینەوە لە بزاڤی واتاداری نووسەرەوە سەرهەڵدەدا، بزاڤێك کە زێتر لە پاژە برگەییەکانی تری ئەدەب تاکوو توێژە قووڵەکانی مێژوو دەچێتە پێش[4]. یەکپارچەیی و هاوچەشنێتیی نووسینەوەی کلاسیك چەندین سەدە دەوامی هێنا. (رەوتی) فرەچەشنی شەقڵی نووسینەوەکانی مۆدێرن لەم سەد ساڵەی دواییدا توندوتیژ بوو بوو کێشەسازترین بابەتی ئەدەب. ئەم لێك جیابوونەوە و لێك هەڵوەشاندنەوەی شەقڵی نووسینەوەیە لە ئەدەبی فەرەنسەدا، ئەوەی راستی بێ، پێوەندیی بە قەیرانێکی بەربڵاو لە مێژووی گشتیی‌دا هەیەو بە چەشنێکی سەرسووڕهێنەر لە مێژووی ئەدەبدا رەنگدەداتەوە. ئەو شتەی "ئەندێشە"ی بالزاك لە فلۆبێر جیادەکاتەوە، جیاوازیی (جۆری) قوتابخانەیە (مکتب). ئەو شتەی شەقڵی نووسینەوەکانیان لە بەرامبەر یەکدی دەدانێ کەلەبەرێکی بنەڕەتییە لەم مەسەلەیەدا کە بنەمایەکی ئابووریی نوێ رووبەڕووی بنەمایەکی ئابووەری کۆن دەبێتەوە و لە ئاکامدا گۆڕانکاریگەلێکی گرینگ لە زەینیەت و ئاسیندا دێتە گۆڕێ.

*سپتامبری 2000*

*خەرمانان 1379*

## *پەراوێزی وەرگێڕ:*

*1- Orphee (یائۆرفێئۆس): لە ئۆستوورەکانی یۆنانی کەوناراداکوڕی ئاتراس و گەورەترین مۆسیقازانی کەونارا بوو. ئاهەنگەکانی ئەوەندە دڵگیر بوون کە ئاژەڵی درەندەش بەلایەوە گوێیان شل دەکرد. رۆژی زەماوەندی لەگەڵ ئوریدیس، مارێك بە خێزانیەوەی داو ئۆرفێ چوو بۆ جەهەننەم و بە ئاهەنگە خۆشەکانی خۆی داوای لە شەیتانەکان کرد ژنەکەی بۆ بگەڕێننەوە. ئەوان قبوڵیان کرد بەو مەرجەی بەر لە چوونە دەرێ لە دەروازەی دۆزەخ ئاوڕ نەداتەوەو چاو لە پشت سەری نەکا. ئۆرفێ ئەم شەرتەی بەجێ نەهێناو بەدەس شەیتانان کوژرا.*

*2- autrui، چەمکی "دیکە" کە بە تایبەت لە فەلسەفەی سەدەی بیستەمدا باسی زۆر لێدەکرێ، لەسەر بناغەی بە رەسمیی ناسینی تاکەکەسێکی دیکە کە خاوەن تایبەتمەندیگەلێکی فیکریی یان مێژوویی جیاواز لەگەڵ خۆیەتی دامەزراوە. سارتر لە "ئەدەب چیە"دا و*

ئیمانوئێل لویناس لە کتێبی La Liberte difficile (ئازادی دژوار) لەسەر ئەم چەمکە دواوە. بارت خالی لە "ئۆستوورە، ئیمڕۆ" و "رەخنە و راستیی"دا تایبەتمەندی وردە بۆرژوازی مەیل بۆ گۆڕینی ئەوی دیکە بەخۆی دەزانێ. و- ف

3-Merimee (1803 -1870)، رۆماننووسی فەرەنسەیی.

Fenelon (1651 -1715)، نووسەری فەرەنسەیی.

4-بارت لێرەدا خوازەیەک لە زانستی ژین ناسی و زەوی ناسی دەهێنێتەوە. پاژی پانایی و درێژایی و بڕگەیی لەم دوو زانستەدا بۆ فێرکاری بەکاردەچن، بۆ نموونە پاژێکی بڕگەیی گۆی زەوی بریتیە لەم توێژانە: (پوستە، جبە، هستە). و-ف

### ژێدەر:

درجه صفر نوشتار، رولان بارت، ترجمه شیرین دخت دقیقیان، انتشارات هرمس، تهران 1378، ص ص 35 -43

● وەک دەزانین لە سەردەمی ئاغاواتدا شەقڵ بەو مۆرکە گەورەیە دەگوترا کە تایبەت بوو بە ئاغا. دەهاتن خەڵە و خەرمانیان بەم شەقڵە مۆرک دەکرد تا ئەگەر هات و رەعیەت دەست درێژی بۆ سەر کرد شەقڵەکەی بشکێ و دزییەکە ئاشکرابێ. کورد دەڵێ شەقڵی خۆی پێوە دیارە، واتە شتێکە تایبەت بەخۆیەتی. وێدەچێ "شەقڵ" هەڵگری ئەو بارە مانایەی "ئۆسلوب" (mode) بێ.

### ئاماژەی وەرگێڕ:

لە سەردەمی ژمارە (9)دا وتارێکی ژان پۆل سارتر-مان پێشکەش کرد کە لە کێشەی بەرپرسایەتی نووسەر دەدوا. پاش ئەم بۆچوونانەو بەتایبەت کتێبی "ئەدەب چیە"ی سارتر، رۆلان بارت کتێبی "دەرەجەی سفری نووسینەوە"ی بڵاوکردەوە کە هەرچەند نەک راستەوخۆ، بەڵام کەم تا کورتێک وەڵامی بۆچوونەکانی سارتری دەداوە لەمەڕ هەمان کێشە، واتە بەرپرسایەتی نووسەر. وەرگێڕانی ئەم وتارەی ئێستا پێشکەشی خوێنەری وردبینی دەکەم پاژی یەکەمی ئەم کتێبەی بارتە.

### فەرهەنگۆک:

| کوردی | فارسی | ئینگلیزی |
|---|---|---|
| نووسینەوە | نوشتار | Mode of writing |
| شێواز | سبک | Style |
| شەقڵ* | اسلوب | Mode |
| فۆرم | فرم | Form |
| دژواریی | دشوارطی | Problematic |
| بازدانی میراتیی | جهش وراثتی | Transmutation |
| شێوەی دەربڕین | شیوه بیان | Delivery |

# سەرکوتکردن/ سیستەم، ئارەزوو/ هونەر

■ نووسینی: ئەدۆنیس

● و. لە عەرەبییەوە: بڕوا عەلادین

-1-

فەیلەسوفێکی لاوی فەرەنسی کە لە دوای (مایۆی 1968)ەوە دەرکەوتووە، پێی وایە پەیوەندی نێوان هونەرو کۆمەڵگە سێ شێوەیە:

یەکەمیان: لەو پەیوەندیەدا دەردەکەوێ کە کۆمەڵگەیەك یا سیستمێکی سیاسی دەیسەپێنێ و رێگە لە هەر دەرکەوتنێك (یا پراکتیککردنێکی) ئارەزوو دەگرێ، لەم حاڵەتەشدا هونەر لەناودەچێت، بەڵام هەر پێویست دەبێت.

دووەمیان، لەو پەیوەندیەدا دەردەکەوێ کە کۆمەڵگەیەك یا سیستەمێك دەیسەپێنێ کە ترس لە پراکتیککردنی ئارەزوو بەسەریا زاڵە بۆیە بەشێوەیەکی سیاسی- دەزگایی قەدەغەکان رێکدەخات. دیسان لەم حاڵەتەشدا هونەر پێویستە. (هونەر هەمیشە پێویستە- هونەر پێویستیە).

بەڵام شێوەی سێیەمیان لەو پەیوەندیەدا دەردەکەوێ کە کۆمەڵگەیەك یا سیستەمێك دەیسەپێنێ کە ئارەزووەکانی ئاشکرا دەکات و پراکتیکی دەکات. ئەمەش حاڵەتێکی ئاوارتەیە (استثنائي): لەم حاڵەتەدا هونەر گەشە دەکات و دەبێتە بەشێك لە ژیانی رۆژانە، وەك ئەوەی لە ئۆکتۆبەری 1917 (شۆڕشی یەکەمی سۆشیالیزم)و ئەوەی لە مایۆی 1968 (شۆڕشی قوتابیانی فەرەنسی)دا روویاندا، سەرەڕای جیاوازی نێوان دوو شۆڕشەکە. بەڵام پێویستە ئەم حاڵەتە ئاوارتەیە بگۆڕێت و ببێتە بنەما.



ئەدۆنیس

-2-

ئەگەر پشتمان بەم رایە بەست (کە تا رادەیەکی زۆر راستە) و پرسیمان: نمونەی پەیوەندی نێوان هونەرو سیستەم لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا چیە؟ ئەوا بە دڵنیاییەوە نمونەی سێیەم نیە، هەروەها بە تەواوی نمونەی یەکەمیش نیە. بەڵکو زیاتر لە نمونەی دووەمەوە نزیکەو هەندێ دیاردەی نمونەی یەکەمیشی تێکەڵ بووە. ئەگەر بمانەوێ بەهەندێ دەستەواژەی زاراوەکانی فیکری عەرەبی گوزارشت لەمە بکەین ئەوا دەڵێین هونەر لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا لە چوارچێوەی بارودۆخی فەرمان پێدان و

تەفیکردندا دەسورێتەوە: ئەمە بنوسە، ئەوە مەنوسە، وەك بەرامبەرێکی تەعبیری داڕشتنێکی بەیاسابوو: ئەمە بکە، ئەوە مەکە.

لێرەوە دەکرێ بڵێین هونەر لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا پێویستە، بەلام لە هەمان کاتدا مەترسیدارە.

-3-

هیچ جیاوازیەك نیە لەسەر ئەوەی کە هونەر پێویستە. بەلام ئایا مانای چیە مەترسیداربێ؟ لەلایەکەوە مانای وایە ئەو سنورە تێئەپەڕێنێ کە بۆی دیاریکراوەو رێی پێدراوە لەناویا بژی، تابۆ لەناودەبات یا پێشێلی دەکات. مەترسیەکەش لەوەدایە ئەم پێشێلکردنە شێوەیەکە لە شێوەکانی رماندنی ئەو بنەما (فیکری- بەهایی)یەی کۆمەڵگە جێگیریان دەکات و سیستەم لەسەری رادەوەستێ. لەلایەکی دیکەوە مانای وایە: بە سنورەکانی خۆی رازی نابێت و دەخوازێت بەردەوام تێیان بپەڕێنێ، مەترسی لەوەدایە هەرەس بەو دەزگایە دەهێنێ کە نامێڵێ ئارەزوو بکرێتەوە یا گومانی لێدەکات، ئیدی ئەو دەزگایە سیاسی بێ یا ئابوری، کۆمەلایەتی بێ یا تەقلیدی. هەوڵیش دەدات سنوری دیکە یا بواری دیکە دروستبکات تا لەگەڵ ئەوەدا بگونجێ کە خۆی دەیخوازێ: واتە لەگەڵ ئەو ئارەزووەدا کە هەمیشە لە تازەبوونەوەدایە. بە روویەکی دیکەشدا مانای راستکردنەوە دەگەیەنێ. ئەوکاتەی هونەر نابێتە مەترسی، دەبێتە شێوەیەك لە گوزارشتکردن و بیرکردنەوەی گونجاو، رازی بەسەرکوتکردن و دەزگاکانی. واتە رازی دەبێ بەوەی ئارەزوو نەدرکێنێ، واتە رازی دەبێ هونەر نەبێ. بۆیە دەکرێ بڵێین هونەر یا مەترسیدار دەبێ یا نابێ.

-4-

وەهاش دەگەینە ئەم ئەنجامەی خوارەوە: پێوەری یەکەمی بایەخی هونەر لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا ئەوەیە کە مەترسیدار بێ. بەلام ئایا چۆن رادەی ئەم مەترسیە دیاری بکەین؟ دەبێ بە پێی پێشێلکردن و تێپەڕاندنی تابۆ دیاری بکەین- واتە بەپێی رەتکردنەوەی سەرکوتکردن و ئامرازەکانی- بۆیە وا دەردەکەوێ دوو پلەمان بۆ هەڵسەنگاندن هەبێ: پلەیەکی نیگەتیڤ و پلەیەکی پۆزەتیڤ کە هەردوکیان تەواو کامڵن.

### 1- نێگەتیڤ:

-هەر هونەرێك رەنگدانەوەی بەها باوەکان بێت مەترسیدار نیە.

-هەر هونەرێك بە سیستەمی باوەوە پەیوەست بێت مەترسیدار نیە.

-هەر هونەرێك رێگەکانی دەربڕینی درێژکراوەو بەردەوامیی رێگە بۆماوەو کۆنەکانی دەربڕین بێ مەترسیدار نیە (رێگە کۆنەکانی دەربڕین لە هەمان کاتدا رێگە کۆنەکانی فیکر دەگەیەنێ).

-هەر هونەرێك ئەو شتە بڵێت کە رێپێدراوە بیڵێ یا ئەوە بڵێ کە (عەقڵ) یان (حیکمەت) رێگری ناکات، مەترسیدار نیە.

### 2- پۆزەتیڤ:

-هەر هونەرێك تابۆ پێشێلبکات مەترسیدارە.

–هەر هونەرێك لە ئارەزووەوە سەرچاوە بگرێ، مەترسیدارە.

–هەر هونەرێك ئەو شتە بڵێ کە ناوترێ یا ڕێگە بە وتنی نادرێ، مەترسیدارە.

–هەر هونەرێك ڕێگە کۆنەکانی دەربڕین تێکبشکێنێ و تێیپەڕێنێ، مەترسیدارە.

-5-

ڕوخاندنی هونەر، یا ڕوخاندنی ئارەزوو، یا ڕوخاندنی ژیان خۆی: ئەمە کاری ئەو کۆمەڵگایانەیە کە دەربڕینی هونەریی دەخەنە چوارچێوەی تابۆکانەوە. ڕوخاندنی هونەریش مانای ڕوخاندنی کولتورە: پاشتریش مانای زاڵبوونی کۆمەڵگەی بازرگانی بەرخۆیی –واتە زاڵبوونی ئیمپریالیزم. مارکس دەڵێ: "پرۆلیتاریا تا چەندە چینێکی فەلسەفی و هونەری بێ، هێندەش چینێکی شۆڕشگێڕە. تاوەکو فەلسەفەو هونەر بەدی نەهێنێ، شۆڕشەکەیشی بەدی نایەت".

بۆیە شۆڕشێك نیە کولتوری نەبێ، لەو ڕووەوە کە کولتور بەرپرسیاریە، ئارەزووکردنێکی سەراپاگیری گشتێکی سەراپاگیرە.

-6-

ئێستا ئەگەر ویستمان لەم ڕوانگەیەوە هونەر لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا هەڵبسەنگێنین، چ سوودێکی دەبێ؟ بەڵام سەرەتا دەبێ بپرسین: ئایا لە چوارچێوەی ئەم پێوەرەدا هونەرێکی عەرەبی هەیە؟

وەڵام: نەخێر. مەبەستم لەوەیە لەسەر ئاستی کۆمەڵگەو دەزگاکان، هونەرێکی عەرەبی وەك بزوتنەوەی دەربڕینێکی سەراپاگیربوونی نیە، بەڵکو کۆمەڵێك دیاردەی هونەریی مەترسیدار هەن. چالاکی هونەریی ڕاستەقینە لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا خەباتێکی داهێنان ئامێزە (ابداعی) لە پێناوی ئەوەی جوڵەی ئەم دیاردانە ببێتە جوڵەی داهێنانێکی ساراپاگیر، لە پێناوی بەدی هێنانی شۆڕشی کولتوری عەرەبیدا.

*سەرچاوە:*

*ادونیس: زمن الشعر– طبعة ثانية منقحة و مزيدة/ بیروت 1978– لاپەڕە (306–310).*

**فایلی ژمارەی داهاتووی (سەردەم) تایبەت دەبێت بە (مارکس و مارکسیزم) چاوەڕێی بەشداریتانین.**

# لە ئەدەبی گەلانەوە

- ژنەکەی ژەنەڕاڵ (کورتە چیرۆك) میلیو کوماندارپاس
- پیاوێکی چاو شووشەیی — موسا بەیدج
- سێ پارچە شیعری بیانی

# ژنەکەی ژەنەراڵ

## -چیرۆکێکی یۆنانییە-


■ مینیو کۆماندارپاس

● و. لە عەرەبییەوە: عەبدولکەریم شێخانی


هەر کە دەست بە رووخاندنی ئەو خانووەی بەرانبەر ماڵەکەی ئێمە کرا، ئەو خانووەی سەرەکەی خشتی سوور (قرمید) بوو و دارێکی (ئەرووکاریە) سێبەری لە حەوشەکەی ئەو خانووەی کە بە گوللەی مانگی کانوونی یەکەم کون کون بوو بوو، دەکردو ئەوەندەشی پێ نەچوو کە خانوێکی چاك و تەواو لە شوێنی خانووە کۆنەکە قوت بووەوە کە من ئێستاش هەر لەبەرچاومە.

لە هاویندا، بە تایبەتی لەنێوان سەعات حەوت و هەشتی ئێوارە، کاتێك کە خۆر پاش ماندووبوون و هیلاکییەکی زۆر دەگەیشتە بەرزایی نیوەڕۆ، لە پشتی چیای (ئیگالیۆ)وە ئاوا دەبوو.. منیش لەسەر شووشەکانەوە، کاتێك ئەو جوانییە گەشاوەیە رەنگی دەدایەوە، رووناکی و سێبەرم دەبینی دەجووڵانەوە. لە پشت سورەیا درز بردووەکانەوە، گۆشەی ژوورێك، قەرەوێڵەیەکی ئاسن کە چەند گۆیەکی برونزیی بەسەرەوە بوو و منداڵێکم بە جلی سپییەوە دەبینی لەسەری راکشابوو.. تاکە پەڵەی سپی لەو ئێوارە سوورە گڕگرتووەدا خاتوو ساسی، یان ئوستاسی بوو کە خەڵکی گەڕەك بێ پەروا وای پێ دەڵێن.. ئەڵبەت لە پێش هەمووشیانەوە خانمە کوندەپەپۆکەی دەرگەوانمان و بینلۆپییە پیری کارەکەرمان بوو.

بەڵێ، ئەو خانووەم باش دێتەوە بیر، خانووێك بوو لە شێوەی نیو کلاسیکیی یەك نهۆمیی سادەو تۆکمەو پتەو وەك ئەوەی کە هاورێیانی دوێنێ دروستیان دەکردو چەند جوانکارییەك لەهەر چوارگۆشەکەی بوون کە خشتە سوورەکەیان شاردبووەوە، بۆیە لە رێگەی چوونمدا بۆ قوتابخانە، ئەمانەیان بە چوار کەڵەشێر دەهێنایە بەرچاوم کە خۆیان بۆ خوێندن و قووقاندن ئامادەکردووە. کەپرێکیش یەکێك لە رووکارەکانی داپۆشیبوو، ئەو

لایەی کە رووی کردبووە خۆرئاوا هەروەك ئەوەی بیەوێ بە شەرمێکەوە لەخۆر بیپارێزێت و سەردەکەوت تاکو نهۆمی یەکەم، چونکە تەنیا ئەو بالکۆنە (چوخمەیە) هاتبوو دەرەوە.. بالکۆنێکی کۆن سەکۆ ئاسنەکەی نوو مەلی دەنووك پانی چرنووك قولاپی لەسەر دروست کرابوو -کە من بە ماری هەوت سەرم دادەنان- ئەو بالکۆنە (چوخمەیە)، بیری من جوانیی زیاتری پێ دەبەخشی، ئەو چوخمەیە بوو کە هەموو بەیانییەك زوو خاتوو ساسی دەهاتە دەر بۆ ئەوێ، هەلگری تەختەی نیگارکێشانەکەو دەفتەری وێنەکیشانە تایبەتییەکەی هەلدەگرت، دوای ئەوەی چەرچەفەکانی لەسەر کورسییە پشت خڕە لە پووش دروست کراوەکە بۆ هەواگۆڕکێ، رادەخست، چونکە خاتوو ساسی، وەك لە گەڕەکەکە باسیان دەکرد، نیگارکێش بوو.

ژەنەڕاڵ ساسیی مێردی پیاوێکی قژزی لەش پڕ بوو کە بە تیشکی خۆر ئەسمەر هەلگەڕابوو، بە گۆچان دەڕۆیشت! وام بەخەیالدا دێت کە ئێستاش گوێم لە دەنگی پێیەتی کە هەنگاوی دەنا لەکاتی نیوەڕۆداو جیڕەی ئەو دەرگایەی کە سەرەکەی ئاسن بوو دەتگوت هی سەدەکانی ناوەڕاستە. کە گوێم لە جیڕەی دەرگاکە دەبوو، دەمزانی کە ژەنەڕاڵ وا گەڕایەوە مالەوە.. بۆیە خاتوو ساسی دەستبەجێ دەفتەرەکەی دادەخست و هەلگرەکەی دەپێچایەوە، هەروەك هاتنەوەی ژەنەرال مانای کۆتایی هاتنی جیهانێك بێت کە تەنیا خاتوو ساسی بتوانێت بچێتە نێویەوە.

لە کاتەکانی دیکەدا، سەرلەنوێ، پێوەرێکی توند بەسەر مالەکەدا زال دەبوو، لە پشتی پەردە نیوە شۆڕ کراوەکانەوە، چاودێریی ژەنەرالم دەکرد کە دەهات و دەچوو.. دەمبینی سەگە راوییە تایبەتییەکەی خۆی لە حەوشە دەبەستەوە، سەگێکی دووڕەگ بوو.. ئاو و خواردنی دەدایەو یاریی لەگەل دەکرد. بێگومان ئەو سەگە تاکە خولقاو و ئافەریدە بوو کە ژەنەرال خۆی بە یاریکردن لەگەلیدا میلاك دەکرد. لەوکاتەدا دەموچاوی، روالەتی جەنگاوەرێکی رووگرژی مڕومۆچی پێوە دیار نەدەما. ئەو خانەنشین بوو. قسەو قسەلۆکی خەلك باس لەوە دەکەن کە شەلییەکەی بەهۆی رووداوەکانی ئاسیای بچووکەوە بووە. دایکم هەر کە چاوی بە ژەنەرال دەکەوت، هەمیشە هەستی بە خەمبارییەکی تایبەتی دەکرد. لەوانەشە ئەو هەست کردنەشی لەبەر بیرکەوتنەوەی باوکی بووبێت کە وەك دەستیارو یاریدەدەرێکی قوستەنتین شا بەشداری لە جەنگی بەلقاندا کردبوو. بەلگەش بۆ ئەمە ئەوەیە کە ژمارەیەکی زۆر کۆنی رۆژنامەی (ئەکرۆپۆلیس)ی هەلگرتبوو کە دەتوانین لە پشت سەرکردەی سوپاوە (ئەریستیدس ئەنگیلۆ پۆلۆس ئەناتۆس) ببینین کە دایکم ناوەکەی ئەوی پێوەیە. دایکم هەر باسی ئەوەی دەکرد کە وێنەکە لە چوارچێوە دەگرێت، بەلام بەردەوام ئەوکارەی پشت گوێ دەخست تا وای لێ هات کاغەزەکە زەرد هەلگەڕاو وێنەکەی باپیریشم، بە تەواوی تیاچوو.

بەلام زمانی غەیبەت و قسەو قسەلۆکهێنەکان - لە پێش هەمووشیانەوە خاتوو کوندەپەپوو- دەیانگوت: هۆی ئەم شەلییەی ژەنەرال رووداوێکی کەم بایەخ بووەو ئەو لە راستیدا کاتێك کە چەکەکەی خۆی پاك کردۆتەوە، لە دەستی دەرچووەو بەرخۆی کەوتووە. من گێڕانەوەی ئەو رووداوانەم بە شێوەیەك وەرگرت، بەلام بێئەوەی لە بایەخی ئەو شەڕانە کەم کەمەوە کە بە دلنیایی، ژەنەڕاڵ بەشداریی تێداکردوون. لە راستیشدا وام بۆ دەرکەوت، ئەو رووداوانە، بە رێگەیەکی باشتر، لەگەل کەسێتییە تەماوی و بەردەوام داخراوەکەی ژەنەرالدا رێك دەکەوتن و جووت دەبوون. وام پێ خۆش بوو کە

هۆی ئەو شەلییەی ژەنەراڵ بگێڕمەوە بۆ لێك راسانێك (مبارزە)، هەروەك ئەوەی لە کتێبەکانی تورگنیف و چیخۆف کەوتبوومە سەریان و دەمخوێندنەوە، لێك راسان (مبارزە)ێك کە ئەنجامی داوە بۆ ئەوەی سنوورێك بۆ ئەو شەڕە دابنێ کە لە بارەی ئافرەتێکەوە رووی داوە.. ئە و ژنەشم هەمیشە وا دەهێنایە بەرچاوی خۆم کە جلی سپی لە بەردابوو، و قژەکەشی کە بەسەر شانیدا پەخش بوو بوو، هەر کە تیشکی خۆر لە پەنجەرەوە دزەی دەکرد بۆ ژووری بەر ئەو قژە پەرش و پەخشانە دەکەوت، دەبریسکایەوە، لە کاتێکدا باڵێکی ئەو ژنە بە شلی لەسەر قەرەوێڵەکە شۆڕدەبووەوە. دەبێ ئەو ژنە کێ بێت؟ لەوانەیە خاتوو ساسی خۆی -یان بڵێین کیکیلیا بووبێت وەك پێیان دەگوت.

وام بۆ دەردەکەوت کە ئەو کارە حەستەمەو لەوانەشە ژەنەراڵ لە پێناوی ژنەکەیدا تووشی ئەو لێك راسانە (مبارزە)یە بووبێت. بەهەرحاڵ، دەبێ ئەو دوو کەسە وەکو رۆژو شەو وابووبن.. لەوانەیە ژەنەراڵی سەردەمێك، با بڵێین لە سەرەتای ژن و مێردایەتییان، شێتانە ژنەکەی خۆی خۆش ویستبێت، بەڵام کێ دەزانێت؟ لەوانەیە کیکیلیا هەر لەوکاتەدا دڵی لە ئەفسەرێکی لاو لە یاوەرانی ژەنەراڵ، یان لە یەکێك لە سەربازەکانی چووبێت، بێگومان، بەپێی بۆچوونی من رەنگە ئەو بە شێوەیەکی هەڵاوێردراو و نائاسایی پیاوێکی رۆمانسییانەی بووبێت. قژی سوور و درێژ بووبێت و شۆڕ بووبێتەوە لەگەڵ جووتێ سمێڵی کاڵی مەیلەو سووری لە رەنگی قژی کیکیلیا خۆی، وای بۆ دەچووم کە لە پشت ژەنەراڵەوە، وەك سێبەری، رێکپۆش و خەویین بە ماڵەکەدا دەگەڕاو بەردەوامیش چاوی لە خاتوونی خاوەن ماڵ دەبڕی. هەروەها لەوانەشە ئێوارەیەکیان کاتێك کە ژنەراڵ چووە بۆ راو، لەو ژوورەی کە کەوتبووە بەر بیر کردنەوەو خەیاڵی من، لەنێو رەنگدانەوەی تیشکی خۆرئاواو لە پشتی پەردە تەختە نیوە داخراوەکەوە، خەڵك چووزانن، هەروەها خۆم بە خۆمم دەگوت: وێنەی بیرچوونەوەی ئەو ئەفسەرە بێت کە خانمی ژەنەراڵ هەوڵی دەدا، کاتێك کە خەریکی نیگارکێشان بوو، دەیویست لەسەر تابلۆکە بیر خۆی بهێنێتەوە. بێگومان، ژەنەراڵ هەرچەندە خۆیشی زامدار بووە، بەڵام ناحەزەکەی خۆی لەنێو بردووەو بۆ یەکجاری شەرەفی بۆ ماڵەکەی خۆی گێڕاوەتەوە.

به تێپەڕینی کات و ساڵ، ژەنەراڵ هەر دەگۆڕاو دەبوو بە سێبەری خۆی. لە بیرمە دەنگی هەنگاوەکانی لەو ساڵانەی ئەم دواییەی ژیانیدا قورس بوو بوون و گۆچانەکەشی بە زەحمەتی زۆر زیاتر دەیتوانی رایبگرێت. دەرگا ژەنگاوییەکەی حەوشە جیڕەیەکی بەرزی لێوە دەهات و سەگە پیرەکەش ناوبەناوێك نەبێ کە دەوەڕی، دەنا لە وەڕە کەوتبوو، هەروەك ئەوەی هەستی بە ڕوودانی شتێك کردبێت. ئێستا وای لێهاتبوو کە هەردووکیان چەند سەعاتێکی تەواو لەنێو ماڵە داخراوەکەودا دەمانەوە، ماڵێك کە هیچ دەنگێکی لێوە دەرنەدەچوو، تەنیا تەپ و تۆزی بەیانییان نەبێت لەکاتی پاك کردنەوەی ماڵەوە و کاتی ئێوارانیش کە تەمێکی تەنك دەکەوتە سەر گوڵە (ئەرتنسیە)کان لە چوخمەکەو تەنانەت کونە گوڵلەکانیشی دەگرت.

زستانی *1945* ژەنەراڵ مرد.. سەگە لەعنەتییەکەی بە درێژایی شەو هەر دەیلووراند.. سەر لە بەیانیی زوو، کاغەزێکمان لەسەر چینە بەردەکانی دیواری دەوری دەرگاکە بەدی کرد کە ئەو رۆژە هەر جیڕەی دەهات، کاغەزێك کە خەمبارانە باسی کۆچی دوایی ژەنەراڵی دەکرد.. دەروازەکە رێگای بۆ ئەو حەشاماتە خەڵکە کردبووەوە.. فەرمانبەرانی کۆمپانیای تەرم رێکسختن، بنەماڵەکە، کوڕەکەی ژەنەراڵ -کە مولازمێکی باڵاکورتی لەڕی خاوەن ریشێکی درێژکۆلە بوو و ئەوە یەکەم جار بوو لە گوزەرەکە دەمانبینی.

بینیلۆبی¯ی پیرێژن کاتێك که رای دەکرد، سوور بوو لەسەر ئەوەی کە یەکەم کەس بێت ئەو هەواڵەمان پێ رابگەیەنێت، هەر دەگریاو گوزارشتێکی ترازیدییانەی ئەوتۆ بەسەر روویەوە بوو کە تەنیا هەر لە ژنانی گەل دەوەشایەوە: "ئای خوایە گیان.. مرد، ژەنەراڵ مرد، خوایە، خوایە، ئەو کلۆڵە! ئەوەتا ژنە کلۆڵەکەی تەنیایە وەك بنە قامیشێك لە ناوەڕاستی کێلگەیەکدا.. ئای خوایە لەو لێقەومان و قوڕ بەسەرییە". ئەمەی دەگوت و لە دەموچاوی خۆی دەدا.

چەند رۆژێکی زۆر تێپەڕین، بێئەوەی خانمی ژەنەڕال ببینین، پەردە تەختەکان هەر دادرابوونەوەو ماڵەکەش هەمووی دەتگوت کرژ دەبێت و دەگوشرێت و بەسەر خۆیدا کۆدەبێتەوە و هەروەك بڵێیت جاڵجاڵۆکە لەهەموو لایەکەوە شالاوی بۆ بردبێت و مێرشی کردبێتە سەری. دوای ئەوە لەپڕ کە تازە دە پانزدە رۆژ بەسەر مردنی ژەنەراڵدا تێپەڕیبوو، سەر لە بەیانییەك پەردە تەختەکانی بەرامبەریان هەڵدرانەوەو بەشێوەیەکی سەیر، خانمی ژەنەراڵ پەیدا بوو.

رەنگە وامان چاوەڕوان کردبێت کە ئەو ژنە تەمەن چل و پێنج ساڵییە خەمبارو رەنگ هەڵبزڕکاوو رەشپۆش ببینین. کەچی ئەو ژنەی لێمان دەرکەوت کراسێکی نێوماڵی زەردی مەیلەو پرتەقاڵیی لەبەردابوو، لۆچە پانەکانی بوێرانەو چاونەترسانە دواوەیان دەخستە روو و قژیشی بە شێوەی کێکێك بەرز کردبووەوە، دەفتەری نیگار کێشانەکەشی – راست دەکەن– بەدەستەوە بوو. لەسەر کورسییەك لە لایەکی باڵکۆنەکە دانیشت و دوای ئەوەی بۆ ماوەیەك لە گوڵە (ئەرتنسییەکان) ورد بووەوە و چاوێکی بە گوڵە مێخەکەکان و (غەرنووقییەکان)دا گێڕاو بە ئامازەکردنێك هەستا وەك ئەوەی بڵێی تۆزێك بە سەرگوڵەکاندا بپرژێنێ –ئەمەم وەك جادوویەك هاتە بەرچاو– لە راستیشدا دیمان گوڵەکان لە رۆژانی دوای ئەوە هەڵسانەوەو گوڵیان دەرکردو دەتگوت هەرچی لە نێو ئەو ماڵەو دەرەوەیدایە بە جارێك هەموویان بێدار و سەرلەنوێ زیندوو بوونەتەوە، تەنانەت شوێنەوارو کونی گوللەکانیش وێك هاتنەوە و پەکتریان گرتەوە.

ئیدی لەو رۆژەوە خاتوو ساسی کیکیلیا هەموو بەیانییەك هەلگری تابلۆی وێنەکێشانەکەی خۆی دەهێنایە دەرو بەردەوام خەریکی وێنەکێشان دەبوو و لە بۆشایی دەرگای باڵکۆنەکە خۆیشی لە تیشکی خۆر دەپاراست. گومان لەوەدا نییە کە تەندروستییەکی باشی هەبوو؛ چونکە زۆرجار دەمبینی بەدوو چاوی بریقەدارو دووکوڵمی سوور هەڵگەڕاوەو خۆی بەسەر تابلۆکەیدا دەهێنایەوەو بە ئەسپایی فڵچەی بە وێنەکەدا دەهێنا، ئینجا لەپڕ یەك دوو هەنگاو بۆ دواوە دوور دەکەوتەوە هەر دەتگوت بایەکی بەهێز بۆ دواوە پاڵی پێوە دەنێ، بۆ ئەوەی لەو ماوەی یەك دوو هەنگاوەوە لەوە وردبێتەوە کە تەواوی کردووە، دوای ئەوە خێرا دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی ئەو شتەی بەدڵی نەبوو راستی کاتەوە، یان هەندێك وردە شت تەواو بکات. ئەو هەمیشە جلی سووکەڵەی درێژی زەرد یان پەمەیی لەبەر دەکرد. قژە قاوەیییە بە بۆیە رەنگ شەرابی بۆیە کراوەکەی، لای لاجانگ خەریك بوو سپی دەبوو بێ ئەوەی هەوڵی ئەوە بدات کە بیشارێتەوە. هەموو لەشی وای پیشان دەدا دەتگوت جحێڵ بۆتەوەو هەر وەك بڵێیت لەپڕ لەوە دڵنیابێت کە ژانبویەتی بە درێژایی ئەو هەموو ساڵانە حەزی لەچی بووە، یان ئارەزووی چی کردووە. ئێستا روون و ئاشکرا بوو کە خانم خەریکە لە ئامانج نزیك دەبێتەوە.

هیچ رۆژێك وەکو ئەو رۆژانەی ساڵی 1945 وا جوانم نەدیوە. لەو ماوەیەدا کاتی حەسانەوەی ئەو لە کارکردن و وانە خوێندنی مندا هەندێك قسەی

شەرمنانەمان کرد. هەر لە بالکۆنەکەی خۆیدا دەهاتەوەو دەیگوت: "بەیانیت باش، چۆنی؟"

منیش سەرم دادەخست و وەلامم دەدایەوە:

"باشم، سوپاست دەکەم، ئەی تۆ؟"

ئەم لادانە لە ئیش و کارەکانمان، شلەژانێکی زۆری بۆ پەیدا دەکردم تا ئەو رادەیەی چەند سەعاتێکی دوورو درێژ برینم لەسەر پێی پارسای ئایین فێرکردن و کلاوی بچووکی شێوە دەنکە گێلاسی لەسەر رەگە چوار گۆشەکان دەبینی.

جارێکیان بە دەنگێکی پڕ لەرەوە پێی گوتم:

"چ دەکەیت؟"

ئاوڕم دایەوە بۆ ئەوەی سەیری کەم و لە کاتێکدا سەرلەنوێ بەسەر کتێبەکەی بەردەممدا دادەنەویمەوە کە کرابووەوە بە دەنگێکی نزم گوتم:

"دەخوێنمەوە".

دەنگەکە لە بالکۆنەکەی بەرامبەرمەوە بە تەوسەوە گوتیەوە:

"دەخوێنیتەوە.." منیش لە کاتێکدا خۆ تێهەڵقورتاندن بەسەرمدا زاڵ بوو، بوێرانە لێم پرسی:

"ئەی تۆ وێنەی چی دەکێشیت؟"

وەلامێکی تەماوی و نائاشکرای دایەوە: "زۆر شت" هەر وەك ئەوەی بڵێت: وێنەی زۆر زۆرم کێشاوە.." دە رۆژێك وەرە بۆ ئەوەی لە نزیکەوە بیانبینی". بە دڵخۆشییەکەوە بەسەر ئاماژەم بۆ کرد، بەلام لەو کاتەدا من لە گەرمەی تاقیکردنەوەدا بووم و لە لایەکی دیکەشەوە هەستم بەوە کرد کە دەبێ مەسەلەکە لە باوك و دایکم بشارمەوە. هەرگیز نەمدەویست کەسانی دیکە دەست لەو پەیوەندییانە وەربدەن و لووتی تێ بژەنن خەوشداری بکەن، چونکە من دەمزانی و زۆریش دڵنیای هەق و حسێبی خۆم بووم کە قسەو پلار تێگرتن و تێبینی بلاودەبنەوە "پێم بڵی لەگەڵ کێ دادەنیشیت تا پێت بڵێم تۆ کێیت". "هەرکە نیسکی مێشوولە لێراو پەیدابوو، کوێرێکیش بۆ پێوانی هەر پەیدا دەبێ"، یان شتێکی لەم بابەتە. ئەمە سەرەڕای چەند چەن و زۆر بڵێیی دراوسێکان کە گوزەرەکەی پڕ کردبوو دەیانگوت: هەر بە حاڵ جلی تازیەباری بۆ ماوەی پانزدە رۆژ لە بەرکردو بیر لە هیچ ناکاتەوە لە رەنگەکانی نەبێت لە کاتێکدا خۆ گۆڕەکەی ژەنەراڵ هێشتا وشك نەبۆتەوەو هەر وەك وێنە کێشان توانایەکی لە رادە بەدەری لەسەر ژاکاندن و خەوشدارکردنی یادگاری مرۆڤدا هەبێت.

کە وانە خوێندن تەواو بوو و دەرگای قوتابخانە داخرا، بۆ ماوەیەکی کەم مەیدانی (کیریاکۆ)مان جێ هێشت و رێگای (کیفیسیا)مان گرتە بەر، وەك راهاتبووین، بۆ پشوو بەسەربردن لە خانووێك کە بە کرێمان دەگرت. بەم شێوەیە ئەو هاوینە چاوم بە خاتوو ساسی، یان ستاسی، کە لە گوزەرەکەی ئێمە وایان پێدەگوت، نەکەوت، چونکە خەڵکی گومانیان لەو ناوانەی زۆر باوتین و ئەو رەفتارانەی کە لەگەڵ مۆدەدا دەگونجێن، پەیدا دەکرد. لە سێبەری دارچنارێکی سێبەرخەستدا دانیشتم و ئاوی کانییەك بە بەرپێمدا دەڕۆیشت -کیفیسیا ئەوسا بە تەواوی وشك نەبووبوو- شتم دەنووسی لە کاتێکدا خەیاڵم دەفڕی و لەشەقەی باڵی دەدا بۆ لای ئەو. لە دڵی خۆمدا دەمگوت: خانمی ژەنەراڵ، بە دڵنیایی، وێنەی کەسەرو پەژارە دەکێشێت. وام بە خەیاڵدا دەهات کە من لەگەڵیدام. لەو رۆژانەدا " لە سێبەری دار بەڕوو شکۆدارەکەم" دەخوێندەوە، هەستێکی وا دایدەگرتم کە منیش پێغەمبەرم لەگەڵ ئەوەی کە ئەمە تا رادەیەك شتێکی وێ نەچوو و ناماقووڵ بوو.

زستانی داهاتوو ساردو پڕ لە قسەو قسەڵۆك و رووداو بوو لە بارەی چەند جەنگێکی ناوخۆو کارەساتی ئابوورییەوە -باوکم کە لە کارەکەی دەگەڕایەوە، هەمیشە سەری دادەخست و بیری

دەکردەوەو نیگاکانی دەتگوت هەموو گیانم دەسمێ- سێبەری خاتوو ساسی لە پشت پەنجەرەکەیەوە هەر بە سووری مایەوە دەست پێی نەدەگەیشت. هەلگری وێنە کێشانەکەیم جیا دەکردەوە، هەروەها هەردوو دەستە رەگ دیارە جوانەکانی کاتێك کە کاریان دەکرد، ئەو تۆپەڵە پەڕۆ کۆنانەی کە لە دەورو پشتی خۆی بڵاوی دەکردنەوە بۆ ئەوەی پەنجەیان پێ بسرێتەوە، پەنجەی سپی و جوان، لەو جارە کەمانەی کە تیشکی خۆر بەرەو بالکۆنەکە رایدەکێشا، نیگامان تێك هەڵدەنگووت، ئیدی دەستی دەکرد بە پرسیار باران کردنم"

"ئەوە کوڕە لاو بەڵێنەکەی خۆی بیرچۆتەوە؟" منیش لە کاتێکدا دەموچاوم هەتا بناگوێم سوور هەڵدەگەڕا، وەلامم دەدایەوەو "نا، بێ گومان نا".

دەیگوت: "کەواتە کەی بەسەردانی شەرافەتمەندمان دەکات؟"

وەلامم دەدایەوە: "هەرکاتێك بۆی بکرێت".

شێوەی کەسی سێیەمم بەکاردەهێناو دڵم بەوە خۆش بوو کە زمانی هێمای تایبەت بە خۆمانمان دروست کردووە. بەڵام خەمی دایك و باوکم هەر لە مێشکمدا دەزرنگایەوە. دوودڵ بووم لەوەی کە لای ئەو دان بەوەدا بنێم کە دەبێ مۆڵەتیان لێ وەرگرم، ئەمە لای ئەو دەستوورێك بوو لە نێوان کەس و کارو منداڵەکانیاندا.

پێی گوتم: "هەفتەی داهاتوو وەرەو دوامەکەوە، دوای ئەوەی لە هەموو شتێك دەبمەوە" ئەمەی گوت بە چەناگەش ئاماژەی بۆ هەلگرەکە کرد کە لەبەر سێبەر لە دووریی چەند هەنگاوێك لە قەرەوێڵەکەی کە چەرچەرفێکی بچووکی پێدا درابوو و ریشوەکانی دەتگوت بارانن دێنە خوارێ، داندرابوو.

هەفتەی داهاتوو هات و دەتدیت ئارامم لێ هەلگیرابوو.. دەستم بە جێبەجێکردنی کاری پێویست کردبوو و بەدایك و باوکم راگەیاندبوو کە بڕیار وایە پاش نیوەڕۆی ڕۆژێك چایی لای خانمی ژەنەراڵ بخۆمەوە. باوکم بە گومانەوە لێی پرسیم: "چی؟ چایی دەخۆیتەوە؟ بەڵام تۆ دەبێ ئەرکەکانت تەواوکەیت". دایکم درێژەی بە قسە داو گوتی: "تێ ناگەم تۆ چیت لە خانمی ژەنەراڵ دەوێ؟ ئەمە دەچێتە ئەقڵەوە کوڕێك بچێتە لای ژنێکی چل ساڵی؟" بەڵام لەوە دڵنیا بووم کە ئەوان لە ناخەوە زیاتر لە زۆر بڵێیی خەلکی دەترسان. ئەمە هەمووی ئەو شتە بوو کە لای ئەوان گرنگ بوو، ڕۆژێکیان خاتوو ساسی پێی گوتم: "سبەینێ سەعات پێنج.. ئەم کاتەت پێ باشە؟ باشم گوێ لێ بگرە". ئەمەی گوت و وام بۆ دەرکەوت کە بزەیەکی توانجاوی بەسەر لێویەوە بوو. "کتێبەکانیشت لەگەل خۆت بێنە، با چارێکیان پێدا بگێڕین". لێم پرسی و خۆم وا پیشان دا کە تێ ناگەم: "ئەرکەکانی خوێندنم؟"

بە زەردەخەنەیەکی گاڵتەئامێزەوە وەلامی دایەوە:

"ئەو شتانەی وەك شەڕە پشیلە دەیاننووسیت"، ئەوسا -ئای لەو خۆشییە- هەناسەم لەخۆم بڕی.

ئێوارە خەوێکی شڵەژاوانەم لێکەوت. بەردەوام کەل و پەلی نیگارکێشان و قەرەوێڵە سپییەکەم بە تۆپە برونزییەکانەوە دەدیت، بۆیە جۆرە خۆشییەك دایدەگرتم. وام دەهێنایە بەر چاوی خۆم کە چۆن بەرانبەر یەك دادەنیشین. ئارەزوویەکی لە رادەبەدەر بە سەرمدا زاڵ دەبوو بۆ ئەوەی لە دەم و چاوی وردبمەوە کە چاوەکانی بریسکەیان دەدا، دەنگە -ناڕادەیەك- گڕەکەی دەتگوت توانجگرە، دانیشتن لەسەر قەراغی قەرەوێڵەکەی -خوا دەزانێ بە چ بیانوویێك- چەشتنی هەندێك ساردیی چەرچەفە بۆندارەکانی کە -بەدڵنیاییەوە- بۆنی زەنبەقیان لێ دێت، ئارەزوویەکی سەرکێش بەهەست پێ کردنی دەستی کە بەر دەستم دەکەوێت، کاتێك پێم دەڵێت: "پێم بڵێ چ دەکەیت؟ تەگبیر بۆچی دەکەیت؟ دەی

ئەوە بۆ شتێکم بۆ ناخوێنیتەوە؟" مردنم پێ خۆشترو لا ئاسانتر بوو لە خوێندنەوەی شتێك بۆ ئەو ژنەی کە دەست پێگەیشتنی دوورە. وام بۆ دەردەکەوت کە ئەوەی نووسیومە لە چاو ئەوەی ئەو دەیکات، ئەوەندە نامێنن. هەموو ئەم شتانەم شایانی باس کردن نین، لە بەرانبەر ئەمەدا خەریکم شێت دەبم لەتاو بینینی تابلۆکانی، لێك وەشایی رەنگەکانی، تۆ بڵێی نیگاری چی بکێشێت؟

لە دڵی خۆمدا دەمگوت: دڵنیام لەوەی نیگاری مەندێ دیمەنی هێڵی ئیستیوا دەکێشێت کە دارخورماو دەریای رۆژهەڵاتیی ساف و لووسی وەك ئاوێنەی لێیە کە ئەو بەلەمانەی دانیشتوانی خەڵکی ناوچەکە لێیان دەخوڕن، لەسەر رووی ئەو ئاوە سافە دەخزن و هەڵدەخلیسکێن. زۆر وێنەی ئاوەهام لە کتێبەکانی (جۆل ڤێرن)دا دیبوو. بەڵامن نا بیرم کردەوە. بێگومان سرووشی خۆی لەوەی دەیزانێ و تێیدا ژیاوە، خەست دەکاتەوە، کێ دەزانێ، لەوانەیە وێنەی گەڕەکەکەمان، یان رەنگە خانووەکەی خۆی، یان خانووەکەی ئێمە بکێشێت، یاخود گۆڕەپانی کیریاکۆ کە پڕە لە قاپە دۆندرمە لەنێو تەمی گەرمایی کە بڵاو دەبووەوەو رەنگەکانی دەگۆڕی و کاڵی دەکردنەوە. ئەرێ ئەو ئارەزووە بە تینەی سەیرکردنی چاوی کەسێکی دیکە، یان چوونە نێو نهێنییەکانی هونەرێکی نزیك لە هونەری من نەبوو کە بەرەو ماڵی خانمی ژەنەڕاڵ پاڵی پێوە دەنام؟ یان هەر ئەوەندەم بەس بوو کە چاو لە چاوی کێکیلیا ببڕم یان گوێم لە دەنگی بێت؟ لە دڵی خۆمدا دەمگوت: ئەم دوو هاندەرە لەوانەیە لە راستیدا هۆی یەك پێویستی بن.

هەرگیز سەردانی خانمی ژەنەڕاڵم نەکرد.

لە بەرەبەیانیی رۆژی داهاتوودا، واتە سەر لە سبەینێ زوو، کاتێك دەستم بە خۆئامادەکردن کردو ئەو جلانەم هەڵدەبژارد کە لەبەریان دەکەم، نامەیەکی بچووك کە لە خاتوو ساسییەوە هاتبوو، پێی راگەیاندم کە نەخۆشەو ئەو نەخۆشییەش ناچاری کردووە کە لەنێو جێگەدا راکشێت. خاتوو بینیلۆبی نامەکەی دامێ کە لەسەر بلیتێکی بچووکی سپی نووسرابوو و گۆشەیەکەی نوشتابووەوە.

هەردوو چاوی ئەو پیرێژنە دەبریسکانەوەو نیشانەی جۆرە سەرکەوتنێك لە زەردەخەنەی سەردەمە بێ ددانەکەی وا دەردەکەوت.

پیرێژن بێ پێچ و پەنا پێی گوتم: "ئەو ژنە بەڵێنەکانی جێبەجێ ناکات و لە بەڵێنەکانی راستگۆ نییە".

حوکمی باوکم وەکو ئەوە وابوو کە کەوتبمە ژێر تیغی گیۆتین (مقصلە) وە، باوکم لەسەر خوانی نانی نیوەڕۆژە گوتی: "ئەو هەموو جگەرەیەی ئەو ژنە دەیانکێشێ، دەبوایە تووشی سیل بوایە".

دایکیشم لە کاتێکدا رەنگی هەڵبزڕکابوو درێژەی بە قسەکانی باوکم دا: "کاتێك بیر لەوە دەکەمەوە کە لەوانەبوو لە فنجانی ئەو ژنە بخۆیتەوە.. هەر ئەوەمان کەم بوو تۆش تووشی نەخۆشی بیت".

بەڵام من خەمبار دیار بووم و بەدرێژایی ئەو حەفتەیە هەر ئەوە حاڵم بوو. باوك و دایکم بەهەموو شێوەیەك هەوڵیان دەدا دڵم خۆش کەن و دڵم بدەنەوەو لەبیرم ببەنەوەو بەڵێنیشیان پێدام کە رۆژی شەممە لەگەڵم بێن بۆ سینەماو رۆژی یەك شەممەش سەرێك لە پەروەرە (ئۆرا) بدەین کە لە گۆڕەپانی (ئاگامۆن) دادەنیشێت بۆ دیداری

منداڵەکانی و گوێ لە جۆرج¬ی کوڕی بگرین کە بە پیانۆ "لە پێناوی ئەلیزدا"ی بیتهۆڤن و "خەونی ئەڤین"ی فرانزلیست لێ دەدات.

کاتێکی زۆر تێپەڕی پێش ئەوەی سەرلەنوێ پەنجەرەی خانمی ژەنەراڵ بکرێتەوە. بە درێژایی ئەو زستانە پەنجەرەکە خڕ داخرابوو پەردەکانیش هەر دادرابوونەوەو هەڵگری تەختەی وێنە کێشانەکەو چەرچەفە بچووکە ریشوودارەکەش لە چاوی من ون بووبوون. ئەو زستانە بارانی زۆرو هەروەها بەفریش باری.

لە پشتی پەنجەرەوە دادەنیشم و کتێبێکی بیرکاریم لەسەر ئەژنۆم دادەناو ¬خواش هەر خۆی دەزانێ¬ چ کتێبێکی دیکەی لە ژێردا شاردرابووەوە. چاوم بۆ ماڵەکەی بەرامبەرم و پەنجەرە داخراوەکەی خانمی ژەنەراڵ بەرز دەکردەوە. وامدەزانی کە قورساییەك لەسەر سینگمەو دەمخنکێنێ و پێڵووی چاوم خەواڵوویی قورس دەکردن. هەمیشە هەر هەمان دیمەنم دەهێنایەوە بەرچاوم، چۆن پاڵم بە دەرگاکانەوە ناو، هەر وەك جاران کاتێك ژەنەراڵ زیندوو بوو، دەرگاکە جیڕەیەکی ناخۆشی لێ هەڵساو، بەسەر پلیکانەکاندا سەرکەوتم.. لە سەرەوەی پلیکانەکان، بە زەردەخەنەیەك و کراسە تەنکەکەی کە لەلای سینگیەوە نیوەی هەڵقڵیشابوو، پێشوزایی لێ کردم و بانگی کردمە ژوورەوە. بەڵام من، سەرەڕای هەموو هەوڵێکی خەیاڵم، دەستەوەستان و بێتوانا بووم لەوەی کە بە وردی ژوورەکەی بە کورسیەکانیەوە، دوو کووپی چایی، دەفتەری وێنەکێشانەکە، قەرەوێڵە سپییە گەورەکە، ئەو دەنگانەی لە ژوورەکە دەهاتن.. هەروەك ئەوەی ڕووبەندێك بەسەر چاومدا درابێت، وەك ئەوەی کە شتێك ڕێگەی ئەوەم لێ بگرێت کە لەوە دوورتر بڕوانم.. لێرەدا زنجیرەی بیرم دەپچڕێت و بە دەمارگیرییەوە کتێبە قەدەغەکان بۆ دوور فڕێ دەدەم بۆ ئەوەی سەرلەنوێ کتێبی بیرکاریی ئەندازەیی بکەمەوە. دەمویست بگەڕێمەوە بۆ واقیع، ئەوەبوو، بەلای کەمەوە، ئەو زستانە توانیم ئەوە بکەم.

دوای ئەوە بە پێی ئەو دەنگ و قسەو باسانەی بڵاوبوونەوە، زانیمان کە باری تەندروستیی خانمی ژەنەراڵ بەرەو خراپی دەچێت. گوتیان کە خانم زۆر نەخۆشە و وای پێویست کرد کە بیبەن بۆ نەخۆشخانەو دەرچوونیشی بە زیندوویی بە دوور دەزانرێت. هەروەها لەو ماوەیە، لە ناوەڕاستی زستاندا، ئەوەش زانرا کە خانووەکە بە بەڵێندەرێك فرۆشراوەو ئەوەندەی پێ ناچێت کە لە شوێنی ئەو خانووە بینای (.....) دروست دەکرێت.

وەك توانیم تاقیکردنەوەکانم ئەنجام داو وەکو هەموو هاوینێك چووین بۆ (کیفیسیا).

لە ماوەی ئەو هاوینەدا لەو خانووە نیشتەجێ نەبووین کە دارچنارەکەی لێ بوو، بەڵکو چووین بۆ ئوتێلێك کە پیرەکان لێی دادەبەزین. لەبەر ئەوەیش کە من تەنیاو بێ هاوڕێ بووم، زۆربەی کاتی خۆم، بەبێ ئەوەی بەرەو شوێنێکی دیاری کراو بچم، هەر خەریکی سواربوونی پایسکل بووم. ئەو هاوینە تاکە دێڕێکیشم نەنووسی، هەر پەرۆشی دارچنارەکەو هەروەها هاوڕێیەتی ئەو ژنە بووم. نائومێدی دایگرتم، چونکە من لە مێشکی خۆمدا تاکە جارێك سەردانم کردبوو، تاکە جارێك کە هەرگیز لەبیر ناچێت.

دوای ماوەیەکی دوورو درێژ، کاتێك کە بیناکە تەواو بوو، خانمی ژەنەراڵ هات لە شوققەیەك لە نهۆمی سێیەم دانیشت، بەڵام ئەم جارەیان لەگەڵ کوڕە ئەفسەرەکەی کە بە پلەی (ملازم) بوو و بۆ پلەی (نقیب) بەرزکرابووەوەو ریشەکەی تاشیبوو و لەجیاتی ئەوە سمێڵێکی پانی هێشتبووەوە. لە گەڕەکە دەیانگوت کە کیکیلیا بە (موعجیزە) رزگاری بووە، بەڵام ئێستا نەخۆشی تێکی شکاندبوو و بەزاندبووی.

شەوێکی هاوین جارێکی دیکە بینیمەوە کە لە بالکۆنەی بیناکە ماتبووە دەرێ کە هەندێ رووەکی (غرنوق)ی باریك و بێ هێز مەولیان دەدا بیپارێزنەوە، خانم لە جلی رەشدا نوقم بوو بوو و ئەو تازیە بارییەی کە خۆی لێ گێل کردبوو، ئێستا لە پڕ گەڕاوەتەوە بۆ ئەوەی تۆڵەی لێ بکاتەوە. هەر کە چاوی پێم کەوت -وەك بەدەست خۆی نەبووبێت و لەوانەشە، نەیناسیمەوە، چونکە گەورە بوو بووم؛ ئەمەش هۆیەکی تاڵاری ئەوەبوو کە دارەکەیان بڕیبوومەوە، خێرا یەپەلە دالدەی ژوورە تاریکەکەی خۆیدا. ئەو ژوورە وەکو بینیم سالۆنێك بوو بە هەندێك دەست پلاوییەوە راخرابوو، سالۆنێکی سەنگین، بەڵام کەم بایەخ.. نە هەلگری وێنەکیشان لە هیچ لایەکی دیار بوو، نە دەفتەری وێنەکێشان.. تەنانەت چەرچەفەکەیشی کە ریشووەکانی وەك باران ببارێت، شۆڕبووبوونەوە لەسەر قەرەوێڵەکە نەبوو. خاتوو ساسی (کیکیلیا) خۆیشی سەری ماش و برنج بوو بوو، سپیەکی لێڵ، بەڵام هیچ گوێی بەوە نەدەدا کە بۆیەی بکاتەوەو دیمەنێکی جۆرە کەمتەرخەمییەکی پێوە دیاربوو، بێ باکییەکی تەواو.. شازادە خەرافییەکانی لەبەرچاو نەمابو و ژنێکی وەك هەموو ژنێکی دیکە جێگەی گرتبووەوە.

دوای ئەوە، وای لێهات ناو بەناوێکی دوور سەری لە پەنجەرەکەی دەمێنایە دەر. کە سەیری ئێمەی دەکرد، نیگاکانی هیچ گوزارشتێکیان تێدا نەبوو و هەر دەتگوت تەم دایپۆشیون. ژنە چەنەبازو زۆربلێیەکانی گەڕەك جارێکی دیکە دەیانگوت کە گوایا فێری ئەوە بووە کە بە تەنیا مەی بخواتەوە. زۆر جار لە شەو دانیشتنەکانی هاویندا ئەو شەوانەی کە ئێستا وەك جاران نەماون -کە ژاوە ژاو و هەرا هەرا کەریان دەکردین و دووکەڵی ئۆتۆمۆبیلیش ئاسمانی پیس دەکرد، دەمبینی پیرێژنێك لە ژوورێکی تاریکدا دادەنیشت کە رووناکییەکی نادیار بەتەنیایی هەڵدەلەرزی. بۆم دەرکەوت کە ئەو ژنە جوانە وازی لە قەڵەم و وێنەکانی هێناوە و ئێستا وای لێ هاتووە کە هەمیشە هەر راکشاوەو سەیری تەلەفزیۆن دەکات و بەردەوامیش پەرداخێك مەی لەلاوەیە.

لەو کاتەدا خاتوو بینیلۆبی لە ماڵەوە جێی هێشت و هەروەها خاتوو کرندە پەپووش رۆیشت. نەنکم کۆچی دوایی کرد، بێزاریی باوکم زیادی کردو دایکیشم لەبەر ئیش و کاری ناوماڵ کە تووشی نیگەرانییان کردبوو، دەمارگیرترو توورەتر بوو بوو. خۆیشم وانەو شتم نەمابوو و هیچ پرۆژەیەکی بەرچاو و دیار لە ژیانمدا نەبوو.. هەموو شتێك گۆڕابوو.

بەڵام ناوبانگە خراپەکەی ئەو ژنە ئەوەندەی پێ نەچوو و هەر روو لە زیادی بوو بێ ئەوەی بتوانێت چارەیەکی بکات. دەیانگوت کاتێك کە کوڕەکەی دەچوو بۆ سەربازگە، ئەو بەنهێنی پیشوازیی لە

هەندێ دۆست و بنارۆی لاو دەکرد.. لاوی زیاترو زیاتر –ئەمەش جاری یەکەمی نەبوو، لەکاتی لە جحێلیشیدا، کاتێك کە مێردەکەی مابوو، ئەو هەر بەو حاڵە بوو. ئەمە دەنگو و قسەو قسەلۆك و بەزمانی خەلکی بوون تەنانەت هەندێك شەو گوێم لە دەنگی هەنگاوەکانی ژەنەراڵ و دواییش جیڕە جیڕی دەرگاکە دەبوو.. دەنگێکی وشکی وەك تەقەی دەمانچە لە گوێمدا دەزرنگایەوە، ئەوسا لە نێو ئەو بێ دەنگییە ترسناك و بەسامەدا، دەمزانی کە شەرەفی ماڵەکە وەدەست هاتۆتەوەو خەونەکانیش وشکیان کردووەو لەبن هاتوون. لەو ماوەیەدا پەرداخێك بەتاڵ نەدەبوو کە خێرا پەرداخێکی دیکە جێی دەگرتەوەو کیکیلیاش کە دەتگوت بەسەر کورسیە تۆزاویەکەوە داکوتراوە، بێ پچڕانەوەو کۆتایی هەر سەیری تەلەفزیۆنی دەکرد.

سەر لە بەیانییەك گوێمان لە دەنگی شووتی پیاوانی ئاگرکوژاندنەوە بوو و گەڕەکەکە گشتی شڵەژاو دوای ئەوەی کە پاش نیوەڕۆ گەڕامەوە ماڵەوە، زانیم کە کاتێك خانمی ژەنەراڵ لەسەر کورسیەکەی بۆرژەی بردۆتەوەو تەلەفزیۆنەکەش داگیرساوە، هەر لە سەعاتی یەکەمی سەر لە بەیانییەوە ئاگر دەوری شوقەکەی داوەو دوای ماندوو بوون و زەحمەتێکی زۆر، ئینجا توانیویانە ماڵەکەو ژنە کلۆلەکە رزگار بکەن، بەلام سووتانی ژنەکە پلە دوو بووە.

دەیانگوت سەرەڕای ئەوەش، ژنەکە هێشتا هەر زیندووە، بەلام بێگومان ئێستا زۆر پیرەو تەنیاشە. هەرگیز نایەتە دەرێ و هەرچۆنێك بێت دەرفەتێك بۆ

مەی خواردنەوە دەدۆزێتەوە ئەگەر لێشی قەدەغە بکرێت. لە ئێوارانی زستاندا، کاتێك کە دەنگە دەنگی شەقام هێدی دەبێتەوە، گوێ هەڵدەخەم، وام بە خەیاڵدا دێت کە گوێم لێیەتی، ئەو بە تەنیا وەك سەگی مێردەکەی دەلوورێنێ. کە دەشنووسم دەنگی شووتی پیاوانی ئاگرکوژاندنەوەو گرمەگرمەی مەکینەکانیان تێکەڵ بە یەك دەبن و ئینجا بەخەبەر دێم و کاتێك کە شەلالی ئارەقە بووم، لەسەر مێزەکەم لە بەرامبەر دەقێکدا دادەنیشم کە دوێنێ لەسەری وەستاوم و تەواوم نەکردووە. هەوڵ دەدەم بزانم گەیشتوومەتە کوێ.. دەپرسم لەوەی کە تۆ بڵێی پێم تەواو بکرێو چۆن تەواوی کەم.. بەردەوام ئاوڕ لە پەنجەرەکە دەدەمەوە، هەوڵی تەواوی ئەوە دەدەم کە پەی بەو تاریکییەوە ببەم کە شەقامەکەی داپۆشیوەو لە نهێنییەکەی بگەم.

لە راستیدا هەر لەوێیە، ئەو ماڵە کۆنەی دار ئەرووکارییەکە سێبەری بۆ کردووە.. ماڵەکە بە رازاندنەوە ئەندازەیی‌یەکانی کە لە بەرە بەیاندا دەچریکێنن و باڵکونە بە لۆچ لۆچ رازێنراوەکەی، هەلگری تەختەی وێنەکیشانەکەش هەر لەوێیە، لە سێبەرەکەدا چاوەڕوانی دەکات لەبەر خۆری دوای نیوەڕۆ کە خەریکە لە پشت چیای (ئیگالیق)وە، دوای ئەوەی گەیشتووەتە ئەوپەڕی بەرزی، شۆڕدەبێتەوە، هەندێك سێبەرو رووناکی دەبینم دەجوولێنەوە، هەڵدەستم، جلەکانم لەبەر دەکەم، قژم دادەهێنم و بەوپەڕی چالاکییەوە خۆم ئامادە دەکەم لە پلیکانەکان بچمە خوارێ.. ئاخر هێشتا بانگهێشتەکەی خانمی ژەنەراڵم هەر لەبیرە.

کورتە چیرۆک

# "پیاوێکی چاو شووشەیی"

■ موسا بەیدج

● و. لە فارسییەوە: شاکۆ غەریب

پیاوێك لەگەڵ یەکەمین تاڵە ڕووناکی‌دا، لە مەرگی خۆی بەئاگاهاتەوە. ئەو شەوی پێشتر مردبوو. لەوانەیە بۆ سەفەری مەرگ چووبێت، بەڵام لەم کارەیدا هیچ چارەیەکی نەبوو، نە زەردەخەنەیەك گرتی و نە ڕووشی گرژ کرد. لەسەر پێخەفە پەژموردەکەی خۆی دانیشت. بەهێمنی پەتۆ چرچ و لۆچەکەی قەدکرد. بە میهرەبانییەکەوە ڕوانی‌یە ئەو ژنەی لەسەر پەلاسێکی ڕەنگ پەڕیو نووستبو. پەلکەکانی ڕەنگێکی زیوینی ماتیان هەبوو.

دەنگێك لە هەناوی پیرەمێرد هاتە دەرەوە:

–شیلان! هۆ شیلان! هەستە بەیانی‌یە، ئیمڕۆ ڕۆژێنی.

ژن جووڵەی نەکرد. پێڵوەکانیشی لە یەکتر جیانەکردەوە، لە ڕوخسارییدا ئاوێنە شکاوەکان دیاربوون. نواساتەکانی جوانی‌یە بە خاك سپێردراوەکەی بە سیمایەوە ئەدرەوشانەوە. لە کەسێك دەچوو لە شەمەندەفەرێك بەجێمابێ و، هەرچی هاوارو دادی کردبێت کەسێك بە هانایەوە نەهاتبێت. ئەم ژنە لەسەر ڕووی دواهەمین پلەی ژیان ڕاکشابوو. پیاوەکەش فانیلەیەکی عەلاگەی نیوداشتی لەبەردا بوو، پەراسووەکانی بە ئاسانی ئەژمێردراو؛ ئێسقانە ئاسن ئاساکانی لەشی بە پێستێکی چرچ داپۆشرابوون. هەموو تایبەتمەندێتی‌یەکانی مردنی تیابوو، بەڵام نەدەمرد. پێدەچێت چەند جارێکیش مردبێت.

پیرەمێردی گڕە بردو، لە هەناسەیدا باغێکی سووتاو ئەدرەوشایەوە. بە دەنگێکی بەرزتر هاواری کرد:

–شیلان! پێم نەگوتی درەنگە؟

نیگای پیرەمێرد بەسەر پەنجەرەکەوە نیشتەوە. بەهار لە پشت پەنجەرەکەوە هەڵکورمابوو، دەیڕوانیە دیمەنی پیاوەکە. لە بیری بوو کە ساڵانی ڕابردوو

پیرەمێرد، چەندین جار ئەوی بۆ ژوورەکەی داوەت کردبوو. بەڵام وا ماوەیەکی زۆرە لە پشت دەرگای خەمناکەوە، راوەستاوەو شاڵ گەردنی دارەبی‌یەکە بۆ پیرەمێرد هەڵدەتەکێنێت. بەڵام پیرەمێرد وەك بڵێی چاوەکانی بووبن بە شوشە، تەنیا جارێکیش تەماشای نەکرد. لەوانەیە تەماشاشی کردبێت بەڵام نەیناسیوەتەوە.

پیرەمێرد وەك بڵێی یادگارێکی هاتبێتەوە یاد. پیَ لەرزۆکەکانی کۆکردەوەو هەوڵی دا بەهۆی دەستەکانیەوە هەڵسێتە سەرپێ، زۆری هەوڵدا بەڵام نەیتوانی. لە ئاکامدا بە سکەخشکێ خۆی گەیاندە ئەو گاڵۆکەی لای پێخەفەکەیەوە هەڵیپەساردبوو، گرتی بەدەستی‌یەوە، جارێکی دی لەسەر پێخەفەکەی دانیشت و چەند جارێك گاڵۆکەکەی کێشا بە دیوارەکەی پشت سەریدا. ژنەکەش چاوەکانی هەڵهێنا. چاوەکانی دوو شەوی هێند درێژ بوون کە دەتوانرا لە ناویاندا تەمەنێك بەسەر ببرێت. پیرەمێرد ئەوەی هاتەوە یاد، کە لەناو ئەو چاوانەدا ساڵانێکی زۆری بەسەر بردووە. دەنگی میهرەبانتر کرد:

–شیلان! ئەگەر بێن و ئێمە بەم شێوەیە ببینن، دڵنیام خەمبار دەبن. ئێمە نابێت بهێڵین خەم بخۆن. خێراکە، دەمەوێت باخچەکە شانە بکەم. بە راست دوێنێ ئاوو ئالفت دا بەمەڕەکە؟

ژنەکە هیچی نەگوت. بەڵام دوو شەوی درێژی لە جیهانی ژوورەکەدا شاردەوە. شنەی شەماڵێك لە دۆڵە دوورەکانەوە دەهات. لە ژنێك دەچوو مێردەکەی مردبێت و بلاوێتەوە. ژنەکە چاوەکانی کردەوەو پیرەمێردی پێچا لە عەباکەی شەوەوە. پیاوەکە چیتر تێی نەڕوانی. پەنای بردە بەر گۆچانەکەی و بە سستی‌یەوە هەستایە سەرپێ. جەستەی هێندە لاواز ببوو لەوە دەچوو خەمی هەموو هۆزی گرتبێتە کۆڵ. بە گۆچانەکەی بەرەو لای پەنجەرەکە رۆیشت. ئەو پەردە گوڵدارەی عەیامێ بوو مردبوو، بەڕوی پەنجەرەکەدا، دایدایەوە. گوڵەکانی پەردەکە چەندین ساڵ بوو مۆمیا کرابوون؛ ئیتر لە هیچ پێدەشتێکدا گوڵە وەنەوشە ناڕوێت. پیرەمێرد دەستی بردو پەردەکەی لادا. بەهار لەودیو پەنجەرەکەوە بە نیگایەکی خەماوی و دیدەیەکی پڕ لە حەسرەتەوە، دەیڕوانیە پیرەمێرد. پیرەمێرد هیچ تەماشای نەکرد. لەوانەیە تەماشاشی کردبێت، بەڵام ئەوی نەدیبێ. هەڵگەڕایەوەو بەرەو لای ژنەکە هەنگاوی نا. ژنەکە هەروا بێ جووڵە لەسەر پێخەفەکەی کەوتبوو.

پیرەمێرد وتی:

–شیلان! ئیتر ناڕەحەتیی پێ ناوێ. ئیمڕۆ دێن و ئێمەش دڵنیا دەبین. بە راست رانك و چۆغەکەم لە کوێیە؟! ئەزانیت کامە ئەڵێم؟ شینکی‌یەکە! تۆ ئەو رانك و چۆغەیەت چەند خۆش دەویست. دەزانیت ماوەیەکی زۆرە لەبەرم نەکردووە؟

ژنەکە هیچی نەگوت! لەوانەیە شتێکیشی گوتبێت، بەڵام کەس نەیبیستبێت. تەنیا دووجار پێڵوەکانی دا بەیەکداو پیرەمێردی نوقمی ناو تاریکی کرد.

پیرەمێرد بێدەنگ بوو، بێدەنگی دەیەها سەدەی لەگەڵدا بوو. نە زەردەخەنەی گرت و نە گرژ و مۆنیش بوو. بەڵام زایەڵەی پێکەنینێکی دوور لەسەر لێوەکانی نیشتەوە.

وتی:

–شیلان! تۆش دەبێت ئەو کراسە گوڵ وەنەوەشەیی‌یە لەبەرکەیت. خۆ دەزانیت کامە دەڵێم؟ بەڕاست. ئەسپە شێی منت لەبیر ماوە؟ خوایە گیان، چ ئەسپێك بوو، نەء، نەء، لە راستیدا ئەسپ نەبوو کێوێ بوو، وەکو پیرەمەگروون.

پیرەمێرد پاشماوەی یاداشتەکانی سپارد بە گەنجینەکەی سنگی. نیگای ماتی بڕییە پرچە زیوینی‌یەکەی شیلان. تاڵگە زیوینیەکەی گەلی عەلی

بەگی هاتەوە یاد، کە ئاوە بەفرینەکەی بەسەر گابەردەکاندا، بازی ئەدا، لەو لاشەوە جوانو ئەسپێکی لێ بوو، کێوەکە حەسادەتی بە شانە مەغرورەکانی دەبرد. پیاوەکە باوەشێك ڕێواسی چنی بوو، بە پشت زینی ئەسپەکەیەوە دایبەستبو.

پیرەمێرد وتی:

–شیلان! بۆنی ڕێواس چەند خۆشە. بەلام نەء. ئیمڕۆ ناڕۆم، ئاخر ئەوان دێن. نامەوێت کە هاتن لە ماڵ نەبم.

پیرەمێرد چاوەکانی بڕییە تاقگەکە، هەناسەیەکی سارد لە قولایی سینەیەوە هاتەدەر. خیزە خیزی سنگی، لە دەنگی پسێی قرژاڵ دەچوو. بە زەحمەت پەنای بردە بەر گۆچانەکەی و بەرز بووەوە. بە هەنگاوە سەنگینەکانی بەرەو لای دۆلابە کۆنەکە ڕۆیشت. دۆلاب یاداشتەکانی بەڕێ کرد. دەستی برد، دەرگای دۆلابەکەی کردەوە. دەنگی مۆسیقایەکی نارێك و پێك خۆی لە ئاسمانی ئاسێنراوی خانووەکەوە ئاڵاند. بۆنی یاداشتە شێدارەکان لەناو دۆلابەکەوە دەگەیشتە لووتی.

پیرەمێرد دەستی درێژ کردو بوخچەیەکی دەرهێنا. بوخچەکە بە باسمە چنرابوو. بە دەزووی ڕەنگاو ڕەنگ نووسرابوو: "بە یادی شیلان، بە یادی کوردستان" پیرەمێرد بوخچەکەی نزیك کردەوەو بۆنی بەهاری تەمەنی خۆی کرد. لەسەر بوخچەکە سیمای لاوێکی بینی لە زیندانی ئینفیرادیدا دانیشتبوو، بوخچەیەکی بە باسمە دەچنی. بە دەزووە ڕەنگاو ڕەنگەکان لەسەر بوخچەکە دەینووسی "بە یادی شیلان، بە یادی کوردستان".

پیرەمێرد لە بەرامبەر لاوەکەدا، کەمێك واقی وڕما. بەلام حەوسەڵەی نەماو بە دەستەکانی شەپۆلێکی بە یاداشتەکانی داو تێکەڵ بە یەکتری کردن.

شیلان ڕاکشابوو. نەپێدەکەنی و نەگرژو مۆنییش بە ڕوخسارییەوە دیار بوو، چەرچەفێکی گوڵداری دابوو بەسەر خۆیدا. گوڵەکانی سەر چەرچەفەکە باخێکی پاییزی بوون. لە هەناوییدا ئاشووبێك هەڵگیرسابوو. دوو شەوی ڕەشی بە باڵای شواندا هەڵواسیبوو. پیرەمێرد لە ڕێبوارێکی دڵشکاو دەچوو. هەموو شەوێ دەڕۆیشت و بەیانیان بە دڵشکاوییەوە دەگەڕایەوە. چاوەڕوان بوو. شیلان کەمێك زیندوو بوو، چاوەکانیان بەهاریان هێنایەوە یادی. حەزی دەکرد بەرەو لای پەنجەرەکە بڕوات و هەتاوی نیوەڕۆی هاوین بۆ نان خواردن داوەت بکات.

پیرەمێرد تەماشای ڕانك و چۆغەکەی کرد. لە پشت پەنجەرەکەوە بوو. پەردە گوڵدارەکەی لادا. نیوەڕۆیەکی هاوین بوو. گەرما لە ژێر دارە بییەکەدا شانی دادابوو، حەزی دەکرد پیرەمێرد هەروەکو هاوینەکانی رابردوو، بانگ بکات بۆ ژوورەکەی و بەدەمییەوە پێبکەنێت. ڕان و پۆی چۆغەکەی هەم شیی ببوونەوەو هەم نمووشیان نەمابوو. مۆرانە دابویە چۆغەکەی. پیرەمێرد ئاوڕی دایەوەو بە حەسرەت بارییەوە وتی:

–شیلان! لەعنەتییەکان داویانەتە چۆغەکەم. ئاخر بۆچی نابێت ئەم چۆغەیە لەبەر بکەم؟ ئەگەر ئێستا بێن من چی بکەم؟

کەسێك لە دەروونی پیرەمێردا هەنسك دەدا، پێدەچێت ناڵە ناڵی بەختەکەی بێت. پیرەمێرد مێدی.. هێدی بەرەو لای تاقەکە ڕۆیشت. سەعاتە خەوتووەکەی هەڵگرت، سەعات مردبوو؟ لە کاتێکی شوومدا مردبوو. ئەو کاتەی بادەمە تاڵەکان بارییبوون. سەردەمیان سپاردبوو بە خاك و خۆڵەمێش.

پیرەمێرد وتی:

–شیلان! ئیتر کاتی هاتووە. وا خەریکن لە گردەکەوە سەر دەردێنن. تەماشاکە، بزانە لە پەنجەرەکەوە دیارن؟

ئەو تەرمی سەعاتەکەی بەدەستەوە بوو، لەسەر تاقەکە داینا. چاویلکە شوشە شکاوەکەی بینی، ئاهێکی ساردی هەڵکێشا. ئاخ، کۆترێکی ماڵیی بوو، لە سنگیدا هێلانەی کردبوو. پیرەمێرد وەك بڵێی گوێی لە دەنگێك بوویێت، هەڵوێستەیەکی کرد. بە ساردییەوە وتی "من دەمزانی، وتم خێراکە! ئەوەتا دەنگی پێیان دێت".

بە زەحمەت بەرەو لای پەنجەرەکە وەرچەرخا. بەلام هێشتا پەردەکەی لانەدابوو. بەبێ ئەوەی بڕوانێتە ژنەکە، وتی: "من خۆم وتم. ئەگەر ئێمە ئاوا ببینن خەمبار ئەبن، نابێت بهێڵین خەم بخۆن". پاشان بەخێرایییەکی پیرانە، پەردەکەی لادا. لەودیو پەنجەرەکەوە کەس دیار نەبوو. بایەکی پاییزی لەژێر سێبەری دار بییەکەدا، دانیشتبوو. حەزی دەکرد پیرەمێرد پەنجەرەکە بکاتەوەو بانگی بکاتە ژوورەوە. ناڵەی گەڵاکان بە لقەکانەوە دەهات. هەورەکانیش لە ئاسماندا دەسوڕانەوەو شێوەی باڵندە مردووەکانیان دروست دەکرد.

شیلان لە جێی خۆی و بێ ئەوەی جووڵە بکات راکشابوو. پرچەکانی زیوییەکی کەم رەنگ بوون. دوو شەوی درێژ لە ژێر پێڵووەکانیدا چرپەیان دەهات. لەگەڵ خۆیدا بیری دەکردەوە: "ئاخ، ئەگەر دەیزانی!"

پیرەمێرد جەستەیەکی ماندوو بێ هێز بوو. ڕۆحیشی رەنجی زۆری دیبوو، باخێك لە دەنگیدا مردبوو. لە پەنجەرەکە دوورکەوتەوە. وتی: "دیارە لەولاترن، هەوا کەمێك خراپە، دیارە هێواش، هێواش دێن".

لە دەرەوەی ماڵەکەیان بەفر باریبوو. پیرەمەگرون وەك پیاوێکی بەهێز لەژێر زریانی بەفردا، شانی دادابوو. زستان ئارەزووی دەکرد پیرەمێرد پەنجەرەکە بکاتەوەو بیباتە نزیك زۆپاکەوەو دایینیشێنێت. پیرەمێرد هاتە پشت پەنجەرەکەوەو پەردەکەی لادا. بەلام کەس دیار نەبوو. شیلان راکشابوو. پرچەکانی زیو بوون. دوو شەوی درێژ لە ژێر پێڵووەکانییدا بوون. مۆرانەکانیش هەموو شتێکیان خواردبوو.

*تێبینی:*

*موسا بیدج، یەکێکە لەو کوردە فەیلییانەی کە چەندین ساڵە لە عێراق دەرکراون و چوونەتە ئێرانەوە، هەرچەندە کوردستانی نەدیوە، بەلام بە رۆح لە گەڵییدا ئەژیا، ئەم چیرۆکەی بۆ هەڵەبجە نووسیوەو لە گۆڤاری "سروش" بلاوی کردەوەو منیش ساڵی 1990 کردم بە کوردی.*

# سێ پارچە شیعری بیانی

● و. لە ئینگلیزییەوە: شێرزاد حەسەن

## "میتافۆری کەمایەتی‌یەکان"

شیعری: نۆون دۆدسن

ئەم بەفرە زوو ئاتوێتەوە چون باڵندەکان جێیان هێشت

لەو هەموو درزەوە کلوو کلوو دێنە خوار

باڵندەکانیش دەنێو گەرووياندا زستان تام دەکەن

سەرسامن.. ئاخۆ وەرزە گەرمەکان بۆ کوێ چوون؟

باڵەکانیشیان هیچ ئاراستەیەک نازانن

* * *

هەر هەموو رەوە مەلەکانی دیکە کۆچیان کرد

زستانیش هەر هەموو نیشانەکانی لارێگاکانی داپۆشی

هیچ ئاماژەیەک نەما.. هیچ ئاراستەیەک

هەموو شتێک وەک.. تەنیا

* * *

بۆچی گوڵەکانی سەر چڵەکان ئەوەندە سپین؟

بۆ ئەو گوڵانە ئەوەندە ساردن؟

دووکەڵ وا دەنێو ئەو دووکەڵ کێشانەی کە هێشتا گەرمن

ئاسمانیش چ نزم و تاریکە لەو گەوەڕو عەمبارانەدا
هەودای تەونی ئاڵۆزی جاڵجاڵۆکەکانیش باریکترە لە لقەکان
ئەوانە هەرگیز شوێنی چرینی ستران نین.. نە شوێنی حەوانەوەشن
قەتیش "کا.. و پوش و پەڵاش" بۆنی هێلانەکانی لێ نایە
سترانەکانیشیان هەروەکو موعجیزەیەکی بەستوو..
دەبنە سەهۆڵ لە هەوادا
ئەو پەڵە رەش و چکۆلەو زەقانەش..
کە لەسەر کێڵگەکان دەیانبینین..
هیچ کامیان سێبەر نین.

*سەرنج:* کەم و زۆر ئەم هۆنراوەیە لەژێر کاریگەری بزافی ئەدەبی "دادائیزم"ەوە نووسراوە.

## *"من وا هاتم"*

***شیعری: فیلیپ لامانتشیا***

تا لای ئەو مانگەی شەپۆلان دەدا
من کەوتوومەتە دوای ئەو شۆخە
تا لای ئەو پردەی درێژ بۆتەوە بەسەر ئاوو..
رووبەڕووی ئاوایی
رووەو ئەو دۆڵانەی پڕن لە وێرانەی جوان و..
خانوو و بەرەی سووتاو
دەکەومە دوای تا لای ئەو گوڵە مردووانەی نێو ئاوێنەی خۆشەویستی
تا لای ئەو پیاوانەی چرکە کێوییەکانی ئەو کاتژمێرە دەخۆن
بۆ لای ئەو دەستانەی دەنێو گیرفانە خواهانەییەکاندا دەگەڕێن
رووەو ئەو ژوورە تاریکەی زیندان
کە پڕە لە چریکەی ئەو جحێڵانەی بۆ مانگ گۆرانی دەچڕن

* * *

هەرکە خۆر هەڵدێ

ئەو شۆخە دەچێتە ئاسمان و لەوێ دەژی

سەراپاشی غەرقە لە خوێنی پاساری

لە ژێر سیپاڵێکی هەلاهەلادا

زۆر کۆن و پەرپووت.. هی سەردەمێکی تر

* * *

وەلێ من وا دێم.. رووەو مانگ

ئەو شۆخەش لە شەوێکی پڕ خرۆشی مۆسیقا

مۆ لەوێ چاوەڕێم دەکا

لە شەوێکی پڕ لە قاقاو پێکەنینی سووتاو

سووتاو وەک رێگەیەکی ناو مێشکم

کە هەردوو باسکی دەنێو دەریاچەیەکی زیویندا..

نوقم دەکا..

(1943)

*سەرنج:*

*ئەم هۆنراوەیەش لە کاریگەری "دادائیزم" بەدەر نییە.*

*سەرچاوە:*

*ئەم دوو هۆنراوەیە لەم کتێبە وەرگیراون:*

***View, Parade of the Avant- Garde***

*چاپی یەکەم/ 1991*

***Charles Henri Ford: Editor***

## "سترانی بەهار"

شیعری: بریان پاتن

تا دوێنێش وام دەزانی کە درەخت شتێکە سروشتی
تا ئەو حەڵەی حەوت کچ چوونە نێو لق و پۆپەکانی
لەژێر جلی مەلەی رەنگ پرتەقاڵی
بە دەم قاقاو قریوەوە جلیان لەبەر یەکدی دادەکەند
تا وای لێهات سینەو مەمکیان بێنە دەرو بکەونە خوارێ
چواردە گۆی مەمکیش بەدەم بای غارەوە
خۆیان لە لقەکان هەڵدەسوویی
منیش لە پشت پەنجەرەوە تێم دەڕوانی
هاوارم کرد:
"هێی.. بەسەر ئەو درەختەوە خەریکی چین؟"
یەکەمیان وتی:
"گەرەکمانە بە قسەی شیرین وا بکەین چرۆ سەوزەکان بەر لە وادەی خۆیان سەر دەربێنن"
دووەمیان لە درەختەکە هاتە خوارێ..
سەیری پێ هات کە قاوەیی بووە هەر هەموو ئازای جەستەی
بە رووتی لەسەر چڵ و چێوی مردووی سەرخۆڵەکە.
بۆ کاتژمێرێك یان پتر راکشا
کە هەستا شێوەیەکی سەیر بوو
لە گیای سەوزو گەش
لە سەرەتای دەرکردنی گوڵی بەهار

* * *

من پرسیم:
"تۆ بەهار– یت؟"
وەڵامی دامەوە:
"بەڵێ.. ئەوانی دیکەش.. هەر هەموو بەهارن"
دەبوو مەزەندەی بکەم.
دەنا چ وەرزێك هەیە ئەو هەموو "رووتی"یە.
بەرەڵڵا بکا؟

* * *

پاشان هەر هەموو شۆخەکانی دی
لە پەنجەرەوە لێم هاتنە ژوورێ
هەرچی تۆزو خۆڵی ژوورەکە بوو.. هیچی نەما
ئەوان کۆمەڵێ باڵخەوانی شادومانن
بەو باڵا بەرزەوە دەنووشتانەوە
تا پڕ بە عەرەبانەکان خەم باربکەن و
لە شوێنێکی دیکە هەڵیرێژن

* * *

ئەوان بەناو ئێمەدا تێ دەپەڕن
تەماسمان جوانتر دەکەن
جوانیشیان لە رادەبەدەرەو..
بە جوانترین مۆبێل بەراورد ناکرێ
ئەوان دڵمان دەبەن و لە شوێنێکدا دەیشۆن
لەهەر ژوورێکدا وەناگا بێین
جگە لە خۆشی هیچ نابینین
لەو وڵاتەدا هەر هەموو یەکدیمان خۆش دەوێ
کە تیایدا جووتەکان بەخۆشی‌یەکەوە..
دەدرەوشێنەوە
لە هەمووان شێتتریش
دەنێو لەشی خۆیدا
بەڵێنێك بۆ خۆشی خەنین و قریوە..
دەدۆزێتەوە

سەرچاوە:
The Irrelevant song
London, UNWIN PAPERBACKS
لاپەڕە (55)

# گفتوگۆ

- فەلسەفەو ئەدەب لە گفتوگۆیەکدا لەگەڵ ئایریس مێردۆک دا

سازدانی: برایان ماگی

- لەگەڵ کامیلۆ خۆسە سێلادا

# فەلسەفەو ئەدەب

## گفتوگۆ لەگەڵ ئایریس مێردۆک دا

■ برایان ماگی

● و. لە فارسییەوە: ئازاد بەرزنجی

*سەرەتا:*

**ماگی:** هەندێ لە فەیلەسووفە گەورەکان نووسەری گەورەش بوون، بەو مانایەی هونەرمەندی ئەدەبیی گەورەش بوون، کە لەو بڕوایەدام دەتوانین وەکو نموونەی دیاریان ناوی ئەفلاتون و ئۆگستینۆسی قدیس و شۆپنهاوەرو نیچە بەرین. هەندێکی تریش هەن گەرچی تەواو وەکو ئەمانە نین؛ بەڵام بێگومان بە نووسەری باش دەژمێردرێن. لەمانەش ناوی دیکارت و پاسکال و بارکلی و هیوم و رۆسۆ بە زەینماندا دێ.

لەم سەردەمەشدا بێرتراند ڕاسڵ و ژان پۆڵ سارتەر هەردووکیان خەڵاتی نۆبڵیان لە ئەدەبدا وەرگرت. لەگەڵ هەموو ئەمەشدا، فەیلەسووفی گەورەشمان هەبووە کە نووسەری خراپ بوون، کە دووان لە گەورەترینیان کانت و ئەرستۆن، کەلە هەمانکاتدا بەخراپترینیشیان دەژمێردرێن. ئەوانی تریش، وەکو ئەکویناس و لۆک لەم ڕووەوە لەوان باشتر نین.

پاشان هیگل دێ؛ کە نووسینەکانی لە ڕووی ناڕوونی و ئاڵۆزییەوە قسەیان زۆر لە سەرەو جێی گاڵتەن و، من لەو بڕوایەدام کە خوێندنەوەی کارەکانی هیچ یەکێك لە نووسەرانی بەناوبانگی دونیا هێندەی خوێندنەوەی ئەو دژوار نی‌یە.

ئەم نموونانە ئەوە پیشاندەدەن کە فەلسەفە خۆی لقێك نی‌یە لە لقەکانی ئەدەب و، چۆنێتی و گرنگێتی‌ی فەلسەفە لەسەر بنەمای تری جیا لە بەها ئەدەبی و هونەرییەکان دادەمەزرێ. خۆ ئەگەر فەیلەسووفێك توانای نووسینی باشیشی هەبێت، ئەمە دەبێتە تایبەتمەندیەکی زیاتر بۆ ئەوو تەقەلایەکی زیاتر بۆ خوێندنەوەی، دەنا ئەوە ئەو ناکات بە فەیلەسووفێکی باشتر. من لە سەرەتاوە

بەشێوەیەکی بنبڕانە ئەمە دەڵێم، لەبەرئەوەی لەم مەڤپەیڤینەدا دەمەوێ لەگەڵ کەسێکدا کە ئەزموونەکەی هەردوو جیهانەکە (فەلسەفەو ئەدەب) دەگرێتەوە؛ لە هەندێ لایەنی بەنێویەکداچووی فەلسەفەو ئەدەب بکۆڵمەوە. ئایریس مێردۆك ئەمڕۆ رۆماننوسێکە کە ناوبانگێکی جیهانیی هەیە، بەڵام ساڵانێکی زۆریش بەر لەوەی ببێتە رۆماننووسێکی سەرکەوتوو -تەنانەت تا ماوەیەك دوای ئەوەش، کە بە هەموویەوە پانزدە ساڵێك دەبێت- لە زانکۆی ئۆکسفۆرد مامۆستای فەلسەفە بووە.

*ماگی: لەو کاتانەدا کە لە سەرێکەوە رۆمان دەنووسیت و لە سەرێکی تریشەوە بابەتی فەلسەفی، ئایا هەست دەکەیت کە خەریکی دوو جۆر نووسینیت کە لە بنج و بناوانەوە لەیەك جیاوازن؟*

**مێردۆك:** بەڵێ؛ هەست دەکەم. ئامانجی فەلسەفە ڕوونکردنەوەو بەیانکردنە، کۆمەڵێك مەسەلەی زۆر دژوارو زۆر تەکنیکی دەخاتە ڕوو و مشووری چارە دۆزینەوەیان دەخوات، نووسینیش دەبێ پەیڕەوی لەم ئامانجە بکات. دەتوانین بڵێین کە فەلسەفەی خراپ لە بنەڕەتدا ناتوانین بە فەلسەفەی لەقەڵەم بدەین، لە کاتێکدا هونەری خراپ هەر بە هونەر دەژمێردرێ. بەهەموو ڕێگە جۆراوجۆرەکان لە گوناهەکانی ئەدەب خۆشدەبین، بەڵام گوناهەکانی فەلسەفە نابەخشین. خەڵکانێکی زۆرو جۆراوجۆر ئەدەب دەخوێننەوە؛ بەڵام ژمارەیەکی کەم لە خەڵکی فەلسەفە دەخوێننەوە. هونەرمەندە جیدییەکان خۆیان ڕەخنەگری خۆیانن و عادەتەن بۆ کەسانی "پسپۆڕ" نانووسن. لێرەوە، هونەر چێژەو بۆ چێژ بەخشینیش گەلێ ئامرازی سەرنجڕاکێشانی هەیە. ئەدەب لەسەر کۆمەڵێك ئاستی جیاوازو بەشێوازی جۆراوجۆر سەرنجی ئێمە بەلای خۆیدا ڕادەکێشێت. پڕە لە تەکنیك و کارامەیی و سیحرو نهێنیئامێزی و سەیروسەمەرەیی گشتی. ئەدەب خەڵك سەرگەرم دەکات و گەلێ کاری تریش دەکات؛ بەڵام فەلسەفە یەك کار زیاتر ناکات.

***ماگی:** من چەند کتێبێکم خوێندۆتەوەو، لە نێویاندا کتێبە فەلسەفییەکانی تۆش و، وای دەبینم کە تەنانەت ڕستەکانیش لەگەڵ یەکدا جیاوازییان هەبێت. لە رۆمانەکانتدا ڕستەکان ڕوون نین، واتە پڕن لە مانای دوولایەنەو ئاماژەو تەمومژ؛ لە کاتێکدا لە نووسینە فەلسەفییەکانتدا ڕستەکان ڕوونن؛ لەبەر ئەوەی یەك شت دەڵێن.*

**مێردۆك:** بەڵێ. نووسینی ئەدەبی هونەرە، لایەنێکە لە بوارە هونەرییەکان. دەشێ ڕاسنگۆیی تیا بێت یان پڕ جیلوەو سەرسامکەر بێت، بەڵام ئەگەر ئەدەب بێت؛ ئەوا مەبەستی شیرینکاریی تیایەو، دەبێ زمان تیایدا بە شێوازێکی پڕ شەوق بەکار بهێنرێ و ببێتە بەشێك لە خودی "کار"ەکە، ئیدی ئەو کارە درێژ بێت یان کورت. هەر بۆیە تاقە شێوازێکی ئەدەبی یان هیچ جۆرە شێوازێکی ئەدەبیی نموونەیی نییە. هەرچەند بێگومان نووسینی باش هەیەو نووسینی خراپ هەیە، هەروەها بیرمەندانێکی گەورەی وەکو کیرکیگارد و نیچە هەن کە لە هەمان کاتدا نووسەری گەورەش بوون، بەڵام من ئەوانە بە فەیلەسووف نازانم. بێگومان فەیلەسووفەکانیش هەموو وەکو یەك نین و، هەندێکیان لە هەندێکی تریان "ئەدەبی" ترن. بەڵام من وای بۆ دەچم کە جۆرە شێوازێکی فەلسەفیی نموونەیی هەیە کە جۆرە سادەیی و توندوتۆڵییەکی بێ تەمومژی تیایە، شێوازێکی ڕێك و ڕاست و وشك و بێ باق و بریق و دوور لە خۆ بە گەورە زانین. فەیلەسووف دەبێ هەوڵبدات بە وردی ئەو شتە ڕوون بکاتەوە کە بیری لێ دەکاتەوە و لە شێوازی وتاریبێژی و باق و بریق و ئارایشتی بێهوودە بیپارێزێت.

بەڵام کاتێ فەیلەسووف لە سەنگەری پێشەوەی توێژینەوە لە بارەی کێشەیەکە، بە ڕای من بە دەنگێکی ساردو ساف و ئاشکراوە دەدوێت.

***ماگی:** بە دڵنیاییەوە دەبێ بڵێین کە ژمارەی ئەو کەسانەی لەسەر ئاستی پیشە سەرگەرمی هەردوو ئەم کارانەن زۆر زۆر کەمەو بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن. تۆ یەکێکیت لەو کەسانەی لەسەر بناغەی ئەزموونی خۆت دەتوانیت جیاوازیی نێوانیان باس بکەیت. ئایا دەکرێ کەمێك زیاتر لەم بارەیەوە بۆمان بدوێیت؟*

**مێردۆك:** نووسینی فەلسەفی بە مانای دەربڕینی هەست و سۆزەکانی ناودڵ نایەت؛ بەڵکو دەبێ ئەو دەنگە تایبەتیە لە فەلسەفەدا نەبێت. هەندێ لە فەیلەسووفەکان کەسێتیی خۆیشیان لە کارەکانیاندا ئامادەیە. بۆ نموونە هیوم و ڤیتگنشتاین؛ هەریەکەیان بە جۆرێکی جیاواز لە یەکدی ئەمەیان کردووە. بەڵام تەنانەت لەم حاڵەتانەشدا فەلسەفەکە خۆی خاوەن جۆرە توندو تۆڵیو پتەوییەکی سادەو ناشەخسییە. هەڵبەت ئەدەبیش پێویستی بە جڵەوکردن و گۆڕینی دەنگی شەخسیی نووسەرە. تەنانەت دەشێ لە نێوان فەلسەفەو شیعردا کە دژوارترین لقی ئەدەبە بەراورد ئەنجامبدرێ. لە هەردووکیاندا جۆرە پاڵاوتنێکی تایبەتیی و دژواری ئەو شتە هەیە کە دەتەوێ بیڵێیت و، هەروەها دەربڕینی هزر بە زمان. بەپێی ئەم وەسفە، جۆرێك لە دەربڕینی هەست و سۆزی ناودڵ هەیە کە لەگەڵ تەواوی گەمەو نهێنیکارییەکانی هونەردا خەسڵەتێکی تایبەت بە ئەدەبە. ئەدیب بە ئەنقەست فەزایەك بۆ گەمەی خوێنەر بەجێدێڵێت. فەیلەسووف نابێ هیچ فەزایەك جێبێڵێت.

***ماگی:** تۆزێك لەمەوپێش وتت کە ئامانجی فەلسەفە ڕوونکردنەوەیەو ئامانجی ئەدەبیش بە زۆری نهێنی سازی و سەرسامکردنە. من وای بۆ دەچم تەوەری کاری ڕۆماننووس و شانۆنووس هەوڵدانە بۆ دروستکردنی وەهم و، تەوەری کاری فەیلەسووفیش هەوڵدانە بۆ نەهێشتنی وەهم.*

**مێردۆك:** ئامانجی فەلسەفە بەدەستهێنانی هیچ جۆرە بەرکەماڵیەك نییە لە ڕووی شێوە (فۆرم)ەوە لە پێناوی خودی کارەکەدا، بەڵام ئەدەب لە ڕووی فۆرمی هونەرییەوە لەگەڵ کۆمەڵێك کێشەی ئاڵۆزدا مامەڵە دەکات و عەوداڵی بەرکەماڵییە. لە هەر لقێك لە لقەکانی هونەردا ڕەگەزێکی هەستپێکراو و کۆنکرێتی هەیە. تەنانەت لە نووسینە پەرش و بڵاوە ئەدەبیەکانیشدا هەستدەکەین ڕووبەڕووی یەك گشت (کل)ی کامڵ بووینەتەوە. زۆرینەی ئەدەب بریتییە لە "کاری هونەری". کاری فەلسەفی جیاوازە. هەندێ جار بە دەگمەن کاری فەلسەفی دەشێ ببێتە کارێکی هونەریش، بۆ نموونە وەکو کتێبی "خوان"ی ئەفلاتون، بەڵام ئەمە ئاوارتێ (استثناء)ەو، کاتێ "خوان" دەخوێنینەوە تەواوی لایەنەکانی تری فەلسەفەی ئەفلاتونمان لەبەرچاوە. تەنانەت وەختێ فەیلەسووف سەرگەرمی ڕوونکردنەوەی بابەتێکە کە لە ڕووی فۆرمەوە زیاد لە پێویست ئاڵۆزە، هێشتا هەر فەلسەفە بە بەراورد لەگەڵ ئەدەبدا بێ فۆرم دێتە بەرچاو. لە فەلسەفەدا ئەوەی پێویستە بیکەین ئەوەیە کە مەسەلەیەك توند بگرین و دەستبەرداری نەبین و لە کاتێکدا کە فۆرمەڵەو ڕێگەچارە جۆراوجۆرەکان تاقی دەکەینەوە؛ ئامادەبین ئەوەی گووتومانە دووپاتی بکەینەوە. ئەنگاری جیاکەرەوەی فەیلەسووف هەمان ئەم ماندوونەبوونەیە لە لێکۆڵینەوەی بەردەوام لە مەسەلەیەك، بەڵام ئەوەی هونەرمەندی پێ دەناسرێ خولیایەتی بۆ گەڕان و پشکنینی نوێ.

***ماگی:** ئەگەر بتەوێ ئەدەب لە فەلسەفە جیابکەیتەوە، هەریەکەیان چۆن وەسف دەکەیت؟*

**مێردۆك:** "پێناسەکردن"ی ئەدەب دەشێ درێژە بکێشێت، بەڵام هەموومان دەزانین ئەدەب چییە: لقێکە لە لقەکانی هونەر کە تیایدا وشە بەکاردەهێنرێ. دەشێ ڕۆژنامەوانیش ببێتە ئەدەب گەر لە هەمان کاتدا هونەریش بێت؛ دەشێ لێکۆڵینەوەیەکیش ببێتە ئەدەب. ئەدەب زۆر چەشناو چەشن و بەرفراوانەو، فەلسەفەش زۆر بچووك. ئەو مەسەلانەی (لە فەلسەفەدا) هەر لە سەرەتاوە گوزارشتیان لێ کراوە بە زۆری هەمان ئەو مەسەلانەن کە ئەمڕۆش بیری ئێمەیان بەخۆیانەوە مەشغوڵ کردووەو، گەرچی زۆر گەورەو فراوانن، بەڵام بە مانایەك لە ماناکان دەتوانین بڵێین کە لە ڕووی ژمارەوە زۆر نین. فەلسەفە کاریگەرییەکی گەورەی هەبووە، بەڵام ژمارەی ئەو فەیلەسووفانەی کە ئەو کاریگەرییەیان جێ هێشتووە لە چاو خۆیدا کەمە، هۆیەکەشی ئەوەیە کە فەلسەفە دژوارە.

***ماگی: ئەو شتەی ئێوە مەبەستتانە سەبارەت بە بەردەوامبوونی مەسەلە فەلسەفیەکان؛ وایتهد بەجۆرێك بەیانی کردووە کە لەبیر ناچێتەوەو وتوویەتی سەراپا فەلسەفەی خۆرئاوا بریتییە لە کۆمەڵێك پەراوێز لەسەر ئەفلاتون.***

**مێردۆك:** بەڵێ، ڕاستە. ئەفلاتون هەر باوکی فەلسەفەی ئێمە نییە، بەڵکو باشترین فەیلەسووفی ئێمەشە. هەڵبەت میتۆدەکانی فەلسەفە دەگۆڕێت، بەڵام ئێمە ناتوانین ئەفلاتون پشتگوێ بخەین و، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە فەلسەفە وەکو زانست پێشناکەوێت. ئەدەبیش پێشناکەوێت، کەس لە هۆمیرۆس باشتر نییە. بە کورتی ئەدەب هیچ جۆرە کارێکی بەردەوامی نییەو، بەم مانایەش بریتی نییە لە "کار". ئەدەب شتێکە کە ئێمە خۆمان بە ویست و مەیلی خۆمانەوە پێی دەخەینە مەیدانییەوەو، بەمجۆرەش دەشێ وەکو یاری وابێت و بەتایبەتیش چەشنەها یاریی خاڵی لەبەرپرسیارێتی. جۆرە ئەدەبیەکان بەلای ئێمەوە خەسڵەتی زۆر سروشتییان هەیەو وەکو بوونەوەری تێڕاماو وان. ئەدەب بەتەنها چیرۆك نییە، بەڵام لە بەشێکی زۆریدا چیرۆك و داهێنان و دەمامك و نواندن و ڕواڵەتی هەڵخەڵەتێن و بەپێزیی خەیاڵ و گێڕانەوە ڕۆڵی خۆیان هەیە. کاتێ دەگەڕێینەوە بۆ ماڵەوەو "بەسەرهاتی ئەو ڕۆژە" دەگێڕینەوە، بەشێوەیەکی پڕ شیرینکاری و لە قاڵبی حیکایەتدا دەیگێڕینەوە (ئەم حیکایەتانەش زۆریەیان زۆر خۆشن). بەم پێیە، دەتوانین بە مانایەك لە ماناکان بڵێین کە هەموومان لەبەر ئەوەی وشە بەکاردەهێنین، بوونمان بە ئەتمۆسفێرێکی ئەدەبیدا تێدەپەڕێت، لەگەڵ ئەدەبدا دەژین، ئەدەب هەڵدەمژین، هونەرمەندگەلێکی ئەدەبین، بەردەوام و بەمەبەستی بەخشینی شێوەیەکی سەرنجڕاکێش و دڵڕفێن بەو ئەزموونانەمان کە لەوانەیە لە سەرەتادا بێزراو و بێ سەرو بەرو ناڕێك بێنە پێشچاو، خەریکی بەکارهێنانی زمانین. ئەم شێوە بەخشینەش تا چەند حەقیقەت تێدەپەڕێنێت، مەسەلەیەکە کە هەموو هونەرمەندێك پێویستە ڕووبەڕووی بێتەوە. یەکێك لە ئەنگێزە قووڵەکان بۆ داهێنانی ئەدەبی یا هەر هونەرێك؛ ئارەزووی تێکشکاندنی بێ شێوەیی جیهانەو شادبوونە لە ڕێی خولقاندنی کۆمەڵێك وێنەی جیاوازی شتێکەوە، ئەگینا وەکو وێرانەیەکی بێ مانا دێتە پێشچاو.

***ماگی: قسەکردنتان سەبارەت بە شادبوون؛ ئەو ڕاستییە بەرجەستە دەکات کە بەردەوام یەکێك لە ئامانجە سەرەکیەکانی ئەدەب بریتی بووە لە سەرگەرمی، کە بڕوا ناکەم ئەم ئامانجە هیچ پەیوەندییەکی بە فەلسەفەوە هەبێت.***

**مێردۆك:** فەلسەفە سەرگەرمکەر نییە، بەڵام دەشێ تەسەللابەخش بێت، لەبەر ئەوەی فەلسەفەش جۆرە دەرهێنانێکی شێوەیە لەبێ شێوەیی و پەرتی.

زۆر جار فەیلەسووفان لە ڕێی وێنەی خەیاڵیی ئاڵۆزەوە پرۆژەی گەورە دادەڕێژن. فەیلەسووف بەرامبەر بە ئەنگێزە هونەرییەکانی ناوخۆی بەدگومانەو بەچاوی چاودێرانەوە دەڕوانێتە لایەنی غەریزیی خەیاڵەکانی. بەڵام هەر هونەرمەندێك دەبێ لانی کەم نیوە عاشقی ئەستی خۆی بێت کە بەهەر حاڵ سەرچاوەی هێزی بزوێنەری ئەوەو زۆر کاری بۆ ئەنجامدەدات.

هەڵبەت فەیلەسووفانیش ئەستیان هەیە، فەلسەفە دەتوانێ ترسمان بڕەوێنێتەوە. ڕەنگە پەی بەزۆر شت بەرین ئەگەر لە فەیلەسووف بپرسین: "لەچی دەترسیت؟" فەیلەسووف نابێ بچێتە ژێر باری ئەو هونەرمەندە تەسەللابەخشەوەی کە لە ناوەوەیدایە. دەبێ لە پێناوی حەقیقەتداو بۆ ئەوەش کە هەر بە زاڵی بمێنێتەوە بەسەر ئەو مەسەلەیەدا کە خەریکێتی؛ ڕیسەکەی خۆی بکاتەوە بە خوری. ئەم کارە پێچەوانەی هونەری ئەدەبییە.

فەلسەفە دووبارەکردنەوەو لە سەرەتاوە تێهەڵچوونەوەیە، دووبارە دەگەڕێتەوە بۆ کێشەکانی ڕابردوو و بەردەوامیش ئەو شێوانە دەشکێنێتەوە کە دروستی کردوون.

*ماگی: تا ئێستا ئێوە چەند شتێکتان دەربارەی ئەدەب وتووە کە مەبەست لێیان جیاوازی کردنە لە نێوان ئەدەب و فەلسەفەدا. من دەمەوێ بە شێوەیەکی ئاشکراتر باس لەو جیاوازییانە بکەم. بۆ نموونە وتت کە چیرۆك گێڕانەوە کارێکی سروشتییەو هەر یەکێك لە ئێمە لە ژیانی ڕۆژانەماندا دەیکەین و، جگە لەوە حەزیش دەکەین کە چیرۆکمان بۆ بگێڕنەوە. وای بۆ دەچم لە بەرامبەردا، فەلسەفە بە پێچەوانەی سروشتەوەیە. فەلسەفە وامان لێ دەکات دەست بدەینە شیکردنەوەی ڕەخنەگرانەی بیروباوەڕەکانمان، هەروەها شیکردنەوەی ڕەخنەگرانەی ئەو قەناعەتە پێشوەختانەی کە بوون بە پایەی بیروباوەڕەکانمان. ئەوەی جێی سەرنجیشە ئەوەیە کە خەڵك نە حەزدەکەن خۆیان کارێکی وەها بکەن و نە پێشیان خۆشە کەسانی دی کارێکی وا لە بارەی ئەوانەوە ئەنجامبدەن. ئەگەر ئەو قەناعەت و بەڵگەنەویستانەی بوونەتە کۆڵەکەی بیروبۆچوونەکانمان بخرێنە ژێر گومان و پرسیارەوە؛ هەست بە نائارامی دەکەین و لە ئاست ئەو کارەدا بەرگری دەکەین.*

**مێردۆك:** بەڵێ، بە بۆچوونی من فەلسەفە زۆر پێچەوانەی سروشتە؛ کارێکی زۆر سەیرو نائاساییە. هەر مامۆستایەکی فەلسەفە بگریت بە دڵنیاییەوە ئەم هەستەی لا هەیە. فەلسەفە ئەو خووانەمان تێك و پێك دەدات کە لە بواری وێناکردنی نیوە هونەری یا نیوە زەوقیماندا پشتیان پێ دەبەستین. هیوم دەڵێت تەنانەت فەیلەسووفیش کاتێ لە کتێبخانەکەی دێتە دەرێ دەگەڕێتەوە بۆ هەمان ئەو شتە لە پێشوەخت سەپێنراوانەدا کە خووی پێیانەوە گرتووە. فەلسەفە جۆرێك نییە لە جۆرەکانی کاری زانستی و، هەر کەسێك پشت بە زانست ببەستێت، دەچێتە دەرەوەی بازنەی فەلسەفە. فەلسەفە هەوڵێکە لە دونیای هزردا بۆ دەرك کردن و هێنانە دەرەوەی قووڵترین و گشتگیرترین وێناندنەکانی ئێمە. ناتوانین بە ئاسانی قەناعەت بە خەڵك بکەین تەنانەت بڕواننە ئەو ئاستەش کە فەلسەفە تیایدا کاردەکات.

*ماگی: بێرتراند ڕاسل وتوویەتی کە فەلسەفە بریتییە لە کۆمەڵێك پرسیار کە نازانین چۆن وەڵامیان بدەینەوە. ئایزایا بێرلینیش هەمان ڕای هەیە.*

**مێردۆك:** بەڵێ، ئەو پرسیارانەی کە نازانین چۆن وەڵامیان بدەینەوە، یان تەنانەت ڕەنگە نەزانین چۆن بشیانخەینە ڕوو. زۆرن ئەو پرسیارانەی کە ناتوانین

وەلامیان بدەینەوە. بەلام دەزانین کە چۆن دەشێ وەلامیان بدەینەوە. ئەرکی فەلسەفەیە سەیروسەمەرەیی تەواوی مەسەلە ئاساییەکان ببینێت و هەولبدات پرسیاری کەشفخوازانە دەربارەیان فۆرمەلە بکات.

*ماگی: وتت کە فەلسەفە زانست نییەو منیش رام وایە. بەلام بێگومان هەندێ خالی هاوبەشی سەرەکی لە نێوان فەلسەفەو زانستدا هەن، یەکێك لەوانە ئەوەیە کە هەردووکیان بۆ تێگەیشتنی جیهان هەولدەدەن و ئەم هەولدانەش بریتی نییە لە خستنەڕووی ڕوانینی شەخسی. بە دەربڕینێکی دی لەم دوو بوارەدا دەبێ پشت بە کۆمەلێك شتی دەرەوەی خۆمان ببەستین: هەولدەدەین شتێك بلێین کە بە شێوەیەکی ناشەخسی ڕاستگۆ بێت. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازییەکی گرنگی تری نێوان فەلسەفەو ئەدەب. چەند دەقیقەیەك لەمەوپێش شتێکت وت کە وا دەگەیەنێ لە ڕۆمانەکانی تۆدا کەسێتی‌ی ئەدەبیی دیارو جیاوازت بەدی دەکرێ؛ بەلام لە نووسینە فەلسەفییەکانتدا بایەخ بەوە نادەیت. بە ڕای من، دەشێ گرنگترین شت لە چیرۆکنووسدا بوونی کەسێتی بێت بە مانایەکی تایبەتی. ئەگەر خاوەنی ئەو کەسێتی‌یە نەبێت؛ حەز بە خوێندنەوەی کارەکانی ناکەین. بەلام سەبارەت بە فەیلەسووفان ئەمە وا نییە. دەتوانیت هەموو کارەکانی "کانت" بە پەرۆشەوە بخوێنیتەوەو لە کۆتاییشدا وێنایەکت لا نەبێ بۆ کانت کە لە ناخی خۆیدا چۆن ئادەمیزادێك بووە.*

**مێردۆك:** ئایا مەبەستت ئەوەیە کە ئەو شتەی دەبێتە مایەی سەرنجڕاکێشانی ئێمە کەسێتی‌ی بەرجەستە کراوە لە کاری (هونەری)دا؟ من لەو بڕوایەدام کەسی نووسەر شتێکەو نووسینەکەشی شتێکی ترە، دەشێ خۆی کەسێکی ماندووکەرو بێزارکەر بێت، بەلام نووسینەکەی وا نەبێت، بە پێچەوانەشەوە. من لە بارەی "کەسێتیی ئەدەبی"یەوە زۆر دلنیا نیم. ئەوەی ئێمە دەمانەوێ؛ نووسەرێکە کە باش بنووسێت و قسەکانی سەرنجڕاکێش بن. ڕەنگە وا چاکتر بێت کە لە نێوان شێوازێکدا کە قابیلی دیاریکردنەو لە نێوان ئامادەگیی شەخسی‌دا جیاوازی بکەین. شەکسپیر خاوەنی شێوازێکە کە قابیلی دیاریکردنە؛ بەلام خۆی ئامادەگیی نییە. لە کاتێکدا نووسەرێکی وەکو دی. ئێچ. لۆرانس خاوەنی شێوازێکی وا دیار نییە بەلام ئامادەگییەکی بەهێزی هەیە. زۆربەی شاعیران و هەندێ لە ڕۆماننووسان بە شێوازێکی تەواو شەخسی لە گەلماندا دەدوێن، بەلام لە بەشێکی گەورەی باشترین کارە ئەدەبییەکاندا هەست ناکرێ ئامادەبوونی خولقێنەر لە کارەکەدا بەهێز بێت. ئەم ئامادەبوونە لە ئەدەبدا ئەگەر زیاد لە پێویست ڕکێفکەر بێت (هەروەکو لای لۆرانس ئەمە دەبینینەوە) و لە چیرۆکەکەیدا ئەو کەسێتی‌یەی هاوڕای چیرۆکنووسە ببێتە زمانحالی نووسەر، زیان بەکارەکە دەگەیەنێت. نووسینی خراپ و سەرنەکەوتوو تا ڕادەیەکی زۆر هەمیشە پڕە لە هەلم و بۆی کەسێتی (ی نووسەر). هەلبەت لێرەدا ڕێسادانان کارێکی زەحمەتە. ئارەزوی گوزارشتکردن لە کەسێتی و ناخ و بیانووهێنانەوەو خستنەڕووی خود یەکێکە لە ئەنگێزە بەهێزەکانی هونەر، بەلام دەبێ لایەنی خراپ و باشی هەلبسەنگێنین. من پێم ناخۆش نییە خاوەنی شێوازێکی شەخسی بم، بەلام نامەوێ بە شێوەیەکی ئاشکرا لە کارەکەمدا ئامادەگیم هەبێت. شتێکی بەلگەنەویستە کە پێویستە نووسەر ئاکارو بەهرەکانی خۆی پیشانبدات. ئەم جۆرە خۆپیشاندانە لە فەلسەفەشدا هەیە؛ بەلام لەوێدا دەپرسین کە ئایا ئەنجامەکە ڕاستەو، ئایا ئەنجامەکە بەرهەمی سەرەتاکانە؟

***ماگی:*** *من کاتێ لەگەڵ هاوڕێیانێکمدا ئەدوێم کە لەوانەیە زۆر هۆشیارو خوێنەواریش بن؛ بەڵام شتێکی ئەوتۆ لە فەلسەفە نازانن، زۆربەی کات لە قسەکانیانەوە ئەوە هەڵدەهێنجم کە وایدەبینن فەلسەفە لقێکە لە لقەکانی ئەدەب و فەیلەسووفیش وەکو وتارنووس یان ڕۆماننووس گوزارشت لە ڕوانینی شەخسیی خۆی بۆ دونیا ئەکات و، ناتوانین بە ئاسانیش ڕوونی بکەینەوە کە بۆچی وا نییە. وای بۆ ئەچم یەکێک لە هۆیەکانی ئەوە بێت کە هەر یەکێک لە مەسەلە فەلسەفییەکان مێژوو و بەسەرهاتی خۆی هەیە، هەر فەیلەسووفێکیش لە قۆناغێکی دیاریکراوی ئەو ڕەوتی گۆڕانەیدا پێ ئەخاتە مەیدانەکەوەو ئەگەر بشیەوێت قسەیەك لەو بارەیە بکات ئەبێ لە هەمان خاڵەوە بدوێ نەك خاڵێکی دی، کەواتە لەم ڕووەوە فەیلەسووفیش لە زانا (ی زانستە سروشتییەکان) ئەچێت.*

**مێردۆك:** بەڵێ، ڕاستە. دەشێ هەر ئەمەش ڕوخساری جیاکەرەوەی "فەیلەسووفی ڕاستەقینە" بێت لە بیرمەندان و وەعزدەران. فەیلەسووف لەگەڵ فەلسەفەی باو لە سەردەمی خۆیدا دەکەوێتە ململانێوە. کۆمەڵێك تێزو تیۆرە هەن کە دەبێ فەیلەسووف کاردانەوەیان بەرامبەر پیشانبدات و، هەندێ ڕایەڵی باریك و دیاریکراو بە ڕابردووەوە دەیبەستنەوە. بەڵام هونەرمەند، بە پێچەوانەوە، پێناچێت بەرپرسیارێتییەکی هەبێت. دەشێ لەگەڵ ڕۆژگاری خۆیو مێژوو و بەسەرهاتی هونەریدا پەیوەندیی قووڵی هەبێت، بەڵام هیچ مەسەلەیەکی پێ نادرێ تا چارەسەری بکات؛ بەڵکو دەبێ خۆی مەسەلەی خۆی بخولقێنێت.

***ماگی:*** *دەشێ ئەمە یەکێك بێت لەو هۆیانەی کە نووسینی هونەری، واتە نووسینی شانۆنامەو ڕۆمان و شیعر، هەم کەسێتیی خولقێنەر (داهێنەر) و هەم کەسێتیی خوێنەر، زۆر زیاتر لە فەلسەفە ئەخاتە ململانێوە. ئەدەب بۆ ئەوەی ئەدەب بێت، ئەبێ بمانخرۆشێنێت و بمانهەژێنێت، لە کاتێکدا فەیلەسووفیش وەکو زانا تەقەللایەکی زۆر ئەدات تا هەڵچوون و هەژان لە کاری خۆی دووربخاتەوە.*

**مێردۆك:** بەڵێ، من وایدەبینم کە هونەرمەند بوون لە فەیلەسووف بوون خۆشترە. دەتوانین ئەدەب ناو بنێین تەکنیکێکی دیسپلینکراو بۆ بزواندنی (وروژاندنی) ئینفیعالەکان. (هەڵبەت لەمجۆرە تەکنیکانەش هەن). بە بۆچوونی من، وروژاندنی ئینفیعال دەبێ بخرێتە پێناسەی هونەرەوە، گەرچی هەموو هەڵوێستێکی ئەزموونی هونەری، هەڵوێستێکی ئینفیعالی نییە. لێرەدا دەگەینە ماهیەتی هەستئامێزانە (حیسسی)ی هونەرو ئەو ڕاستیەی کە سەروکاری لەگەڵ شتە هەستییە بینراوو بیستراو و بەدەنیەکاندا هەیە. ئەگەر هیچ شتێکی هەستئامێز نەبێت؛ هونەریش نابێت. ئەم ڕاستییە خۆی بە تەنیا هونەر لە چالاکییە "تیۆرییە"کان جیادەکاتەوە. لەمەش بگوزەرێ، بەشێکی زۆری هونەر -لەوانەیە گەورەترین بەشی بێت و دەشێ هەمووشی بێت- بە مانایەکی نائاسایی پەیوەندی بە مەیلی سێکسیەوە هەیە (کە دەشێ ئەمە حوکمێکی میتافیزیکیش بێت). هونەر گەمەیەکی دەستەویەخە و خەتەرناکە لەگەڵ هێزەکانی ئەستدا. بۆیە چێژ لە هونەر دەبینین، تەنانەت هونەری سادەش، لەبەرئەوەی بەشێوەیەکی قووڵ و بەجۆرێکیش کە دەشێ تێی نەگەین ئاسوودەییمان لەق دەکات، ئەمەش یەکێکە لەو هۆیانەی کەوا لە هونەر دەکەن کاتێ باش دەبێت بۆ ئێمەش باش دەبێت، کاتێکیش خراپ دەبێت بۆ ئێمەش خراپ دەبێت.

*ماگی: تا ئێرە دەربارەی جیاوازییەکانی نێوان فەلسەفەو ئەدەب دەدواین و، بە ڕای من جەخت کردن لە سەریان گرنگە، بەڵام دەبێ بڕوامان وابێت کە لە نێوان ئەم دووانەدا کۆمەڵێك خاڵی هاوبەشیش هەیە. لەو گفتوگۆیانەوە کە پێشتر لەگەڵ یەکدا هەمانبووە، دەزانم کە بۆ نموونە تۆش بڕوات وایە کە چەمکی حەقیقەت نزیکە لە تەوەری باسی هەردووکیانەوە.*

**مێردۆك:** بەڵێ، گومان لەوەدا نییە کە منیش وایدەبینم فەلسەفەو ئەدەب گەرچی ئەو هەموو جیاوازییەشیان لەگەڵ یەکتردا هەیە، بەڵام هەردووکیان دەبێ بە چالاکیەك بژمێردرێن بۆ گەڕان بەدوای حەقیقەت و ئاشکرا کردنیدا. هەردووکیان دەبێ بە چالاکیەك بۆ زانین و ڕوونکردنەوە لە قەڵەم بدرێن. ئەدەبیش وەکو هونەرەکانی دی بەندە بە لێکۆڵینەوەو گەڕان و پۆلێن و جیاکاری و بە پێویستی‌ی بۆ ڕوانینێکی ڕێکخراو. هەڵبەت کاری ئەدەبیی باش بە ڕواڵەت لە "شیکردنەوە" ناچێت، لەبەرئەوەی ئەو شتەی هێزی خەیاڵ دەیخولقێنێت هەستی (حیسسی) و لەنێو یەکدا تواوەو بەرجەستەو نهێنیئامێزو پڕ لە خەیاڵات و کارێکی تایبەتە. دەبێ هونەر بە ڕوویەکی تری زانین بژمێرین.

بڕوانە لە شانۆنامەیەکی شەکسپیردا یان لە ڕۆمانێکی گەورەدا چەند فیکرو چەند حەقیقەت هەیە. هەمیشە سەبارەت بە هەر بوارێك کە پێویستی بە پیاچوونەوەو ڕامان هەبێت، شتێکی ڕۆشنابیبەخش دەبێت بۆمان؛ گەر بزانین لە ڕەخنەگرتنیدا کام وشانە بەکاردەبرێن. دەشێ بەتەنها لە ڕووی شێوە (فۆرم)ەوە ڕەخنە لە ئەدەب بگرین. بەڵام زۆرجار دەبینین کە لەو ڕووەوە ڕەخنەی لێ دەگیرێ کە بە فڵانە مانا لە حەقیقەت خاڵی‌یە. بۆ نموونە کۆمەڵێك دەستەواژەو وشەی وەکو "هەست و سۆزی ڕووکەش"، "ڕواڵەتسازی"، "بێ دەربەستی"، "کاڵ و کرچ"ی دەدرێتە پاڵ و، مەبەستیش ئەوەیە بڵێین لە فڵانە کاری ئەدەبیدا حەقیقەت بەدی ماکرێ، یان عەدالەت پێشێل کراوە، یا شێواندن و لادان لە ڕاستی، یان لە ڕووی تێگەیشتن و دەربڕینەوە کەموکورتی هەیە. وشەی "وەهم" زۆربەی ئەم خەوشە تا ڕادەیەك ئەدەبیانە بە مانایەکی ناپەسەند دەگرێتە خۆی، لەبەر ئەمەش، شتێکی سوودمەندە کە "وەهم" و "خەیاڵ" وەکو دوو ناونیشان بۆ خراپ و باش بەرامبەر یەك دابنێین و جیاوازییەکەیان هەڵبسەنگێنین. بێگومان فەلسەفەش چالاکیەکە کە بەرهەمی هێزی خەیاڵە، بەڵام ئەو حوکمانەی کە دەیەوێ بیاندات تەواو لەگەڵ "حوکمە کۆنکرێتی و دیاریکراوەکان"ی هونەردا جیاوازن، شێوازو ئەتمۆسفێری فەلسەفەش وەکو زانست؛ ڕێ بە خەیالاتی کەسی نادات. بەڵام لە زەینی نووسەردا، دەشێ خەیاڵی خولقێنەرانەو خەیالاتی بێ ڕکێف دوو هێزی زۆر لەیەك نزیك و لێك جودانەکراوە بن. نووسەری جیددی دەبێ "بە ئاگر یاری بکات". لە هونەری خراپ و نزمدا خەیالات هەموو شتێك ڕکێفدەکات. بۆ نموونە وەکو بواری ئەدەبی عیشقی (دڵداری) یان ئەو چیرۆکانەی پڕ لە خرۆشان و جەریەزەیین کە تیایاندا پاڵەوانی چیرۆکەکە (کە لە ڕاستیدا هەر نووسەرەکەیە و بەناوێکی ترەوە) ئازاو بەخشندەو خۆشەویستە (هەڵبەت هەندێ خەوشی بچووکیشی هەیە) و لە کۆتاییدا بە هەموو مرازێکی خۆی دەگات. مەحکومکردنی کاری هونەری بەوەی کە "خەیالاتاوی – وەهمناك"ە، مانای مەحکومکردنێتی بە بێ حەقیقەتی.

*ماگی: بەڵام ئەم چەمکە بۆ حەقیقەت زۆر جیاوازە لەو چەمکەی فەیلەسووف عەودالێتی، وا نی‌یە؟*

**مێردۆك:** مەبەستی من ئەوەیە كە ئەدەبیش لەم ڕووەوە وەكو فەلسەفە وایە، لەبەرئەوەی دەمەوێ جەخت لەوە بكەم كە ئەدەبیش چالاكیەكە بۆ گەڕان بەدوای حەقیقەتدا. بەڵام فەلسەفە ئەبستراكت و پاساو هێنەرەوەیەو بە شێوەیەكی ڕاستەوخۆ دەدوێت. دەشێ زمانی ئەدەبی بە ئەنقەست ئاڵۆزو تەمومژاوی بێت و تەنانەت ئەوەش كە بە زمانێكی سادەو ڕاستەوخۆ دێتە بەرچاو؛ دەشێ بەشێك بێت لە بونیادی خەیاڵیی شاراوەی كارەكە. لە چیرۆكنووسیندا، تەنانەت لە سادەترین چیرۆكدا ئاین و ئۆینی هونەری ڕەچاو دەكرێ و بە شێوەیەكی ناڕاستەوخۆ قسە دەكرێ، هەرچەند لەبەر ئەوەی زیاد لە پێویست خوومان بە سەنعەتە بەكارهێنراوەكانەوە گرتووەو هەروەها هەموومان لە ژیانی ڕۆژانەشدا تا ڕادەیەك هونەرمەندانی ئەدەبین، دەشێ سەرنجی ئەم شتە نەدەین. دەشێ بوترێ ئەوەی لە فەلسەفەدا نائاسایی دەنوێنێ ڕاشكاوی و ڕاستەوخۆ بوونێتی، ئەوەی لە چیرۆكیشدا بەلای ئێمەوە ئاسایی دێتە بەرچاو ناڕاستەوخۆ بوونێتی.

شیكردنەوەی ئەوەی كە مەڵەی فەلسەفی چۆنە، شتێكی ئاسان نییە. هەندێ جار لە زنجیرەی پاساواندا مەڵەیەكی لۆژیكی یا نیمچە لۆژیكی هەیە، بەڵام زۆربەی كات ناكامیی فەلسەفە بەهۆی شتێكەوەیە كە دەتوانین ناوی بنێین مەڵەی مێزی خەیاڵ یان سووربوون لەسەر مەڵە چەمكییەكان یان گریمانە مەڵەكان و یان دەستپێكردن لە خاڵێكەوە كە لە سەرەتاوە تا كۆتایی لێكۆڵینەوەكە بە ڕێی مەڵەدا دەبات. دەكرێ باسی ئەوە بكەین كە لە نموونەی ئەمجۆرە بەمەڵەدا چوونانە چەمكی "پێدراوی هەستی– *Sense datum*" یان جیاوازی كردن لە نێوان زمانی بەهایی (نرخاندن) و زمانی وەسفیدا. پێوانەی حەقیقەت لە فەلسەفەدا دژوار بەدەست دێ؛ لەبەر ئەوەی بابەتەكەش سەخت و ئەبستراكتە. دەشێ ئەوە ڕوون نەبێت كە چ شتێك بۆی هەیە شتێكی تر بە ڕاست بزانێت؛ لەبەرئەوەی ئەو دیاردانەی كە پاساو بۆ ئەسڵی تیۆرەكە دەمێننەوە دەبێ خۆشیان لە ڕێی هەمان تیۆرەوە وەسف بكرێن. فەیلەسووف دەبێ لە وتنەوەی شتێك یا دووبارەكردنەوەی زانیارییەك بترسێت و بەردەوام بڕوانێتە "دونیای ئاسایی" كە كەمتر لە قاڵبی چەمكە سەختەكاندا داڕێژراوە. هەڵبەت نموونەی ئەم كێشەیە لە هونەریشدا هەیە، بەڵام جیاوازەو بەرچاو ناكەوێ؛ لەبەر ئەوەی هونەر هەر بە پێی سروشتی خۆی لە دونیاوە نزیكە. تاقیكردنەوەی حەقیقەت لە فەلسەفەدا دژوارە؛ لەبەر ئەوەی خۆی بابەتێكی دژوارە، بەڵام تاقیكردنەوەی حەقیقەت لە هونەردا ڕەنگە بۆیە دژوار بێت چونكە خودی بابەتەكە لە ڕوویەكەوە ئاسانە. هەموومان وا هەست دەكەین كە هونەر یان لانی كەم بڕێكی زۆری لێ تێدەگەین. هونەر ئەگەر ئاڵۆزو دژوار بێت هێزە ڕەخنەگرانەكەی ئێمە دوچاری ئیفلیجی دەكات، لە كاتێكا ئامادەین بچینە ژێر ئەفسوونیەوە. هەروەكو وتن؛ فەلسەفە یەك كار دەكات و ئەدەب زۆر كار. لە ئەدەبدا، چ لە خولقێنەرەكەداو چ لای وەرگر، كاڵێ ئەنگێزە هەن كە ڕۆڵی خۆیان دەبینن. بۆ نموونە ئەدەب ئێمە شاد دەكات و جیهانمان پیشان دەدات. بەشێكی زۆری ئەو چێژەی لە هونەریشەوە بەدەست دێ؛ چێژێكی سەرچاوە گرتووە لە بینین و زانینی كۆمەڵێك شت كە بە جۆرێكی ناڕوون دەمانزانی هەن بەڵام پێشتر بەچاوی خۆمان نەماندیون. هونەر "مێمێسیس"[1]ە و هونەری باشیش (بۆ ئەوەی زاراوەیەكی تری ئەفلاتون بەكاربهێنین) "ئەنامنیسیس"[2]ە واتە "هاتنەوە یاد"ی ئەو شتەی نەماندەزانی كە دەیزانین. هونەر "ئاوێنەداری سروشت"ە. بێگومان ئەم ڕەنگدانەوەیە یان "نمایش"ەش بە مانای كۆپی كردنەوە یان وێنەی

فۆتۆگرافناسا نییە. بەلام گرنگە ئەوە بزانین کە هونەر پابەندە بە دونیاوەو بۆ ئێمە هەیەو لەسەر باکگراوەندی زانینە ئاساییەکانی ئێمە بەرجەستە دەبێت. دەشێ هونەر ئەو زانینانە بەرفراوان بکات، بەلام هەر ئەو زانینانەش سەنگی مەحەکین. ئێمە بە شێوەیەکی غەریزی بەو سەنگی مەحەکە هەڵیدەسەنگێنین و هەڵبەت هەندێ جاریش بەهەڵەدا دەچین، وەکو ئەوکاتەی کە دەڵێین فلانە چیرۆك مەنتیقی نییەو، بۆیە شایانی بایەخ پێدان نییە، لە کاتێکا کە بە ڕاستی تێنەگەیشتووین چۆن چیرۆکێکە.

*ماگی: ئێستاش با بچینە سەر وێناکردنە فەلسەفیەکان دەربارەی ئەدەب. تۆزێك لەمەوبەر دەربارەی خەیاڵات بە مانای خراپ و ناپەسەندی دوایت، واتە بە دەربڕینی من بە مانای جۆرێك لە بێدەربەستی، کە کۆمەڵێك بەهای درۆی وەکو پەرستنی دەسەڵات یا پلەو پایەو یان سامان دەگرێتە خۆی، بەم پێیەش تەواو نزیك دەبێتەوە لە مانای بێنرخی لە هونەردا. ئەمەش زۆر پەیوەندیی بەوەوە هەیە کە بۆچی هەندێ لە فەیلەسووفان لەگەڵ هونەردا ناتەبا بوون. لە ڕاستیدا، دوا کتێبتان (ئاگرو خۆر) دەربارەی سەرسەختی و دوژمنایەتیی "ئەفلاتون" بوو بۆ هونەر. شتێکی بایەخدارە لە زمانی خۆتانەوە گوێمان لەوە بێت کە فەیلەسووفێکی مەزنی وەکو ئەفلاتون کە خۆیشی سوودی لە هەندێ فۆرمی هونەریی وەکو گفتوگۆ دەبینی، هەروەها بڕێکی زۆر لە چیرۆك گێڕانەوە هەیە لە کارەکانیدا، بۆچی دژایەتیی هونەری دەکرد؟*

**مێردۆك:** دوژمنایەتی ئەفلاتون بۆ هونەر شتێکە لای هەمووان ئاشکرایە. ئەو تیۆرەسازێکی سیاسی بوو، هەر لەبەر ئەمەش لە دەسەڵاتی ئاتیفیانەر

ناعەقڵانییانەی هونەرو لە هێزی هونەر بۆ هەڵبەستنی درۆی دڵڕفێن یان دروستکردنی ڕاستیی ئاژاوەگێڕانە دەترساو خوازیاری سانسۆری توندو دەرکردنی دراما نووسەکان بوو لە شاری یۆتۆپیا. ئەو تەنانەت لەو هونەرمەندەش دەترسا کە لە ناوەوەی خۆیدا بوو. ئەفلاتون پیاوێکی زۆر دیندار بوو و هەستی دەکرد کە هونەر هەم دوژمنی دینەو هەم دوژمنی فەلسەفەو بە شێوەیەکی خۆپەسەندانە دەیویست جێی دین بگرێتەوە. سەیر لەوەدایە کە کارەکەی خۆی لە ڕیزی گەورەترین کارە هونەرییەکاندایە، ئەمەش بەو مانایەی کە خۆشی لە ڕووی تیۆرییەوە ئەوەی پێ قبووڵ نییە. ئەو دەڵێت کە ناکۆکیەکی دێرینە لە نێوان فەلسەفەو شیعردا هەیە. هەڵبەتە نابێ ئەوەشمان لە یاد بچێت کە لە ڕۆژگاری ئەفلاتوندا فەلسەفە تازە تازە لە هەناوی ڕوانینە شیعری و دینییەکانەوە دەهاتە دەرێ، هەروەها فەلسەفە بۆ ئەوەی دوانەکەوێ، پێویست بوو سنووری خۆی لەگەڵ ئەوانی تردا دیاری بکات. لە سەردەمی ئەفلاتوندا فەلسەفە لە ئەدەب جیابۆوە، لە سەدەکانی هەفدەو هەژدەدا لە زانستە سروشتیەکان و، لە سەدەی بیستەمدا لە دەروونناسی. ئەفلاتون بڕوای وابوو کە هونەر "میمیسیس" (لاساییکردنەوە)یە، لاساییکردنەوەیەکی خراپیش. گومانیش لەوەدا نییە کە هەمیشە زیاتر هونەری خراپ هەبووە نەك باش و، ژمارەی ئەو کەسانەش کە حەزیان لە هونەری خراپە زیاترە لە ژمارەی ئەوانەی حەزیان لە هونەری باشە. ئەفلاتون لەو بڕوایە بوو کە هونەر خۆی لە خۆیدا لە بنەڕەتدا جگە لە خەیاڵاتی شەخسی و گەورەکردنی شتە ناشایستەکان و شێواندن و دزێوکردنی شتە باشەکان؛ هیچی دی نییە. ئەو هونەری بە جۆرێك لە کۆپیکردنی کەمبەهای هەندێ شتی بەشەکی (جزئی) دەزانی کە هیچ مانایەکی گشتیی بەخۆوە نەدەگرت، هەڵبەتە

دەبێ بڕواش بکەین کە بەشێکی زۆری هونەر جگە لەمە شتێکی دیکە نییە. ئێستا بیهێنەرە بەرچاوت. ئەگەر ئەفلاتون ئەمڕۆ زیندوو بووایە لە بارەی تەلەفزیۆنەوە چۆن تێدەفکری. ئەو بڕوای وابوو کە پێویستە بڕوانینە جیهانی واقیعی و لەو تێفکرین و بەو وێنە بێبەهاو خەونە درۆیانە قەناعەت نەکەین، کە ئەمە تەواو پێچەوانەی تێڕوانینەکەی فرۆیدە کە هونەر بە جێگرەوەیەك بۆ دەسەڵات و قایلبوون لە "ژیانی واقیعی"دا دەزانێت. فرۆید هەندێ جار بە ئاماژە بۆ کردن دەڵێت کە هونەر بەرهەمی زەینی خەیاڵاتپەروەری هونەرمەندە کە ڕاستەوخۆ لەگەڵ زەینی خەیاڵاتپەروەری وەرگردا دەدوێت. هونەر جۆرێکە لە تەسەللاو چارەسەری تایبەتی. بە ڕای من، ئەمە هزرێکی زۆر قووڵ و تاوانبار کردنێکی جیدییە. دەتوانین ببینین کە چیرۆکە خرۆشێنەرو تابلۆ عاتیفیەکان چۆن دەشێ بزوێنەری خەیاڵاتی تایبەتی بن لای خوێنەر یان بینەر. پۆرنۆگرافیاش دوا سنووری ئەمجۆرە سوود لێوەرگرتنە تایبەتییەی "هونەر"ە.

*ماگی: بەڵام بڕوا بفەرموون کە ئەم ڕەخنانە تەنها سەبارەت بە هونەری خراپ ڕاستن. هەڵبەتە وەکو وتتان، زۆرینەی هونەر خراپن. بەڵام هونەری باش -واتە ئەو هونەرەی کە ئومێدەوارین بمێنێتەوە- بێبەریە لەم خەوشانە.*

**مێردۆك:** هەمیشە ئەو نەگەرە لە ئارادایە کە وەرگر هەوڵبدات بۆ مەبەستە شەخسیەکانی خۆی سوود لە هونەر ببینێت، بە کورتی هونەری باش دەشێ بتوانێ بەرامبەر بە مەبەست و نیازەکان بەرگری بکات. دەشێ کەسێك بە تەنها بۆ بینینی وێنە پۆرنۆگرافیەکان بۆ مۆزەخانە بچێت. ئەوەی پێی دەڵێین هونەری خراپ، لە بنەڕەتدا هەر خۆی دەیەوێ ببێتە مایەی سوود لێوەرگرتنی خراپ و ڕێگە نادات بە جۆرێکی دی دەرك بکرێ.

خەریکبوونی گشتی بە هونەرەوە، هەم هونەری باش بەرهەمدێنێ و هەم هونەری خراپ. ڕەخنەگران دەشێ زیاد لە پێویست وشك و زاهیدئاسا بن. بەڵام من دوژمنایەتیەکی سەختم لەگەڵ پۆرنۆگرافیادا هەیە، لەبەر ئەوەی بە بڕوای من پۆرنۆگرافیا بە ڕاستی زیاندەرو سووکایەتی پێکەرە. خەڵکی ئەگەر چێژ لە هونەری کەمبەهای ئاسایی وەربگرن، کێشەیەکی ئەوتۆ نییە. خوێندنەوەی ڕۆمانە عاتیفیەکان دەکرێ ببێتە مایەی ئاسوودەیی و حەوانەوەی کەسێك، هەرچەندە لەم ڕووەشەوە ئەوە پەسەندترە کە ڕۆمانێکی وەکو (شەڕو ئاشتی) بخوێنێتەوە.

*ماگی: ئەو تێڕوانینەی ئەمڕۆ لە برەودایە ئەوەیە کە هونەری باش بە مانایەکی دیکەش بۆ ئێمە باشە. دەوترێ کە هونەری باش هەستیارێتی ئێمە تیژ دەکاتەوەو توانای تێگەیشتنمان زیاتر دەکات و، بەمجۆرەش توانا و قابلیەتمان بۆ هاوسۆزی و هەستکردن بە دانسقەیی زیاتر دەکات.*

**مێردۆك:** بە ڕای من هونەری باش بۆ خەڵك باشە؛ هەر لەبەر ئەوەش کە بەرهەمی خەیاڵە نەك خەیاڵات. هونەری باش ئێمە لە پەخسیرێتیی ژیانی بێزراوو خەمناك ئازاد دەکات و ڕوانینێکی ڕاستەقینەمان لا دەبزوێنێت. زۆربەی کات ئێمە جیهانی گەورەو بەربڵاوی ڕاستەقینە نابینین لەبەر ئەوەی دڕدۆنگی و شڵەژان و ئێرەیی و تووڕەیی و ترس کوێرمان دەکەن. دونیایەکی تایبەتیی بچکۆلە دەخولقێنین و تیایدا قەتیس دەمێنینەوە. هونەری گەورە ڕزگارکەرە، چونکە توانای ئەوەمان دەداتێ دەرەوەی خۆمان ببینین و چێژی لێوەربگرین. ئەدەب مەیلی پرسیارو گەڕانمان لا دەوروژێنێت و لە هەمانکاتدا قایلیشی دەکات و دەبێتە هۆی گرنگیدانی ئێمە بە ئەوانی دیو دیمەنەکانی دیو هانمان دەدات

لێبوردەتر و بەخشندەتر بن. هەروەها هونەر سەرچاوەی زانیاریشە. تەنانەت هونەری کەمبەهاو مام ناوەنجیش دەربارەی جۆری ژیانی ئەوانی دی زانیاریمان دەداتێ. بێگومان ئەم قسەیە بە مانای ئەوە نییە کە چاوەڕوانی سوودی کردەیی یا فێرکارییانە بین لە هونەر. هونەر لەم جۆرە بیرو بۆچوونە تەسك و سنووردارانە گەورەترو بەربڵاوترە.

لانی کەم ئەفلاتون هەستی دەکرد هونەر چ بایەخێکی گەورەی هەیەو پرسیاری گرنگی دەربارەی دەکرد. بە شێوەیەکی گشتی فەیلەسووفەکان زۆر شتی باشیان سەبارەت بە هونەر نەنووسیوە، هەندێکیان لەبەر ئەوەی بە بابەتێکی لاوەکی و کەمبایەخیان داناوە کە دەکرێ بئاخنرێتە نێو تیۆرە میتافیزیکی یان ئاکارییە گشتیەکانیانەوە.

*ماگی: ئەم حوکمە بە شێوەیەکی گشتی ڕاستە، بەڵام فەیلەسووفێك هەیە کە لەم تاوانە بێ بەرییەو ئەویش شۆپنهاوەرە. ئەم بە پێچەوانەی زۆربەی فەیلەسووفانی ترەوە، وا دەڕوانێتە هونەر کە خاوەن لایەنێکی تەوەرییە لە ژیانی ئادەمیزاددا، کۆمەڵێك شتی قووڵی لە بارەی هونەرەوە نووسیوە.*

**مێردۆك:** بەڵێ، بێگومان. شۆپنهاوەر لەگەڵ ئەفلاتوندا هاوڕا نەبوو و تەنانەت بیروبۆچوونەکانی ئەوی ئاوەژوو کردەوە. ئەفلاتون بڕوای وابوو کە هونەر چێژ بە لایەنە خۆپەسەندو گێلەکەی دەروون دەبەخشێت، لە کاتێکدا لایەنە بەرزو ئابڕوومەندەکەی دەروون خولیای گەڕانە بەدوای حەقیقەتەکاندا لە ڕێی ئەو شتانەوە کە ئەو ناوی نان "نموونەکان" (یان ئایدیاکان) کە کۆمەڵێك وێناکردنی گشتی و ئەقڵین، یان سەرچاوەی ڕوونبینین، بەرامبەر بە شتە بەشەکی یە نامەعقولەکان[3]. کەواتە ئەفلاتون بڕوای وابوو کە هونەر نزم و لاوەکییەو مەعریفەش ئەقڵی و گشتییە. بەڵام شۆپنهاوەر دەڵێت کە هونەر بەدوای ئایدیاکاندا دەگەڕێت و دەیانگوێزێتەوە، ئایدیاکانیش بە کۆمەڵێك فۆرمی مەعقول دەزانێت کە هەندێکیان لە سروشتدا دێنەدی و لە بەرگی ڕاستیدا بەرجەستە دەبن، هونەرمەندیش لە ڕێی هێزی خەیاڵەوە دەیەوێ دەریانبهێنێ. بە بڕوای شۆپنهاوەر، هونەر پەردەی خودێتی لادەبات و بزاوت و سیڵاوی ژیان ڕادەگرێت و ناچارمان دەکات جیهانی واقیعی ببینین، ئەو ڕاچەنینەی لەم ڕەوتەشدا دوچارمان دێ هەمان ئەزموونی پەیبردنە بە جوانی. ئەم بیروڕایە دەربارەی هونەر، بیروڕایەکی سەرنجڕاکێش و هاوشانە لەگەڵ ڕوانینێکی بەرزو سەنگیندا؛ لەبەر ئەوەی هونەریش وەکو فەلسەفە بە تەقەلایەکی ئاکاری و فیکری لە قەڵەم دەدات و، بە هەوڵێکی دەزانێت بۆ دەربڕین و ڕوونکردنەوەی جیهان و، جگە لەوە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە هونەری باش لە هەمانکاتدا کە زۆر گشتییە، زۆر بەشەکی (جزئی)یشە. لە ئایینە خۆرهەڵاتیەکاندا ڕاوبۆچوونی وەك ئەمە هەیە. بەڵام من ناتوانم ئەم "ئایدیایانە" تەنانەت وەکو خوازە "استعارە"یەکیش سەبارەت بە تەرزی کاری هونەرمەند قبووڵ بکەم. هەڵبەت دەکرێ بڵێین هۆشی ئێمە جیهان "فۆرمەلە دەکات" و فەیلەسووفان هەمیشە سەرگەرمی دۆزینەوەی پێکچوواندنی نێوان ئێمەو سروشت بوون، بەڵام من هیچ جۆرە تێڕوانینێکی فەلسەفیم لەم بارەیەوە پێ قبووڵ نییە، وا هەست دەکەم بەراورد کردنی فەلسەفەو هونەر بەیەکتر لێرەدا زێدەڕۆییەکی تیایە. ئەو هونەرمەندەی کە سەرقاڵی کاری هونەرییە ڕووبەڕووی کۆمەڵێك شتی تێکەڵاو و نامەعقول دەبێتەوەو تەنانەت دەشێ لە عیشقی کارەکەیدا بگاتە سنووری تووانەوەش. دەشێ وا بێتە بەرچاو کە تەنها هونەرمەندە گەورەکان جیهان "ڕوون" دەکەنەوە، گەرچی کارەکەیان لە ڕاستیدا گرنگیدانە بە ڕوونکردنەوەی بەشێکی ئەو جیهانە.

وێناکردنە تەمومژاوییو لە نرخاندندا کەمترەکەی "کانت" بۆ هونەر کە شۆپنهاوەر "ڕاست"ی کردۆتەوە، لە هەندێ ڕووەوە واقیعبینانەترە. هونەریش ئەوەندە "مەعقول" نییە. لەگەڵ ئەمەشدا؛ تێڕوانینەکەی شۆپنهاوەرم لاپەسەندە، لەبەر ئەوەی بەپێی ئەو تێڕوانینە لە هونەردا تا ئەوپەڕی سوود لە هێزە ئەقڵی و ئاکارییەکان دەبینرێو، هونەر دەبێتە تەقەلایەك بۆ زاڵبوون بەسەر دەروون و بینینی جیهاندا.

شۆپنهاوەر لەم ڕووەوە کە بە ئاشکرا شەیدای هونەرەو بەرز ڕایدەگرێت، ئاوارتەیە لە نێوان فەیلەسوفاندا. تیۆریزە فەلسەفیەکان دەربارەی هونەر بە دەگمەن تیایاندایە بگاتە ئەم پلەیە لە داهێناندا و لە زۆربەی جاردا تێڕوانینێکی سنووردار بەرامبەر تێڕوانینێکی سنوورداری تر دادەنێن، وەکو ئەو کەسانەی کە دەپرسن: ئایا هونەر بۆ هونەر خۆیەتی یان بۆ کۆمەڵگایە؟

*ماگی: یەکێك لەو دەردانەی تا ڕادەیەکی زۆر هەموو فەلسەفەیەکی هونەر بەدەستییەوە گرفتارە، چوارچێوە دانانە. هەر ئەوەندە کەسێك بیربکاتەوە لەوەی کە هونەر دەبێ بە فڵانە شێوە بێت تا لەگەڵ تیۆرە تایبەتیەکەی ئەودا بگونجێ، ئەوە دەگەیەنێت کە هەرچییەکی دی لەگەڵ ئەو تیۆرەیەدا نەگونجێ؛ هونەر نییە.*

**مێردۆك:** خۆشبەختانە کە هونەرمەندان هێندە بایەخ بە فەیلەسوفان نادەن. بەڵام هەندێ جار فەلسەفە دەتوانێ زیان بە هونەر بگەیەنێت، دەتوانێ وا لە خەڵك بکات لە ئاست هەندێ لایەنی هونەریدا کوێر بن، یان وایان لێبکات بە تەنها لە هەندێ لایەنی تایبەتیدا سەرکەوتوو بن.

*ماگی: یەکێك لە نموونە زەقەکانی فەلسەفە لە دونیای تازەدا کە زیانی بەهونەر گەیاندووە فەلسەفەی مارکسیزمە. بە گوێرەی تیۆرەی مارکسیستی؛ هونەر ڕۆڵێکی دیاریکراوی هەیەو ئەویش ئەوەیە کە ببێتە ئامرازی شۆڕشی کۆمەڵایەتی، کۆمەڵێك بەرهەمی هونەریی جۆراوجۆری مارکسیستی هەیە، وەکو ڕۆمان و شانۆنامەو نیگارکێشی و پەیکەرتاشی و هی دیکە، دەبێ بڵێم زۆربەیان شتی هەڵبەستراون. هەڵبەستراوە لەبەر ئەوەی ئەو ئەنگێزەیەی لە پشت خولقاندنیانەوەیە بە هیچ کلۆجێك ئەنگێزەی هونەریی ڕاستەقینە نەبوون، بەڵکو کۆمەڵێك پڕوپاگندە بوون.*

**مێردۆك:** من بە هیچ جۆرێك بڕوام بەوە نییە کە ئەرکی هونەرمەند بریتییە لە خزمەتکردنی کۆمەڵگا، بەڵام پێم وایە وابێت مارکسیستەکان باوەڕیان بەمە هەیە. هەرچەند دەربارەی چۆنێتیی ئەنجامدانی ئەمەش وتووێژی ئاشکرا هەبووە. هەندێ لە مارکسیستەکان بڕوایان بەوەیە کە هونەر جگە لە گفتوگۆو پۆستەری پشتیوانی کردن لە قۆناغی هەنووکەیی شۆڕش شتێکی تری ئەوتۆ نییەو، ڕۆماننووسان و نیگارکێشان دەبێ دژ بە "دوژمنانی کۆمەڵایەتی"ی خۆیان بجەنگن و نموونەی ئەو کەسانە بەرز ڕابگرن کە کۆمەڵگا بە ڕاستی پێویستی پێیانە. لە نموونەی ئەم جۆرە هونەرەی کە لە ئاستی هەست و سۆزی ڕووکەش و بازاڕیدایە وێنەی کرێکاران و جووتیارانی ئابڕوومەندو سەربەرزو کچانی زاناو سەرگەرمی کاری زانستی، کە لە یەکێتیی سۆڤێت دەبینرێن (نابێ ئەوەمان لەیاد بچێت کە ئەم گفتوگۆیە بەر لە هەرەسی یەکێتیی سۆڤێت ئەنجامدراوە– و. کوردی–). بەڵام تێڕوانینێکی تری مارکسیستانەی هۆشمەندانەترو لیبراڵتر هەیە کە هونەر بە جۆرە شیکردنەوەیەکی قووڵی کۆمەڵگا دەزانێت. جۆرج لۆکاچ (*1885–1971*) بەرلەوەی بە زۆر ناچار بێت دان بە "هەڵە"دا بنێت، باوەڕی بەم تێڕوانینە هەبوو. ئەو لە نێوان "ڕیالیزم"دا، کە مانای

شـــیکردنەوەی دامێنەرانەیـــە لـــەنێو بونیـــادی کۆمەڵایەتیداو، لەگەڵ "نـــاتورالیزم"دا؛ کـە مانـای کۆپیکردنـی نـــزم و دەم بـە هەرایانەیـە؛ جیـاوازیی دەکرد. ڕۆماننوسانی گەورەی سەدەی نۆزدەیەمیشی بە ڕیالیست لە قەڵەم دەدا؛ لەبەر ئـەوەی حەقیقەتی گرنگ و قووڵیان دەربارەی کۆمەڵگا بە ئێمـە وتـووە. بە ڕای من لەسەر هەقە کە لەبەر ئەو هۆیە ستایشـی ئـەو ڕۆماننووسـانە دەکـات. بـەڵام شـــیکردنەوەی کۆمـەڵگا بـــەو جـۆرەی کـە مایـەی پەسـەندکردنی مارکسیســـتەکانە نـــە ئامـــانجی ســـەرەکیی ئـــەو ڕۆماننووسانەبووەو نە ئەوەش تاقە کارێك بووە کە کردوویانـە. ئەگـەر نووسـەر بەخۆی بڵێــت: "دەبــێ هەوڵبدەم لە نووسینەکانمدا بە فڵانە شـێوە کۆمـەڵگا بگۆڕم"، دەشێ زیان بەکارەکەی خۆی بگەیەنێت.

*ماگی: چۆن دەتوانین دیکنز لێرەدا جێ بکەینـەوە؟ وا پێدەچێـت کـە ئـەو کۆمـەڵێك ئامانجی کۆمەڵایەتیی هەبووبن (هەڵبەت لەگەڵ کۆمـەڵێك ئامـانجی تـردا)، هـەروەها وا دێتـە پێشچاو کە لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە کاریگەریی زۆر بووبێت.*

**مێردۆك:** بـەڵێ، دیکنز هـەمووی کـردووە: هـەم نووسەرێکی دامێنەری گەورەبووەو هەم ڕەخنەگرێکی کۆمەڵایـەتیی بـە توانـاو ڕاشـکاو. وای بـۆ دەچـم ڕیسواییەکانی کۆمەڵگاکەی پەیوەندییـەکی قووڵیـان بـەو جـۆرە گۆڕانکارییـە کۆمەڵایـەتی و جـۆش و خرۆشەوە هەبووە کە لە هەموو شتەکانی دی قووڵتر لە خـەیاڵ و هـێزی دامێنەرانـەی ئـەودا کاریگـەریی خۆیان جێ هێشتووە. دیکنز توانایـەکی وای هـەبووە کـە هـەموو ئـەو شـتانە لـەناو بلیمـەتیی خۆیـدا بتوێنێتەوەو، بە دەگمەن هەست دەکەیت دەیەوێ لە ڕێی فڵانـە خـاڵی بێگانـەی کۆمەڵایەتیـەوە هـێرش بکاتە سەرتۆ. لەگەڵ هەموو ئەمانەدا، دەبێ سەرنجی ئەوە بدەین کە "ئەبستراکت" ترین ڕۆمانی ئەو؛ واتـە (ڕۆژگـاری ناخۆشـی) یەکێکـە لـەو ڕۆمانانـەی کـەمتر سەرکەوتنیان بەدەستهێناوە.

کاریگـــەرترین ڕەخنـــەکانی دیکـــنز لـــە ڕێی کەسێتییە زیندوو و ورژێنەرەکانیەوە فۆرمەلە بـوون؛ وەکو کوڕیژگەیەکی گسکدەر کە نـاوی "جۆ"یە لـە ڕۆمانی "خـانووی تـەریك"دا. دیکـنز نووسـەرێکی گەورەیـە چ لەبـەر توانـای بـەرزی بـۆ خولقـاندنی کەسێتیو چ لەبەر ڕوانینە ترسهێنەرەکانی لە جیهانی خـەیاڵدا کـە هیـچ پەیوەندییـەکیان بـە ڕیفۆرمـی کۆمەڵایەتیـەوە نییـە. "ئێدوین درود" ڕۆمـانێکی باشـــترە لـــە "ڕۆژگـــاری ناخۆشـــی". هەوڵـــە ئەنقەستەکانی نووسەر یان شاراوەکانی بـۆ قەناعـەت پێکردنی خوێنەر، ڕۆمان دەخاتە ئاستێکی نزمەوە. هەندێ جار کاتێ مرۆڤ جۆرج ئەلیوت دەخوێنێتەوە، بە پێچەوانـەی دیکنزەوە، ئەم هەستەی لا دروست دەبێت.

*ماگی: لەمجۆرە حاڵەتانـەدا کـاری هونـەری نەك هەر لە خۆیدا ئامانجێك نییە، بەڵکو دەبێتە وەسیلەیەك بۆ گەیشتن بە ئامـانجێکی لەخۆی بچووکتریش.*

**مێردۆك:** بەڵێ، وتم کە من واینـابینم هونەرمـەند، وەکـو هونەرمـەند بـوون، ئـەرکێکی سـەبارەت بـە کۆمـەڵگا لەسـەر شـان بێت. هـاووڵاتی بەرامبـەر بـە کۆمـەڵگا ئـەرکی لـە ئەستۆیەو، نووسـەریش دەشـێ هـــەندێ جـــار بـــە پێویســـتی بزانێـــت وتـــارێکی قەناعەتپێکەر لە ڕۆژنامەدا بڵاوبکاتەوە، یان مشـتومڕ بکات، بەڵام ئەمە کارێکی تـرە. هونەرمـەند بەرامبـەر بە هونەرەکـەی بەرپرسیارە و ئـەرکی لـە ئەستۆیە، ئـەرکی ڕاستگۆیی لـە بـوارە هونەرییەکـەی خۆیـدا، ئـەرکی نووسـەر ئەوەیـە کـە تـا ئـەو سـنوورەی لـە دەستی دێ باشـترین کـاری ئـەدەبی بخولقێنێـت و دەبێ بزانێ باشترین ڕێی ئەنجامی ئەم کارە چییـە. دەشێ وا بێتە بەرچاو کـە ئـەم جیاوازییـە لـە نێـوان

هونەرمەندو هاوولاتی‌دا تا ڕادەیەك دروستكراو بێت. بەڵام بە بڕوای مـن، پێویستە وا بیربكەینـەوە. فلانـە شانۆنامەی پڕوپاگەندەیی كە گوێ بـە هونـەر نـادات؛ تەنانـەت گـەر پـەیڕەوی لـە پرنسـیپی چاكـەو پەسـەندیش بكـات؛ دەشـێ گومڕاكـەر بێـت. ئەگـەر هونـەری جیـددی یـەكێك بێـت لـە ئامانجـە سەرەتاییەكان، جۆرێك لە عەدالەتیش هەر یەكێكە لە ئامانجە سەرەتاییەكان. فلانە بابەتی كۆمەلایەتی كـە لـە قـاڵبی هونـەردا دەخرێتـە ڕوو، تەنانـەت ئەگـەر قەناعەتپێكـەریش نـەبێت، دەشـێ ڕوونـتر بێـت. هـەر هونەرمـەندێك ئەگـەر شـتگەلێك ئاشـكرا بكـات كـە ئەوانی دی گرنگییان پێ نەداوە یان تێینەگەیشتوون، لـە سـنووری كارەكـەی خۆیـدا دەشـێ خزمـەتی كۆمەڵگاش بكات.

كاتێ دەڵێـن هونـەر "مـی میسـیس"ە، بەشێكی مەبەست لەمەیە. لە هەموو كۆمەڵگایەكدا پڕوپاگەندە هەیە، بـە كورتـی گرنـگ ئەوەیـە جیاوازی لـە نێوان پڕوپاگەندەو هونەردا بكەین و سـاغێتی (پەتیـەتی)ی هونـەرو سـەربەخۆیی بپـارێزین. ئـەو كۆمەڵگایـەش كۆمەڵگایـەكی باشـە كـە تیـایدا ژمارەیـەكی زۆر لـە هونەرمەندانی جۆراوجـۆر هـەبن و ژمارەیەكی زۆر لـە كـاری جیـاواز هـەبن. كۆمـەڵگای خـراپ هونەرمـەندەكانی خـۆی دەخاتـە ژێـر گوشـارو ناچـار كردنەوە، لەبـەر ئـەوەی دەزانـێ كـە ئـەوان دەتوانـن هەموو جۆرە ڕاستیەكان ئاشكرا بكەن.

*ماگی: تا ئێرە، سەرەتا دەربارەی جیاوازیی نێوان فەلسەفەو ئەدەب و، پاشانیش دەربارەی بیروبۆچوونە فەلسەفیەكان سەبارەت بە ئەدەب قسـەمان كـردووە. ئێسـتاش بـا بچینـە سـەر فەلسەفە لە ئەدەبدا. مەبەستم لەم بابەتە چەند شتێكە. با هـەر ڕۆمـان بـە نموونـە بهێنینـەوە. فەیلەسـووفی ناسراو هـەن (یان بیرمـەندی لـە فەیلەسـووف چـوو، وەكـو ڤۆڵتـێر) كـە ڕۆماننووسیش بوون؛ بۆ نموونە ڕۆسۆ یان لەم سـەردەمەدا ژان پـۆڵ سـارتەر. پاشـان، ڕۆماننووسـی وا هـەن كـە كەوتوونەتـە ژێـر كاریگەریی بیروبۆچوون و مانـای فەلسـەفیەوە. تۆلستۆی پاشبەندێكی خستۆتە سـەر ڕۆمـانی (شەڕو ئاشتی) و تیایدا ئەوە ڕوون دەكاتەوە كە لەم ڕۆمانەدا ویستوومە فەلسەفەیەكی مێژووی دیاریكراو بەیان بكەم. ئێگزیستانسیالیستەكان (وجودییـەكان) دۆستۆیڤسـكی بـە گـەورەترین نووسەری ئێگزیستانسیالیست لە قەڵەم دەدەن. پرۆسـت لـە ڕۆمـانی (گـەڕان بـەدوا زەمـەنی ونبـوودا) زۆر بـە قووڵـی نیگـەرانی مەسـەلەی ماهیەتی زەمەنە كە لە مەمانكاتدا یەكێكە لەو شتانەی هەر لە زووەوە فەیلەسووفان بایەخیان پێداوە. ئایا دەكـرێ ڕاوبۆچونـی خۆتـان لـەم بارەیـەوە بخەنـەڕوو كـە فەلسـەفە چ ڕۆڵێـك لـە ڕۆماندا دەبینێت؟*

**مێردۆك:** من هیچ "ڕۆڵێكی گشتی" بـۆ فەلسـەفە لـە ئـەدەبدا نـابینم. ڕاسـتە خـەلكی بـاس لـە "فەلسـەفەی" تۆلستۆی دەكـەن، بـەڵام لـە ڕاستیدا ئەمـە دەربڕینێكـی بـاوە. برناردشـۆ نموونەیـەكی ترسناكی ئـەو نووسەرانەیە كـە بە هەڵـە وا دەزانـن "فەلسـەفە"یـان هەیـە. خۆشـبەختانە "بیروبۆچوونەكان"ی ئەو گوریزیان لـە شـانۆنامەكانی نەوەشاندووە. كاتێ تی. ئێس. ئیلیوت دەڵێـت كـاری شاعیر بیركردنەوە نی‌یە و نـە دانتـێ و نـە شەكسپیر نەیانتوانیوە بیربكەنەوە؛ من لە مەبەسـتی تێدەگـەم، هەرچـەند مـن خـۆم ئـەم شـتە بـەمجۆرە دەرنـابڕم. گومان لەوەدا نی‌یە كە نووسەران هـەم دەكەونـە ژێـر بیروڕاكانی سـەردەمی خۆیانـەوەو دەشـێ گرنگـی بـە گۆڕانكارییە فەلسەفیەكانیش بدەن، بـەڵام بـە بـڕوای من دەتوانن كەم گوزارشـت لـە بـڕی ئـەو فەلسـەفەیە بكەن. بە بۆچوونی من هەر ئەوەندە فەلسەفە چـووە

ناو کاری ئەدەبییەوە؛ ئیدی دەبێتە یاری بەدەست نووسەرەوە.

لە ئەدەبدا هیچ جۆرە وشکیەك لە بیروبۆچوون و پاساودانەکاندا نییەو، ڕێگاکانیان جیاوازە و، بە جۆرێکی دی حەقیقەت ڕادەگەیەنرێ. ئەگەر فلانە "ڕۆمانی فیکری" کارێکی هونەریی خراپ بێت، وا چاکترە ئەو بیروبۆچوونانەی تیایدایە لە شوێنێکی تردا بخرێنە ڕوو. خۆ ئەگەر کارێکی هونەریی باشیش بێت، ئەو بیروبۆچوونانە دەگۆڕێن (یان هەروەکو لای تۆلستۆی دەیبینین) لە شێوەی ڕامانی پارچە پارچەدا دێنە پێشچاو کەلە پێناوی تەواوکردنی چیرۆکەکەدا بەرگەیان دەگرین. لە کارەکانی ڕۆماننووسە گەورەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا بڕێکی زۆر "یاری لەگەڵ بیروڕا"دا هەیە کە کەس لاریی لێیان نییە؛ بەڵام نابێ بە فەلسەفەیان لە قەڵەم بدەین. ئەو هونەرمەندانەی کە وەکو ڕەخنەگر شت دەنووسن و دەربارەی هونەرەکەی خۆیان تیۆریزە دەکەن، گەرچی دەشێ لە فەیلەسووفان سەرنجڕاکێشتر بن؛ بەڵام هێندە "فەلسەفی" نین. کتێبەکەی تۆلستۆی "هونەر چییە؟" پڕە لە شتی سەیرو سەمەرە، بەڵام بیرۆکەیەکی قووڵی سەرەکی بە ئاشکرا تیایدا بەیان دەکرێ و ئەویش ئەوەیە کە هونەری باش هونەری دینییەو بەرزترین پەیبردنە دینییەکانی سەردەمەکەی لەخۆ دەگرێت. ڕەنگە بکرێ بڵێین کە باشترین هونەر ئەو هونەرەیە کە بە جۆرێك لە جۆران بۆ هەر نەوەیەك دین ڕووندەکاتەوە. ئەم بیرۆکەیە گەرچی بە شێوەیەکی فەلسەفی نەخراوەتە ڕوو، بەڵام لای من زۆر سەرنجڕاکێشە.

***ماگی:** من ڕام لەگەڵ ئێوەدا نییە. لە "شەڕو ئاشتی"دا تۆلستۆی دەڵێت یەکێك لە مەبەستەکانی نووسینی ئەم ڕۆمانە ئەوەبووە کە گوزارشت لە فەلسەفەیەکی تایبەتی بۆ مێژوو بکات. یان بڕوانە یەکێك لە ڕۆمانە ئینگلیزییە سەرەکیەکان کە "تریسترام شاندی"یەو نووسینی "لۆرانس ستێرن"ە، کە نەك هەر ڕاستەوخۆ لە ژێر کاریگەریی تیۆرەکانی "لۆك"دایە دەربارەی بەدوایەکدا هاتنی ماناکان، بەڵکو ئەوە لە ڕۆمانەکەدا دەوترێ و لە شێوەی کۆمەڵێك ڕستەو دەستەواژەی ئاشکرادا. بە واتایەکی دی، ستێرن بە خواستی خۆیو بە ئاگایانە دەست دەداتە کارێك کە خۆی بە تیۆرەی بەدوایەکدا هاتنی ماناکانی "لۆك"ەوەی دەبەستێتەوە. کەواتە لە ڕاستیدا ڕۆمانی گەورە هەن کە تیایاندا سوود وەرگرتن لە بیروڕا یان مانا فەلسەفیەکان بەشێکە لە بونیادی ڕۆمانەکە.*

**مێردۆك:** نازانم، دەشێ مەسەلەکە ئەوە بێت کە من خۆم پێم خۆش نییە "مانای فەلسەفی" بخزێنمە ڕۆمانەکانمەوە. ڕەنگە هەندێ شت دەربارەی فەلسەفە بناخنمە ناویانەوە، لەبەرئەوەی زانیاریم سەبارەت بە فەلسەفە هەیە. ئەگەر دەربارەی کەشتیی چارۆکەداریش شتم بزانیبایە، لە ڕۆمانەکانمدا دەربارەیانم دەنووسی. حەزیش دەکەم بڵێم کە من وەکو ڕۆماننوسێك حەزم دەکرد زیاتر شتم دەربارەی کەشتییە چارۆکەدارەکانەوە بزانیبایە؛ نەك فەلسەفە. بێگومان ڕۆماننووسان و شاعیران بیردەکەنەوە، گەورەکانیشیان وا بە باشی بیردەکەنەوە کە کەسیان ناگاتێ (ئەگەر قسەکەی تی. ئێس. ئیلیوتیش وەکو خۆی وەربگرین، ڕاست نییە)، بەڵام ئەمە مەسەلەیەکی دیکەیە. تۆڵستۆی یان کەسێکی دی دەشێ بڵێت من بە مەبەستی "گوزارشتکردنی فەلسەفیانە" دەنووسم، بەڵام بۆچی دەبێ وا بزانین کە ئەو لەم کارەیدا سەرکەوتووە؟ ڕۆمانەکانی ڕۆسۆو فۆلتێر نموونەی بەهێزی "ڕۆمانی فیکری"ن و لە سەردەمی خۆشیاندا زۆر کاریگەر

بوون. بەڵام ئەمڕۆ سولاو و مردوو دێتە بەرچاو و، ئەمەش تاوانێکە لە ئەستۆی ئەو جۆرە ڕۆمانەدایە. ڕۆمانێکی فەلسەفیی باش کە دێتە یادم و زۆریش ستایشی دەکەم ڕۆمانی "هێڵنج"ی ژان پۆل سارتەرە کە تیایدا هەم توانیویەتی هەندێ بیروڕای سەرنجڕاکێش سەبارەت بە ئیمکان Cointingency و هۆشیاری بەخود بخاتەڕوو، هەم توانیویەتی کارێکی هونەری بخولقێنێت کە مەرج نییە لەبەر ڕۆشنایی گەڕانەوە بۆ کارە تیۆرییەکانی بخوێندرێتەوە.

ئەمەش شتێکە کەمجار ڕوودەدات. هەڵبەت کتێبەکە لە ڕووی فەلسەفیەوە هێشتا "تازە"یە.

*ماگی: زۆر چاکە، با هەر قسە لەسەر "هێڵنج"ەکەی ژان پۆل سارتەر بکەین. منیش لەگەڵ ئێوەدام و وایدەبینم کە "هێڵنج" ڕۆمانێکی جوان و بەرزە. بەڵام ئایا ئێوە لەو بڕوایەدا نین کە تیۆرەیەکی فەلسەفیی تیادا ڕاڤە کراوە؟ ڕاڤەکردنی تیۆرەیەکی فەلسەفی بەسەرکەوتوویی‌یەکی تا ئەو ڕادەیە لە چیرۆکێکدا؛ هەندێ جار دانسقەیە؛ بەڵام ئەمەش خۆی لە خۆیدا مانای ئەوەیە کە ئەو کارە ئەستەم نییە و ئەکرێ. وای بۆ ئەچم لە نێوان من و تۆدا جیاوازییەکی گرنگ هەبێ لە بیروبۆچووندا کە هەروا بە ئاسانی لەم گفتوگۆیەدا یەکلا ناکرێتەوە. بەڕای من تۆ ئەتەوێ بڵێیت کە فەلسەفە، وەکو فەلسەفە خۆی، لە کارە هونەرییەکاندا جێی نابێتەوە، مەگەر وەکو هەر شتێکی دیکە وەکو کەرەسەیەکی خاو بێت. منیش ئەمەوێ بڵێم کە لە هەندێ ڕۆمانی گەورەدا بە جۆرێک بیروڕاو مانا فلسەفیەکان بەکاربراون نەك وەکو کەرەسەی خاو، بەڵکو بەتانوپۆی بونیادی کارەکەدا بڵاوبوونەتەوە.*

**مێردۆك:** دەشێ سارتەر حاڵەتێکی تایبەتی بێت. تەنانەت لە کاری فەلسەفیی پێشوویشیدا جۆرە "هەست"ێکی ئەدەبی هەیە. "بوون و نەبوون" پڕە لە "وێنەو گفتوگۆ". سارتەر لایەنە دراماتیکەکانی فەلسەفەی هیگڵ پەسەند دەکات کە پڕە لە نموونەی مێژوویی و تیایاندا بزاوتی فیکر لە چوارچێوەی ڕووبەڕووبوونەوەو دژایەتیدا بەدی دەکرێ. "بیروڕا" یان "ماناکان" زیاترو باشتر لە شانۆدا جێیان دەبێتەوە، هەرچەند (بۆ نموونە لە حاڵەتی برناردشۆدا) دەشێ لێرەشدا جۆرە وێناکردنێکی پووچ ڕۆڵی هەبێت. نازانم بوونی ئەنگێزەی بەهێزی تیۆری تا چ ڕادەیەك گورزی لە شانۆنامەکانی سارتەر وەشاندووە. بەڵام بەدڵنیاییەوە کاتێ تەواوی ڕۆمانەکانی سارتەرو هەروەها ڕۆمانەکانی سیمۆن دی بۆڤوار (کە من هەموویانم خۆشدەوێن) دەخوێنینەوە، دەتوانین هەست بەوە بکەین کاتێ "دەنگی ئێگزیستانسیالیستانە –وجودیانە–" بەرز دەبێتەوە کارە هونەرییەکە چەند وشك و ڕەق دەبێت. بۆیە بە شێوەیەکی گشتی من ناڵێم بونیادی قووڵی هەر کارێکی ئەدەبی دەشێ فەلسەفی بێت. ئەست (لاشعور) فەیلەسووف نییە. هونەریش کەم تا زۆر زیاتر ڕۆدەچێتە قووڵاییەکانەوە نەك فەلسەفە. فیکر کاتێ ڕوو لە دونیای هونەر دەکات گۆڕانی بەسەردا دێ. تەماشەکە چەند بیرۆکەی جوان لای شەکسپیر هەیەو چۆن ئێزادۆر لەبەرچاو ون دەبێ. هەڵبەت تێڕامانەکانی هەندێ لە نووسەران ئاشکرا ترە، بەڵام هەروەکو لای دیکنز ئەمە دەبینینەوە، ئەم تێڕامانانە لە ڕووی هونەری یان ئێستاتیکیەوە بەهادارن، لەبەرئەوەی بۆ نموونە لە ڕێی کەسێتییەکانەوە لەگەڵ بونیادە نائەبستراکتەکاندا پەیوەندی پەیدا دەکەن. کاتێ دەپرسین فلانە ڕۆمان دەربارەی چییە، داوای شتێکی زۆر دەکەین. نووسینەکانی پرۆست دەربارەی چین، ئەی کەواتە بۆچی نەچین

برگسۆن خۆی بخوێنینەوە؟[9] هەمیشە شتێکی ئاکاری هەیە کە لە ئاستی بیروڕاکان (بیرۆکەکان) خوارتر دەڕوات. بونیادی کارە ئەدەبییە باشەکان بەندە بە نهێنیە ئیرۆتیکیەکان و ململانێ تاریک و قووڵەکانی نێوان چاکە (خیر) و خراپە (شر).

*ماگی: ئەگەر "شتێکی ئاکاری هەبێت کە لە ئاستی بیروڕاکان خوارتر بڕوات" و ڕۆماننووس مامەڵەی لەگەڵدا بکات، مانای ئەمە ئەوەیە کە چیرۆکنووسێ بە ناچاری وا لە نووسەر دەکات کە لەگەڵ شتە لە پێشوەخت سەپێنراوە ئاکاری -فەلسەفییەکان و تەنانەت ئاکاری- میتافیزیکیەکاندا تێهەڵچێت. مەبەستی من لەم ڕستەیە ئەوەیە کە لە بنەڕەتدا هەر جۆرە چیرۆکێك و هەر جۆرە وەسفێك بە ناچاری دەچێتە ژێر نرخاندنەوە، ئەمەش نەك هەر لەو وشانەدا کە بەکاریان دەبەین، بەڵکو لەو شتەدا کە بۆ گێڕانەوە یان وەسف هەڵیدەبژێریت. بەم پێیە مومکین نییە نرخاندن نەبێتە بەشێك لە بونیادی نووسینەکە. هەر جۆرە توێژینەوەیەکیش دەربارەی ئەوەی ئەم نرخاندنانە چین و، تەنانەت هەر باسێکی جیددیی ڕەخنەییش دەربارەیان، تا ڕادەیەك کارێکی فەلسەفییە. ئەو چیرۆکەی کە دەینووسین ئەگەر چیرۆکێکی جیددی بێت و دەربارەی تاکەکەسان و پەیوەندیی نێوانیان بێت، بە هیچ جۆرێك ناتوانیت خۆت لە ئاشکراکردنی گەلێ شتی لە پێشوەخت سەپێنراوی ئاڵۆز و قووڵی ئاکاری بپارێزیت.*

**مێردۆك:** لەگەڵتام. ناتوانین خۆمان لە نرخاندن بپارێزین. لە ئەدەبدا بەهاکان خۆیان پیشان دەدەن و بە ئاشکراش خۆیان پیشان دەدەن. بۆ نموونە هەندێ ڕاوبۆچوونی باوی گرنگ هەن دەربارەی دین و کۆمەڵگاو وابەستە بە "ئەتمۆسفێری بگۆڕی فیکر"ەوە. لە نێوچوونی باوەڕی گشتی بە دین و زنجیرەی پلەوپایەی کۆمەڵایەتی بە قووڵی کاریگەریی لەسەر ئەدەب کردووە. هۆشیاری بە خۆمان بەردەوام لە گۆڕاندایەو، دەشێ ئەم گۆڕانە بەر لەوەی لە تیۆرەکاندا بکەوێتە ژێر ڕاڤەو لێکدانەوەوە لە هونەردا خۆی بخاتەڕوو، هەرچەندە دەشێ تیۆرەکانیش دواتر کاریگەرییان بۆ سەر هونەر هەبێت، جێی خۆیەتی لێرەدا باسی پەیڕەوکەرانی یەکێك لە ڕێبازە هاوچەرخەکانی ڕەخنە بکەین کە گرنگیەکی تایبەتی بە گۆڕانکاریەکانی "هۆشیاری بەخود" دەدەن. مەبەستم فۆرمالیستە ئەدەبیەکانە کە ویستوویانە لەسەر بناغەی بونیادگەر لە فەلسەفەدا جۆرە شێوازێکی ڕەخنەی ئەدەبی بهێننە ئاراوە. بونیادگەر (ستروکچرالیزم-*Structuralism*) لە فەلسەفەدا بە ڕوانینێکی زۆر گشتی دەوترێ کە لە بیروبۆچوونەکانی بیرمەندانێکی وەکو "سۆسۆر" و "لیڤی شتراوس"ەوە لە زمانناسیدا سەرچاوە دەگرێت.

*ماگی: ڕاستە، وەکو وتتان، بونیادگەریی لە زمانناسییەوە سەرچاوەی گرتووە، بانموونەیەکتان بۆ بهێنمەوە. گریمان من و تۆ لە ڕێی گوتنی چەند ڕستەیەکەوە لەگەڵ یەکتردا لە پەیوەندیداین کە هەر یەکێکیان لە چەند وشەیەك پێکهاتووە. ئەگەر کەسێك بیەوێت لە مەبەستی ئێمە بگات: بە تەنها ئەوە بەس نییە ئەو وشانە بزانێت کە ئێمە بەکاریاندەهێنین؛ بەڵکو دەبێ لەگەڵ سەرجەم سیستمی زمانەکەدا ئاشنابێت، واتە لەم حاڵەتەی ئێمەدا لە زمانی ئینگلیزی. مەسەلەکەش لێرەدا بریتییە لە کاردانەوە بەرامبەر بۆچوونێك کە لە سەدەی نۆزدەیەمداو لە ئەنجامی پێشکەوتنی زانستەوە هاتە ئاراوە، واتە ئەو بۆچوونەی کە دەڵێت بۆ تێگەیشتن لە*

*شتێك؛ دەبێ ئەو شتە بەش بەش بكەین و، وەكو دەڵێن بیخەینە ژێر میكرۆسكۆبەوە. بیرۆكەی سەرەكی لە بونیادگەراییدا بریتی‌یە لە كاردانەوە بەرامبەر بەم بۆچوونە كە دەڵێت: "نەخێر، تاقە ڕێگایەك بۆ ئەوەی بتوانیت بە ڕاستی لە دیاردەكان بگەیت، بەستنەوەیانە بە بونیادی فراوانترو گەورەترەوە. تەنانەت چەمكی توانای تێگەیشتن خۆیشی بەندە بە بەستنەوەی شتەكان بە بونیادەكانەوە".*

*پراكتیكردنی ئەم بۆچوونە لە ئەدەبدا بەوە شكاوەتەوە كە هەر نووسینێك بە پلەی یەكەم بریتی‌یە لە بونیادێكی وشەیی.*

**مێردۆك:** بەڵێ. ئەم بۆچوونە نیشانەی جۆرە هۆشیارییەكە بە خود كە ئاوێتەیە بە نیگەرانی سەبارەت بە زمان، ئەمەش لانی كەم لە سەردەمی "مالارمێ"وە لە ئەدەبدا دەبینرێ، جگە لەوە لە فەلسەفەی شیكردنەوەی زمانیشدا بەدەردەكەوێ. بەم پێیە دەتوانین بڵێین كە "ڤیتگنشتاین"یش "بونیادگەرا" بووە. لە نامەی مەنتیقی – فەلسەفی (بەندی *262-3*)یەكەیدا دەنووسێت: "ئەو شتەی نیشانەكان لە توانایاندا نی‌یە گوزارشتی لێ بكەن، بەكارهێنانیان پیشانی دەدات". ئەم تیۆرەیە لە زۆر لایەنەوە تازە نی‌یە؛ كۆمەڵێك باوانی ناساز لە ئەدەب و فەلسەفەدا هەن، وەكو دیاردەناسەكان (فینۆمینۆلۆژیستەكان) و سوریالیستەكان و سارتەر، تێزێكی بەناویەكداچووی تەنیاش نی‌یە (كە هەموو ئەمانە لەگەڵ یەكدا كۆبكاتەوە). "گۆڕانی هۆشیاری بەخود" كە جێی بایەخی فۆرمالیستەكانە، دوای هۆشیاریمان دێ بەخۆمان بەو سیفەتەی كە گیانەوەرین و لە نیشانەكان سوود وەردەگرین: گیانەوەرانێك كە لە ڕێی دەلالەت بەخشینەوە جیهان و خۆیان "دادەمەزرێنن". ئەمەش یەكێكی ترە لە گریمانە فەلسەفی یا نیمچە فەلسەفیەكان، كە وەكو گریمانە ماركسیستیەكان، لە توانایدایە كاریگەری لەسەر ئەدەب بكات. جۆرە ئایدیالیزمێكە لە ئەدەبدا یان باوەڕ بە تاكپرنسیپی (مۆنیزم-*Monism*)[5]. فۆرمالیستەكان دەیانەوێ لەو شتە ڕزگارمان بكەن كە پێی دەوترێ "بەهەڵەداچوونی واقیعی *The realist fallacy*"[6]، واتە ئەو تەسەورەی كە دەتوانین لە ڕێی زمانەوە بڕوانینە جیهانێكی جیا كە دەكەوێتە سەروو زمانەوە.

ئەگەر زمان جیهان دروستبكات، ئیدی ناتوانێ ببێت بە دەلالەت بۆ ئەو جیهانە. دەبێ نووسەر سەرنجی ئەوە بدات كە لە "جیهانی دەلالەت"دا دەژی و دەجوڵێتەوە، نابێ وا بزانێ كە دەتوانێ لەو جیهانە بچێتە دەرێ، یان لە ژێر تۆڕی نیشانەكان قوتار دەبێت. ئەم تیۆرەیە وا لە گەلێ لە فۆرمالیستەكان دەكات هێرش بكەنە سەر ڕۆمانی ڕیالیستی، هەروەها هێرش بكەنە سەر داب و نەریتی باوی ئەدەب "ی ئاسان" كە تیایدا زمان وەكو وەسیلەیەكی سادەو بێ گرنگیدان بە خودی زمان خۆی دەردەكەوێت. چیرۆكی باو و شتی باو و "خۆ"ی باو، هەریەكەیان بریتی‌یە لە كۆمەڵێك ئەنگێزەی مەحكەم و كۆنكرێتی و "گشتێكی درۆزن"ە كە لە ئەنجامی بەدحاڵیبوونی زمانەوە هاتۆتە ئاراوە. ئەم بیرۆكەیە كە "خود" یان "خۆ" یەك شت نی‌یە؛ دەگەڕێتەوە بۆ هیوم، پێشینەی ئەو بڕوایەش كە زمان دابڕانی سەرەتایە دەگەڕێتەوە بۆ ئەفلاتون. لە بزاڤی ڕۆمانتیزم بەملاوە، ژمارەیەك لە ئەدیبان سەریان بەم بیروڕایانەوە قاڵ بووەو فۆرمالیزم دوا هەوڵی دیسپلینكراوە بۆ شیكردنەوەو ڕوونكردنەوەی ئەو شتەی ئەمڕۆ بووەتە بزاڤێكی درێژخایەن و ناساز. تەقەللایەكی وەكو ئەمە بێگومان بەهادارەو مایەی سەرنجە، بەڵام ئەتمۆسفێرو زاراوەكانی بۆمن زیاد لە پێویست بێزاركەرە. بە ڕای من، گۆڕانی ئەدەبی زۆر لەوە

نهێنینامێزترەو کەمتر خاوەن یەکپارچەیی (وحدت)یە کە ئەو جۆرە ڕەخنەگرانە وایدەبینن و، فرەیی شێوە ئەدەبییەکانیش قووڵترە لەوەی ئەوان دەیڵێن. فۆرمالیزم لە شێوە توندوزێدەڕۆکەیدا دەشێ بگۆڕێ بۆ تیۆرەیەکی میتافیزیك، کە وەکو زۆربەی ئەم چەشنە تیۆریانە ئکووڵی لە جیاوازیی سوودمەندو پێویست لە نێوان "خۆ"و جیهان و هەروەها جۆرەکانی بەکارهێنانی دەلالەتیانەی زمان دەکات. هەر هونەرمەندێك بگریت دەزانێ لە جیهان ڕوانین یانی چی و، مەودای لەگەڵ جیهانداو جیابوونی لێی یەکێکە لە گرنگترین مەسەلەکان. وەختێ دکتۆر جۆنسن بە نووکی پێ شەقی لە بەردێك هەڵداو بەم شێوەیە تیۆرەی بارکلی[7] "رەت کردەوە"، دەیویست ناڕەزایی خۆی لە ئاست جۆرە هەوڵێکی میتافیزیکیدا پیشانبدات کە دەیەوێ جیاوازییەکی پێویست لەناوبەرێت، لەوەشدا هەقی بوو. نووسەر خۆی هەڵدەبژێرێت و چۆنی بوێت و بتوانێ ئاوەها زمان بەکاردێنێت و، هیچ تیۆرەیەکیش نابێ بیترسێنێت و وای تێبگەیەنێت کە ناتوانێ چیرۆکێکی سادە بنووسێت و دەبێ ئازار بچێژێت و دەقی وەها بخولقێنێت کە لەگەڵ پێوەرە ئاساییەکاندا کە قابیلی تێگەیشتنن؛ لە شەڕدا بێت. هەندێ لە فۆرمالیستەکان وەکو بەشێك لە ڕێسا تیۆرییەکانی خۆیان هەوڵیانداوە "پۆیتیکا"[8] یەك بهێننە ئاراوە، واتە جۆرە تیۆرەیەکی نیمچە زانستیی بێلایەن (و بێ نرخاندن) کە پەیوەندیی لەگەڵ ئەدەبدا وەکو پەیوەندیی زمانناسی‌یە لەگەڵ زمانی سروشتیدا. بەڵام ئەم "سەروو- زمان" (میتازمان- *Metalanguage*)ە دەبێ بە شێوازێك بێلایەنانە (و بێ نرخاندنانە) توخمە بونیادیەکانی بابەتەکە دیاری بکات و، ناشزانرێ ئایا لەم بارەیەوە سەرکەوتوو دەبێ‌و "توخمە" بونیادییەکانی ئەدەب دەدۆزێتەوە. بە ڕای من دوور نی‌یە کە هەر لە یەکەمین قۆناغدا تەواوی جیاوازییە گرنگەکان لە بیروبۆچووندا دەربکەون و "میتا-زمان" بەو نرخاندنە "لەوتاو" بکەن. بەم پێیە ئەمجۆرە تیۆرەیەش دیسانەوە ڕەخنەی ئەدەبی بەرەو شتی دی ڕاپێچ دەکات، مەگەر ئەوەی زیاد لە پێویست گشتی و سادە بێتەوە.

کاری ئەدەبی شتێکی دانسقەیەو پێویستی بەکاردانەوەی دانسقەو ئازادیشە. جگە لەوە، ڕەخنەی ئیستاتیکی هەم جۆرێك لە گشتێتی دەگرێتە خۆی‌و هەم پەیوەندییەکی "بە ڕواڵەتانە- *Ostensive*" سەبارەت بە شتێکی تایبەتی کە وەرگر لێی دەڕوانێت کاتێ ڕەخنەگر دەدوێت. هەڵبەت زۆربەی کات قوتابیان دەیانەوێ بە پشتبەستن بە "تیۆرەیەکی دیاریکراو لە ڕەخنەی هونەری" ئاسوودەو دڵنیابن، لەبەر ئەوەی سادەکاری دەبێتە هۆی ئەوەی ئەرکی بیرکردنەوەی سەریەخۆیان لە کۆڵ بێتەوە. بەڵام وا باشترە بۆ ڕەخنەگران تیۆرەیەکی ئامادەی زانستی یا فەلسەفی‌ی دیاریکراو نەبێتە باککگراوەندی بیروبۆچوونەکانیان. ڕەخنەگری باش کەسێکە خاوەن زانیارییەکی ئینسایکلۆپیدیا ئاسایە، بەڵام بەبێ زۆر لە خۆکردن. ئەنجامگیرییەکی خەتەرناکی تریش کە من پێم قبووڵ نی‌یە ئەوەیە کە کەسێك کە بە هیچ تیۆرەیەکی تایبەتیەوە وابەستە نی‌یە؛ کەواتە پابەندە بە تیۆرەیەکی "بۆرژوایی"ەوە. بێگومان ئێمە هیچ چارێکمان نی‌یە جگە لەوەی لەناو سنووری مێژوودا بژین، بەڵام وەکو کەسانێکی ڕەخنەگرو بیرمەندو کەسانێك کە بە گوێرەی ڕێساکانی ئاکار کاردەکەین؛ دەتوانین هەوڵبدەین لە غەریزەو تێڕوانینەکانی خۆمان بگەین و بەها ڕاستەقینەکان لە قەناعەتە باوەکان و داب و نەریتە کوێرانەکان جیا بکەینەوە. "چاخی بۆرژوایی" هەندێ وێنای ئاکاریی بە ئێمە بەخشیوە، وەکو وێنای ماف و ئازادییە تاکە

کەسیەکان، کە دەتوانین بڵێین بەهاگەلێکی سەقامگیرو هەمیشەیین؛ هەروەها ئەدەبێکی بەرزیشی هێناوەتە ئاراوە کە گەرچی هەندێ ئەریتی سواوی تیا بەدی دەکرێ، بەڵام بەرگری لە بەهاگەلێك دەکات کە تا ئێستا بۆ ئێمە گرنگن. لێرەدایە کە دەتوانین پشت بە چەمکێکی سروشتی مرۆڤایەتی ببەستین کە پێشینەکەی دەچێتەوە بۆ یۆنانیەکان. ئەو ڕاستییەی گرنگە ئەوەیە کە ئێمە تا ئێستاش لە هۆمیرۆس و ئەسخیلۆس دەگەین. ئەدەب گوێزەرەوەو داهێنەری سەرەکیی ئەم تێگەیشتنە درێژخایەنەیە. هەر تیۆرەیەك پەیوەندیی خەڵك لەگەڵ کارە گەورەکانی ئەدەبی ڕابردوودا بپچڕێنێت، بە تەنها نابێتە هۆی بێبەشبوونیان لە پەروەردەیەکی مێژوویی و ئاکاری؛ بەڵکو لە کۆمەڵێك لەزەتیش بێبەشیان دەکات.

*ماگی: لە شێوەکردەییەکەیدا؛ کارێکی ئەدەبی کە لە ژێر کاریگەریی تیۆرە فۆرمالیستیەکاندا بێتە ئاراوە؛ کارێك دەبێت بۆ ژمارەیەك لە پسپۆڕان، نەك بۆ خەڵك. ئاوەزی دروستیش جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە زمان بە دونیای شتەکان و خەڵکەوە بەستراوەتەوە، ئەمەش بە ڕای من کۆڵەکەی پێویستی هەر کارێکی ئەدەبییە کە بیەوێ خوێنەری زۆری هەبێت و لە ڕاستیشدا کارەکانی زۆربەی هونەرمەندە گەورەکان، لە شەکسپیرەوە بیگرە تا ئەوانی دی، لەسەر ئاستێکی فراوان خوێندراونەتەوەو بەرز ڕاگیراون. من پێویستە دان بەوەدا بنێم کە لەم گفتوگۆیەدا بە هیچ جۆرێك بێلایەن نیم. نە لە ئەدەبداو نە لە فەلسەفەشدا حەز بەوە ناکەم خودی وشەکان ببنە بابەتی گرنگی پێدانی سەرەکی. من وای بۆ دەچم لە هەردوو بوارەکەدا، پێویستە وشە وەسیلەیەك بێت بۆ پەیوەندیکردن بە جیهانەوە، بەشێوەیەکی گشتیش جیهانی مرۆڤەکان یان شتەکان یان سروشت و یاخود کێشەکان و یان بیروبۆچوونەکان و یانیش کارە هونەرییەکان.*

**مێردۆك**؛ بەڵێ، بەڵام وای بۆ دەچم کە بڕیارەکە لە دەستی هونەرمەند خۆیدایە کە بیەوێ چۆن وشەکان بەکاربهێنێت. لەوانەیە نووسەری وا هەبێت کە هەرگیز ناوی فۆرمالیزمیشی نەبیستبێت بە جۆرێك بنووسێت کە ببێتە جێی سەرنجی فۆرمالیستەکان. تریسترام شاندی و بە ئاگاهاتنەوەی فینیگان[9] بە بێ هیچ جۆرە تیۆرەیەك دوو کاری هونەریی بەرزن.

ئێمە تیۆرەکان لەو ڕووەوە داوەری دەکەین کە تا چەند توانای ڕوونکردنەوەی حاڵەتەکان و مەسەلە باوەکانی هەیە، لەمەشدا لەسەر هەقین. ئەگەر تیۆرەیەك هێرش بکاتە سەر هەندێ دیاردە کە ئێمە پێیان هۆگرین؛ بێلایەن نابین. من دەزانم کە نووسەران و شاعیرانی گەورەی ڕابردوو چ کەسانێك بوون و خۆم نادەمە دەست تیۆرەکان، بە پێچەوانەوە، تیۆرەکان بەوان هەڵدەسەنگێنم. ئەگەر بتوانین لێرەدا وشەی شێوە (یا فۆرم) بەکاربهێنین، ئەوا دەڵێین لەوێوە کە ئەدەب هونەرە؛ بریتییە لە خولقاندنی ئەو شتانەی خاوەنی شێوەن (فۆرمال) و بە مانایەك لە ماناکان خۆیان تەواو دەکەن. شیعر یا شانۆنامەو یان ڕۆمان شێوەیەکی داخراوە، بەڵام لە سەرێکی ترەوە کراوەیە، لەبەرئەوەی دەچێتەوە سەر بوون یان ڕاستییەکی سەروو خۆی، یان دەلالەتیان بۆ دەکات، ئەم دەلالەتکردنەش کۆمەڵێك مەسەلە دەربارەی حەقیقەت دەهێنێتە پێشەوە کە پێشتر ئاماژەم بۆ کردن. هونەر هەم حەقیقەتەو هەم شێوە (یا فۆرم)؛ هەم نیشانە یا نمایش (ی شتێکی دیکەیە)و هەم سەربەخۆیە. بێگومان دەشێ پەیوەندیی نێوان ئەم دووانە ناڕاستەوخۆ بێت، بەڵام ئەم دوو لایەنییە یان

ئــەمومژەی کــە نووســەر یــا شــاعیری گــەورە دەیخولقێنێت فەزای وا دەهێنێتە ئاراوە کە دەتوانـین تیایاندا بتۆزینـەوەو چێژ وەربگرین، لەبـەر ئـەوەی ئەمجۆرە فەزایانە دەرگا بەڕووی جیهانی ڕاستەقینەدا دەکەنەوەو بە تەنها گەمـەی زمانـەوانی‌ی شێوەییانە یـان خـەیاڵاتی تایبـەتی نـین. بەدەسـت نووسـەرو شاعیرە گەورەکانەوە مـاندوو نـابین، چونکـە ئـەوەی ڕاسـتەقینە بێـت سەرنجڕاکێشـە. ئـەو بۆچوونـەی تۆلستۆی لەم بارەیەوە کە هونەر ماهیەتێکی دینـی‌ی هەیە لێرەدا جێی خۆی دەگرێت. هەروەکو وتم، هـەر هونەرمەندێکی جیددی هەستێکی هەیە لەو مەودایەی خۆی لەگەڵ شتێکی دیکەدا کە لە ئاستیدا هەست بـە کەمی و بچووکیی دەکات، لەبـەر ئـەوەی دەزانـێ کـە ئـەو شـتەی دیکـە زۆر پڕتـرە لـە وردەکـاری و سەرسوڕهێنەرترو ترسـناکترە لەهـەر شـتێك کـە ئـەم بتوانێ گوزارشتی لێ بکات. ئـەم "ئـەوەی تـر"ە یـان "شتی تر"ە بە "ڕاستی" (یان بوون) یان "سروشت" و یـان "جیهان" ناودەبرێ، ئـەمجۆری ئەخاوتنـەش نابـێ واز لێ بـهێنرێ. جوانیـی هونـەری، نمایشـی خەیاڵیانەی شێوەی شتێکی ڕاستەقینەیە، ڕەخنـەش دەبێ ئازاد بێـت تـا بتوانـێ دەربارەی حەقیقـەت لـە هونـەردا داوەری بکـات. هونەرمـەندو ڕەخنـەگریش هەردووکیان هەم دەڕواننە نیشانەکەو هەم "شتەکانی تر"یش. بێگومان ئەم ڕوانینەش کارێکی هەروا سـادە نی‌یـە. فـێربوون لەهـەر هونەرێکیشـدا بریتی‌یـە لـە فێربوونی چۆنێتیی تۆزینـەوەی پێوەری حەقیقـەت. ئەمجۆرە فێربوونە لە ڕەخنەشدا هەیە.

***ماگی:*** *دوا خاڵ کە باسم کرد پەیوەندیی بە خودهوشیاری (خـود ئاگـامی)یـەوە هەیـە لـە بەکارهێنانی زماندا. ئێستاش دەمەوێ خاڵێکی تـر بخەمـەڕوو. یـەکێك لـە تایبەتمەندێتی‌یـە زەقـەکانی فەلسـەفە لـە سـەدەی بیسـتەمدا، بەتایبـەتیش لـە جیـهانی ئەنگلۆساکسـۆندا، جۆرە خولیایەکی تەواو تازە بووە بۆ زمان، لە ئەنجامیشـدا خودهۆشـیارییەکی تازەشـی لێ کەوتۆتـەوە دەربارەی بەکارهێنانی زمان کـە لـە توانایدایـە لــە بــەکارهێنانی وشــەکاندا تــا ئەوپەڕی زیرەکی و دڕدۆنگیمان ببات. ئایا ئەم شتە لە هیچ ڕێیەکەوە هاتۆتە ناو ڕۆمانیشەوە؟ تـۆ خـۆت یەکـەمجار فەلسـەفەت خوێنـدووەو بوویـت بـە فەیلەسـووف و پاشـان بوویـت بـە ڕۆمـاننووس؛ ئایـا ئـەوەی وتم لـە چۆنێتیـی ڕۆماننووسینی تۆدا کاریگەریی هەبووە؟*

**مێردۆك:** ڕاستە، لـە پـەیوەندیی ئێمـە لەگـەڵ زمـاندا جـۆرە قـەیرانێك هـەبووە، ئـەمڕۆش خودهۆشـیارییەکی زۆر زیاترمـان هەیـە، ئەمـەش شتێکە کاریگەریی بۆ سەر نووسەران دەبێت.

***ماگی:*** *یەکێك لە دەرەنجامـە ناچارییەکانی ئـەم مەسـەلەیەش ئـەوە بـووە کـە تـۆ چیـدی نـاتوانیت وەکـو ڕۆماننووسـەکانی سـەدەی نۆزدەیەم بنووسیت.*

**مێردۆك:** هەڵبەتە ئێمـە بـەهیچ جۆرێك هێنـدەی ڕۆماننووسەکانی سەدەی نۆزدەیەم بـاش نـین، بـەڵام نووسینەکانمان جیاوازن.

***ماگی:*** *ئەمـە مەسـەلەیەکی تـا بڵـێی سەرنجڕاکێشە، ئایا دەکرێ پێمان بڵێیت بۆچی ناتوانیت وەکو ئەوان بنووسیت؟*

**مێردۆك:** وەڵامدانـەوەی ئـەم پرسـیارە دژوارە. جیاوازیی ئاشکرا هەیە کە پـەیوەندییان بە ڕوانگـەی نووسـەرو پـەیوەندیی لەگـەڵ کەسـێتیەکانی چیرۆکەکـەدا هەیـە. ئـەم پەیوەندییـە گـەلێ شـت دەربارەی ڕوانینی ئاکـاریی ئـەو پیشان دەدات. ئـەو جیاوازییـە تەکنیکیـەی نێـوان ئێمـەو نووسـەرانی سەدەی نۆزدەیەم لە گۆڕانێکی ئاکارییەوە سـەرچاوە دەگرێـت کـە شـیکردنەوەی ئاسـان نی‌یـە. ئێمـە جەسارەتی ئەوانمان نی‌یەو دەترسین کە تـا زیـرەك و

کاڵ و سادە بێینە بەرچاو. پەیوەندیی چیرۆك بە هۆشیاریی نووسەرەوە بەو بەرفراوانییە نییە.

نووسەریش لە ڕێی هۆشیاریی کەسێتی یان کەسێتیەکانی چیرۆکەکەیەوە ڕووداوەکانی چیرۆکەکەی دەگێڕێتەوە. هیچ جۆرە داوەرییەك یان وەسفێکی ڕاستەوخۆ لە زمانی نووسەرەوە وەکو کەسێکی دڵنیا؛ لە ئارادا نییە. ئەمڕۆ ئەگەر کەسێك لەم ڕووەوە وەکو نووسەرانی سەدەی نۆزدەیەم بنوسێت فێڵی ئەدەبی بەکاردەهێنێت، هەندێ جاریش دەستی بۆ دەبرێ. هەروەکو پێشتریش وتم، بە بۆچوونی من بابەتی ئەدەب ململانێی نێوان چاکەو خراپەیە. بەڵام ئەم بابەتە لە ئەدەبیاتی ئەمڕۆدا بە ئاشکرا خۆی پیشان نادات، بەرامبەر بەوە، جۆرێك لە متمانە بەخۆنەبوون و کەم جەسارەتی هەیەو کەسێتیەکانیش تۆکمە نین. گۆڕانکارییە ئەدەبیەکان هۆیان زۆرەو، خودهۆشیاری دەربارەی زمان دەشێ یەکێك بێت لە کۆسپەکان نەك هۆیەکان. لەنێوچوون یان لاوازبوونی ئایینە سیستمدارەکانیش دەشێ یەکێك بێت لە گرنگترین ئەو شتانەی کە لەم سەد ساڵەی دواییدا ڕوویانداوە. نووسەرانی گەورەی سەدەی نۆزدەیەم بوونی ئایینیان بە شتێکی بەڵگەنەویست دەزانی. ئەمانی زنجیرەی پلەو پایەی کۆمەڵایەتیو ئایین، داوەری (هەڵسەنگاندن)ەکان نادڵنیاترو کاتی تر دەکات، بایەخدان بە دەروونشیکاریش ئاڵۆزییەکی زیاتر بە حوکمدانەکان دەدات. ئەم گۆڕانکارییانە هێندە سەرسوڕهێنەرن و هێند توانای تاقیکردنەوە بەرەو پێش دەبەن کەوا دێتە پێشچاو دەبووایە لەوانی پێشوومان باشتر بووینایە، بەڵام وا نین!

***ماگی: ورده ورده وا لە کۆتایی گفتوگۆکەمان نزیك دەبینەوە، بەڵام بەر لەوە حەزدەکەم کەمێك زیاتر لەسەر ئەوە قسە بکەین کە پەیوەندیی نووسەر بە کەسێتیەکانی چیرۆکەکەیەوە چ شتێك دەربارەی ڕوانگەی ئاکاریی ئەو ئاشکرا دەکات؟***

**مێردۆك:** گرنگە ئەوەمان لە یاد نەچێت کە زمان خۆی وەسیلەیەکی ئاکارییە، تاڕادەیەکی زۆریش هەر جۆرە بەکارهێنانێکی زمان بەهاکان دەگوێزێتەوە. یەکێك لەو هۆیانەش کە وامان لێدەکات هەمیشە لە ڕووی ئاکارییەوە چالاك بین ئەمەیە. ژیان و ئەدەب هەردووکیان ئاوێتەن بە ئاکار. ئەگەر بمانەوێ ئەم ژوورە وەسف بکەین، بەشێوەیەکی سروشتی وەسفەکەمان جۆرەها بەها لەخۆ دەگرێت. ڕۆمان تەنها بە شێوەیەکی دەسکردو لە پێناوی مەبەستە زانستیەکاندا لە زماندا هەڵدەگیرێ. بەمجۆرە، ڕۆماننووس هەرچۆنێك بنووسێت، ئەو بەهایانە ئاشکرا دەکات کە پێیانەوە پابەندە، بەتایبەتیش لەبەرئەوەی بابەتی نووسینەکەی ڕەفتاری ئادەمیزادەکانە، بە ناچاری دەبێ داوەری بکات. پێشتر وتم کاری هونەری هەم خاوەنی شێوە (فۆرم)ەو هەم لایەنی "می میسیس"، هەندێ جار ئەم دووانەش لەگەڵ یەکدا دژن. لە ڕۆماندا، دەشێ ئەم دژایەتییە لە شێوەی ململانێدا لە نێوان کەسێتیەکان و پلۆتی چیرۆکەکەدا دەربکەوێ. ئایا نووسەر بۆ ئەوەی کەسێتیەکانی چیرۆکەکەی لەگەڵ پلۆتی چیرۆکەکەیدا یان داوەرییەکانی خۆیداو بابەتەکەیدا تەبا بن؛ دەیانبەستێتەوە و ڕێکێفیان دەکات؟ یان وازیان لێ دەهێنێت تا بەبێ ڕەچاوکردنی پلۆتی چیرۆکەکە یان هەر جۆرە "ئاواز"ێکی زاڵ، خۆیان سەربەخۆ لەو و سەربەخۆ لە یەکتر گەشە بکەن؟ نووسەر چۆن پیشانمان دەدات کە کەسێتیەکانی چیرۆکەکە جێی پەسەندیی ئەون یان نین؟ چۆن لەسەرەقبوونی ئادەمیزادێکی باش دەسەلمێنێت و چۆنی دەناسێنێت؛ یان تەنانەت بە شێوازێکی ناڕاستەوخۆ ئەوە دەگەیەنێت؟ داوەریی ئاکاریی نووسەر ئەو هەوایەیە کە خوێنەر هەڵیدەمژێت. نووسەری خراپ خۆی دەداتە دەست دڕدۆنگیە فیکرییەکانی خۆیو بەبێ گرنگیدان بە هەق و عەدالەت، واتە بەبێ "پاساودان"ی هونەریی گونجاو؛ هەندێ لە کەسێتیەکان خۆشەویست و

هەندێکی تریان زەلیل دەکات. لێرەدا ئەوە ڕوونە کە وێناکردنی ڕاستی چۆن دێتە ناو داوەریی ئەدەبییەوە. نووسەری باش، داوەرێکی دادپەروەرو بەهەستە. ئەو شوێنەی دەیدات بەهەر یەکێك لە کەسێتییەکانی چیرۆکەکەی بەو ئەرکەی کە لەگەڵ کتێبەکەیدا دەیبینێت، پاساوی دەدات. خەوشی وەکو هەست و سۆزی ڕووکەش لەکاری ئەدەبیدا، لە ئەنجامی ئامانجڕێژیی بێ ئەرکەوە دێت. ئەرك و ماندووبوون دەشێ جۆری جیاوازی هەبێت، هونەری باشیش دەکرێ بەرهەمی شێوازە جیاجیاکانی ڕۆڵ و جێ بەخشین بە کاراکتەرەکان (کەسێتیەکان) و یان ڕێکخستنی پەیوەندییان لەگەڵ پلۆتەکە یان بابەتی چیرۆکەکە بێت. ڕەخنە سەروکاری لەگەڵ ئەم تەکنیکانەی کارەکەدا هەیە. نووسەری گەورە بە جۆرێك شێوە (یان فۆرم)ی کارەکەی ڕێك و شایستە بە کاراکتەرەکان دەسازێنێت (ئەوەندە بەسە سەیری شەکسپیر بکەین) کە بۆ ئەوەی کاراکتەرەکانی چیرۆکەکە بتوانن لە کاتێکا بە ئازادییەوە دەژین خزمەتی ئامانجی گێڕانەوەکەش بکەن؛ فەزایەکی بەربڵاو دەڕەخسێنێت. هەر کارێکی هونەریی گەورە هەست بە فراوانی و فەزایەکی کراوە لای مرۆڤ دروستدەکات.

***ماگی: ئایا ئەوەی دەیفەرموویت بەو مانایەیە کە لە دوا شیکردنەوەدا؛ ئەو نووسینەی کە توانای داهێنان و خەیاڵی تێدا بەکار براوە، لەگەڵ ئەمەشدا؛ لە بنەڕەتدا دەگەڕێتەوە بۆ جۆرە قبوولکردنێکی شتەکان وەکو ئەوەی هەن و، تەنانەت ڕێزگرتنیشیان؟***

**مێردۆك:** هونەرمەند عادەتەن بە مانایەك لە مانا جیاکان، کەسێکی شۆڕشگێڕە. بەڵام بە بۆچوونی من؛ هونەرمەندی باش خاوەنی جۆرە هەستکردنێکە بە ڕاستێتیی شتەکان و دەتوانین بڵێین کە تێدەگات "شتەکان چۆنن" و بۆچی بەو جۆرەن. هەڵبەتە ئەو ئیهامەی زاراوەی "ڕاستێتی" لە فەلسەفەدا دەیبەخشێ؛ لای هەموو ئاشکرایە، منیش بەو مانایە بەکاری دەهێنم کە هونەرمەند هەم دەڕوانێتە جیهان و هەم بەشێکی گەورەتر لە جیهانیش دەبینێت. هونەرمەندی گەورە شتی سەیرو سەمەرەی وەها دەبینێت کە ئێمە بەهۆی ئەو گرێ و شڵەژانە دەروونیانە مانەوە کە لە خۆپەسەندییەوە سەرچاوەیان گرتووە؛ نایانبینین. بەڵام ئەوەی هونەرمەندیش دەیبینێت شتێکی تایبەت و جیا یان وڵاتێکی دابڕاوو میتافیزیکی نییە. هونەرمەند بەشێکی گەورەی کەسێتیی خۆی لە کارەکەیدا دەکەوێتە ململانێوە، لە جیهانی هەستی ئاسایی و ئەقڵی دروستدا کاردەکات و ئەوەشی پێ قبووڵە. هونەر هەر بە سروشتی بریتییە لە پەیوەندیکردن لەگەڵ یەکترداو لێکحاڵیبوون (تەنها کەسانی هۆشمەندیش، ئەوانەی کە سەرسەختن و مێشکیان وشکە؛ دەشێ نکووڵی لەم ڕاستییە ئاشکرایە بکەن). ئەمەش پێویستی بە گرێدانەوەی دوورترین ڕاستیەکانە بەوەوەی کە نزیکترە، ئەمەش کارێکە کە پێویستە هەر پەیجۆرو توێژەرێکی ڕاستگۆ بیکات و پێویستە لەسەر ڕەخنەگریش ئاگای لەمە بێت. نیگارکێشیی ئەبستراکت کەی دەبێ بەهونەرێکی خراپ؟ ئەی کەی هەر بەهونەر نازمێردرێ؟ نیگارکێشیی ئەبستراکت خەیاڵات نییەو نایەوێ بە ئەنقەست توورەمان بکات، بەڵکو پەیوەستە بە ماهیەتی فەزاو ڕەنگەوە. هونەرمەندی ئەبستراکت لە دونیایەکدا دەژیو، تابلۆکانی لە دونیایەکدا دەبینرێن، کە تیایدا ڕای باو ڕەنگ بە ڕووکاری شتەکان دەزانێت و، ئاگاداریی ئەویش لەم شتە یەکێکە لە گرفتەکانی. ئەم جۆرە گرژییانە لە نێوان بینین و ڕوانینی هونەریدا لە سەرێکەوەو ڕاستێتی (یان حەقیقەت)ی "ڕەمەکی"دا لە سەرێکی ترەوە، دەشێ مایەی گەڵ هەڵسەنگاندنی جوان و دژوار بێت. ئەدەب پەیوەندیی بە چۆنێتیی ژیانی ئێمەوە هەیە. هەندێ لە فەیلەسووفان بڕوایان وایە کە "خود" لێکترازاوو بەش بەشە، هەندێ لە نووسەرانیش دەچنە وردەکاریی ئەم بیروبۆچوونەوە. بەڵام هەم نووسینی ئەو نووسەرانەو هەم فەلسەفەی ئەو فەیلەسووفانەش لە دونیایەکدان کە لەبەر گەڵ هۆی

بەهێز بڕوامان بە یەکپارچەیی "خود"ە تیایدا. هەڵبەتە ئەمە بەو مانایە نایەت کە بەرگری بێت لە نووسینی "واقیعیانە"؛ بەڵکو بەو مانایەی کە هونەرمەند ناتوانێ پشت بکاتە حەقیقەت و، بڕیاردانی ئەو لەسەر چۆنێتی‌ی وتنی حەقیقەت؛ گرنگترین بڕیاری ئەوە.

*ماگی: ئایا بۆ ئەوە ناچن کە قبووڵکردنی ڕاستی بەم شێوەیە بەرەو موحافەزەکاری ڕاپێچمان نەکات؟ مەبەستم لەوەیە کاتێ شتەکان و کەسەکان وەکو خۆیان قبووڵ دەکەین، ئەم جۆرە قبووڵکردنە دەشێ لە پەیوەندییەکی قووڵەوە سەرچاوە بگرێ و ببێتە عیشق. لانی کەم مێنەدەی مەسەلەکە پەیوەندیی بە کەسەکانەوە دەبێت، ڕەنگە وا باشتر بێت لە بری "موحافەزەکاری" بڵێین "لێبووردن" یان "بە ئۆقرەیی" (یا تەحەممول).*

**مێردۆک:** حەزم دەکرد بڵێم کە هەموو هونەرمەندە گەورەکان لە هونەرەکەیاندا بەئۆقرەن، بەڵام دەشێ نەتوانم بۆ بەرگریکردن لەم قسەیە پاساو بهێنمەوە. ئایا دانتی بەئۆقرە بوو؟ من بڕوام وایە کە زۆربەی نووسەران و شاعیرانی گەورە خاوەن جۆرە ڕوانینێکی ئارام و میهرەبانن، لەبەرئەوەی دەبینن کە خەڵکی چەند لەگەڵ یەکدا جیاوازن و بۆچیش جیاوازن. بەئۆقرەیی و دڵڕاگرتن پەیوەستە بەوەوە کە بتوانین ئەوەرە جیاوازەکانی ڕاستی‌ی دوور لە خۆمان لە خەیاڵماندا جێ بکەینەوەو بەرجەستەی بکەین. هەمیشە لە کارەکانی هۆمیرۆس و شەکسپیرو ڕۆماننووسە گەورەکانەوە نەسیمێک لە بەئۆقرەیی و بالا ڕوانین و سنگفراوانی و میهرەبانی لە هەڵکردندایە. هونەرمەندی گەورە هەمیشە شتەکانی دەرەوەی خۆی دەبینێت و جیهان بەتەنها بەو شێوەیە بەرجەستە ناکات کە خۆی دەیەوێت. بە بڕوای من ڕەندی (فەزیلەت) هەر بریتی‌یە لەم بابەتێتی (مەوزوعیەت)ەی کە تێکەڵە بە میهرەبانی و بەخشش و، کاتێکیش دەوڵەتە دیکتاتۆرەکان دەیانەوێ ڕاوەدووی هونەرمەند بنێن و ئازاری بدەن، دەیانەوێ ئەم ڕەندی‌یە بفەوتێنن.

## پەراوێزەکان:

1- mimesis وشەیەکی یۆنانی‌یەو لە گرنگترین زاراوەکانی فەلسەفەی ئەفلاتون و ئەرستۆیە، لە زمانی عەرەبی و فارسیدا بە "محاکاة" و "تقلید" و "تخییل" "تشبیه" وەرگێڕاوە. (لە کوردیشدا دەتوانین "لاساییکردنەوە" دابنێین).

2- anamnesis وشەیەکی یۆنانی‌یە و بە مانای "هاتنەوە یاد" دێ کە لە فەلسەفەی ئەفلاتوندا باسی فراوانی لە سەرە. ئەو بڕوای وابوو کە زانین یان مەعریفە لە ڕاستیدا بریتی‌یە لە هێنانەوە یادی کۆمەڵێک زانیاری کە کاتی خۆی هەمانبووەو لێی بێ ئاگا بووین.

3- unintelligible particular things "بەشەکی" لێرەدا بەرامبەر "گشتی"یە، نەک بە مانای بەشێک لە گشت یان شتێکی لاوەکی و بچووک. "نامەعقول"یش بە مانای شتێکە کە ناچێتە ناو چوارچێوەیەکی ئەقڵانیەوەو مەعریفە پێوەی بەند نابێت، هەروەکو لە سەردەمانی دێریندا گوتراوە بەشەکی نە بەدەستهێنەرەو نە بەدەستهاتوو. بەشەکی لە ڕێی هەستەکانەوە دەرک دەکرێ (واتە یا دەبینرێ یا دەبیسترێ و یان بۆن دەکرێو هتد..) بەڵام بۆ ئەوەی لە بارەیەوە بزانین دەبێ لە ژێر یەکێک لە گشتەکاندا بیگونجێنین و، ئەمەش کاری ئەقڵە نەک هەست.

4- ئەنزێکە لەسەر ئەوەی گوایە پرۆست کەوتۆتە ژێر کاریگەریی بۆچوونەکانی فەیلەسووفی فەرەنسایی هنری برگسۆن (1859- 1941)ەوە کە دەربارەی زەمەنن.

5- monism: باوەڕهێنان بەوەی کە یەک پرنسیپی ئامانجدار هەیەو هیچی دی، وەکو ئەقڵ یان ماددە.

6- the realist fallacy یان "بەهەڵەداچوونی بوونی واقیعیانەی گشتەکان" بە مانای ئەوەی وێنا گشتیەکان بە تەنها وشە نین و بوونی واقیعیان هەیە.

7- بارکلی (1685- 1753) دەیوت هەر شتێك دەرکی حیسسی نەکرێ بوونی نییە. دەگێڕنەوە کە ئەدیبی گەورەی ئینگلیز دکتۆر سامۆییل جۆنسون (1709- 1784) ڕۆژێك لێیان پرسی چۆن تیۆرەکەی بارکلی ڕەت دەکەیتەوە، جۆنسون بە نووکی پێڵاوەکەی شەقی لە بەردێك هەڵدا و وتی "بەمجۆرە".

8- Poetics

9- Finnegans Wake ڕۆمانێکی ڕۆماننووسی ئێرلەندی جەیمس جۆیس (1882- 1941)ە.

## سەرچاوە:

مردان اندیشه- براین مگی- ترجمه: عزت الله فولادوند
چاپ دوم 1378 (1999) انتشارات طرح نو- تهران

# (کامیلۆ خۆسەسێلا)

## ئەدیبی ترساو لە یۆتۆپیای سیاسەت

● و. لە فارسییەوە: ڕەووف بێگەرد

دەوری کامیلو خوسە سیلا لە گۆڕانکاریە هاوچەرخەکانی ئیسپانیادا کەسایەتی ئەدیبێکی سیاسەتمەداری پێ بەخشیوە، بەشداری کردنی لە شەڕی ناوخۆی ئیسپانیادا، کاریگەری ئاشکرای لە چەسپاندنی دەستووری ئەساسی تازەی وڵات و، قەدەغەکردنی بڵاوبوونەوەی بەرهەمەکانی لەلایەن حکومەتەوە، بەڵگەی تەواوی ئەوەن کە کەسایەتیەکی سیاسیەو بەرهەمەکانیشی هەروان، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا، سیلا لەگەڵ دنیای سیاسەتدا میانەی زۆر نیەو، تەنانەت ئامانجە یوتوپیاکەی سیاسەت بە کارەسات دەژمێرێت و ڕووی ئەدیبانەی خۆی کە شایانی ستایشە لە دنیای ئیسپانی زماندا دەخاتەڕوو.

لە تەمەنی لاویدا ڕوو لە دنیای ئەدەب دەکات. لەگەڵ یەکەمین دەورەی فەلسەفەو ئەدەبیاتی هاوچەرخدا لە زانکۆی ئیسپانیا، خوێندنی پزیشکی بە ناتەواوی واز لێ دێنێت و ڕوو لە ئەدەبیات دەکات.

سیلا لە تەمەنی 26 ساڵیدا دیارترین ڕۆمانی خۆی (خێزانی پاسکوال دوئارتە) دەنووسێت، پاشان بەهۆی بەرهەمی زۆرو بەنرخیەوە خەڵاتی زۆر مەزنی ئیسپانی و خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبی ساڵی 1989دا بەدەست دێنێت.

بەرهەمی جۆراوجۆری داهێنەرانەی لە بواری بونیادو شێوازو بواری گاڵتەجاڕی، سەفەرنامەو ڕۆمانی مێژوویی، سیاسی، شانۆنامە، شیعرو.. کردوویەتیە نموونەیەکی هەرە دیاری دنیای ئەدەبیات. کورت و پوخت نووسینی سەرسووڕهێنەرانە و وێنەسازی و بە هەلومەرج گرتنی حاڵ و هەوای کەسایەتیەکان لە چیرۆکەکاندا لە کارە دەگمەنەکانی سیلایە، ئەو هەمیشە لە دڵەڕاوکێی بەردەوام بوون و تاقیکردنەوەی شێوازە تازەکانی ئەدەبە، ئەو کە لافی ئەوە لێ دەدات بێجگە لە نووسین زیاتر نازانێت، بڕوای بە ئیلهام نیەو تەنیا بڕوای بە ڕاهێنان و مەشق کردنە لە نووسیندا.



خۆسە سیلا

***ئەفراندنی چرکەساتە نەمرەکانی ژیان***
***گفتوگۆ لەگەڵ سێلادا***
***ئانتۆنیو ئاستورگا Antonio Astorga***
***شوێن: ڤیلای سێلا لە سان کامیلو 1999***

**** ئایا تۆ "گیانلەبەرێکی ئەدەبی"ت دون کامیلو؟***

–گیانلەبەرێکی چالاکی ئەدەبی، هیچ گومانت لەمە نەبێت.

**** دوای ئەوەی دە ساڵ بەسەر وەرگرتنی خەڵاتی نۆبڵدا تێپەڕی، جەنابی سیلا، ئەم خەڵاتە ژیانی تۆی زیاتر بەرجەستە کرد؟***

–هەر کەسێکی تریش کە ئەو خەڵاتە وەربگرێت هەروا دەبێت، بۆ ئەوەیە کە هەین.

**** "داری سەوز" سۆزو ئاوازێکە لە گیانی گالیسیایی تۆوە هاتۆتە دەرێ؟***

–بێگومان یەکێکە لە کارە زۆرەکانم، من لە "مازورکا بۆ دوو مردو"دا لە ناخی دڵەوە ستایشم لە گوندنشینەکانی گالیسیا کردبوو، لە "خاچی سان ئەندریس"دا لەسەر ژیانی هاوڵاتیەکی گالیسیایی لە شاری "لاکرونیا"دام نووسیبوو. وا ئێستایش لە "داری سەوز"دا، رۆمانێك کە لە سەردەمی وەرگرتنی خەڵاتی نۆبڵەوە لە دەروندا مابوەوە باس لە ژیانی دەریاوانێکی گالیسیایی دەکەم، گالیسیاییەکی خەڵکی "کوستادی لامویرتە" کە بونیادێکی زۆر توندو سەرنج راکێشی هەیە.

**** ئەو کەسانەی دەقی ئەسڵی رۆمانەکەیان خوێندۆتەوە بە بونیادی ئەدەبی کارەکە سەرسامن، لە روانگەی شێوازی پێشڕەوانە تایبەتیەکەیەوە..***

–من بەم بیروڕایانە بەختیارم، کێ چی لەدەست دێت ئەوە دەکات، ئەمە ئاشکرایە، تا ئەو شوێنەی کە هەلومەرجەکان بواری پێ دەدەن.

****گالیسیا لە "داری سەوز"دا چ رازو نیازێکی هەیە؟***

*گالیسیا لە مندا زیندوەو هەمیشە ئامادەگی خۆی هەیە، گالیسیایەکی تر نیە جێگای بگرێتەوە، وەك چۆن کەسێك نیە جێی ئینگلیزیەك یان چینی یان یابانیەك بگرێتەوە، ئەمە روونە، بێجگە لەوەی کە من لە گالیسیادا پێگەیشتووم، من وا بیر دەکەمەوەو شانازیشی پێوە دەکەم.

*ئادگار ئالان پو Edgard Allan Poe (1) کەسایەتیەکە لە "داری سەوز"دا بە زمانی گالیسیایی شیعری نووسەرێك دەخوێنێتەوە کە رووداوەکانی دەریای باشوور دەگێڕێتەوە..

*"پو" زۆر لەگەڵ "کوستادامور"دا گونجاوە، وەك کەسایەتیەکی ناو چیرۆکەکەیش دەڵێت: دەبێت ئەوە هەر بە زمانی گالیسیایی بوترێت، نازانم، ئەوە لە منەوە نیە، بەڵکو پەیوەندی بە کەسایەتیەکی ناو چیرۆکەکەمەوە هەیە.

***ئەم پەیوەندیە توندوتۆڵە بە "پو"وە لە چیەوە سەرچاوە دەگرێت؟**

*زیاد لە هەر شتێك لە شیعرەكانیەوەیە، وەك چۆن رێز لە "كیڤید" یان شكسپیر دەگرم، بێگومان ئەمەیش لە ئەنجامی بەرهەمەكانیانەوەیە كە ئەنجامیان داوە، ئەمە زۆر ئاشكرایە.

***"داری سەوز" لە بیری تۆدا بەچەند قۆناغدا تێپەڕیوە؟ سەرەتا لە پێش نۆبڵەوە، لە هەراو زەنای بەخشینی نۆبڵدا ماوەیەك وەستان هەیە، خەڵاتی نۆبڵ وەردەگریت و دیسان هەموو شتێك دەست پێ دەكاتەوە..**

*ئێستایش سەرەتای مەنگاوە، چونكە ئەوەی ئێستا نوسیومن ئیدی بە كەڵك نایەن، ئیتر ئەسڵەن نازانم لە كوێوە هاتوون، رەنگە تەنیا بەشێك لە یاداشتەكان بەكارم بێن، بەهەرحاڵ ئەوەی كراوە زیاد لە سەرەتایەك نیە، لە راستیا رۆمانەكەم بە شێوەو سروشتێكی تازەو بەپەلە نووسی، چونكە لەمانگی ئابی ساڵی رابوردودا ‑**1998**‑ دەستم پێكردو شەو و رۆژ ماندو بووم لەگەڵیا، زۆر سەرقاڵی كردم.

***ئایا مەوڵت داوە ئیلتیزامی تایبەتی خۆت سەبارەت بە رەچەڵەكە خانەدانەكەتان بپارێزیت؟**

‑هەڵبەت، هەڵبەت.

***چیت لەگەڵ نەژادو رەچەڵەكی خۆتدا كردووە؟**

‑داومەتە دەست ئەدەبیات.

***ئەگەر دوای ئەوەی خەڵاتی نۆبلیان پێ بەخشیت "كوژرانی لاوێكی بەباچوو" "خاچی سان ئاندریس"..**

*دوو كتێب یان سێ وتاری دی، چیرۆكێك بوو پەیوەست بە وجودی منەوە، با بە دوای هۆیەكانیدا نەگەڕێین.

***‑بەخشانەكانت هاوارێكی بەردەوامن لە دژی نایەكسانی.**

*"كوژرانی لاوێكی بەباچوو" باس لە رەفتاری خراپی دادوەرێك دەكات، كە بەخۆ كوشتنی كوڕێكی لاو، لاوێكی بەباچوو كۆتایی هات، بە كوشتدانی لاوێكی تێك شكاو زۆر ئاساییە.

***"داری سەوز" لەگیانی مەنەلۆگی سان كامیلوی ساڵی 1936ەوە سەرچاوە دەگرێت؟**

‑وایە، من بەمەبەستی تایبەتی ئەوەم نەكردوە، تەماشا بكە، لای كەم ئەوەی پەیوەندی بە منی نووسەرەوە هەبێت كەم رێ دەكەوێت من بیری خۆم سەپاندبێت، من وەك ئەنجام لەوە گەیشتووم كە مەبەستم پێكاوە، ئەگەرچی نابێت لەسەر ئەمە پێ دابگرین و بەردێك بكەینە كێوێك، بەڵام ئەوەی بەرهەمی دێنم هەر ئەو شتەیە كە دركی پێ دەكەم.

***ئایا ستایشی یوتوپیا لە جیهاندا بەسەرچوە؟**

‑نا، نا، مەبەست ئەوەیە یوتوپیا كە گەورەترین دەوری لە ئەدەبیاتدا هەیە، لە سیاسەتدا بێ حەد ترسناكە، شتێكە بەرەو كارەساتی گەورەمان دەبات.

***وەك ئەوەی كە لە یوگسلافیاو كۆسۆڤۆدا روودەدات؟**

‑هەر تەواو ئەوە بەرئەنجامی ئەو یوتوپیایەیە، هەر ئەو گریمانەیەی كە سربەكان لە كوسوفیەكان باڵاترن لە خۆیدا بێ عەقڵیەكی رووتەو نرخ دانە بە بیروباوەڕەكانی هیتلەر، نا، نا، بەراستی ئەمە هەڵەیەكی گەورەیە.

***تۆ بەم مەسەلەیە نیگەرانیت؟**

‑زۆریش، چونكە من وای بۆ دەچم ئەو رێگا چارەیەی بۆی لەپێش گیراوە رێگاچارەیەكی گونجاو نیە، هەمیشە شەڕ خراپترین چارەیە، بەلای منەوە

دەبێت لەسەر دیالۆگ بەردەوام بن.. نازانم، رەنگە ئەوەی پێویست بێت وترابێت.

*ئایا ئەو پیاوماقووڵە دەستەڵاتدارە، جەنابی پارە، لەم ناوەدا دەوری هەبوە؟*

–رەنگە لە کۆسۆفۆدا پارە دەوری کەمی بووبێت، وڵاتێکی چیایی و بچووك، شێوازی کشتوکاڵیەکی سەرەتایی، بە کورتی لە هەموو روویەکەوە بێ وڵەت و بێ پیت و فەڕ.

## فرۆشتنی بەرهەمی ئەدەبی خۆفرۆشیە:

*ئایا پارە دەوری تێکدەرانەی نیە لە گەلێك لەو ئاژاوانەدا کە لە دنیادا بڵاو بوونەتەوە؟*

–بێگومان هەیەتی.

*خراپترینیشیان بڵاوکرانەوەی ئەو بیرەیە کە دەتوانین هەموو شتێك بە پارە بکڕین؟*

–بەڵی ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە، بەهیچ جۆرێك شایانی ستایش کردن نیە، ئەوە راست نیە کە هەر شتێك نرخی خۆی هەیە، درۆیە. زۆر بەداخەوە درۆیەکی گەورەیە، گەلێك لە کارەکان کاتێ نرخ پەیدا دەکەن کە دەکەونە بەرچاو.

*باشترین نموونە ئەوەیە کە بەرانبەر بە دەست نووسەکانت بڕی دوو ملیارد پیزۆ یان دایتێ و تۆ رەتت کردەوەو نەت فرۆشتن.*

*بە هیچ جۆرێك نامەوێت بیان فرۆشم، ئەو دەست نووسانە لە بنکەکەی لای خۆمدا دەمێننەوە، بێجگە لەمە کاری وا دەبێتە جۆرێك لە خۆفرۆشی.

*دون کامیلو ئایا ئەو بنکەیەی ئێوە کە لە "ئیریا فلابیا" دایە کەشتیەکە بە بای گونجاو و زۆر خێرا بۆ پێشەوە دەڕوات؟*

–هەروایە، خەرجیەکی زۆری هەیەو لەلایەن دەوڵەت و، فەرمانداری ویلایەتی گالیسیاو هەندێك دەزگای تایبەتیەوە کۆمەکێکی ماڵی باش دەکرێت و بۆ پێشەوە دەچێت.

*بە چ بیرو خولیایەکەوە دەخەویت؟*

–بە بیری ئەوەوە کە هێشتا دەتوانم کاری زیاتر بکەم، پێشکەوتنی زیاتری گوندەکە، دابین کردنی کۆرسی خوێندن بۆ کوڕو کچ تا بە سەرکەوتویی خوێندنیان بە ئەنجام بگەیەنن، یان بەدی هێنانی پێویستیەکانی هاوسەریەتی بۆ ئەو کچانەی دەیانەوێت شوو بکەن. یا دروست کردنی شوێن بۆ ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت رۆژنامە بخوێننەوە. گەلێك کار هەن کە بنکە دەتوانێت و دەبێت بۆ خەڵکی ئەنجامی بدات.

*بیری ئەوەش کە دەست نووسی ئەسڵیی بەرهەمەکانت کۆبکەیتەوە؟*

–بێجگە لە یەکێکیان کە ئێستا لە بەردەستا نیە "پشووگە" کە پێشکەشم کردبوو بە "گرگوریو مارانیون" و ساڵانێك ون ببوو، بەڵام ئێستا لە کتێبخانەی یەکێك لە کچەکانیدا دۆزراوەتەوە. هیوادارم لە رێی ئەو گفتوگۆیەوە کە لە ئارادایە بیهێنینەوە بۆ بنکە. وا دەزانم ئەگەر بەخت یار بێت بتوانین بیهێنینەوە.

## هەڕەشەی نەتەوەپەرستی:

*تۆ یەکێکیت لەو چەند کەسە ئیسپانیە کە لە هەموو ویلایەتەکانی وڵاتدا شەوێکت بەسەر بردوە؟*

–هەروەها هەموو دوورگەکانیشی، بێجگە لە هیرو Hierro.

*ئەمە بەڵگەی سروشتی ئیسپانیای تۆیە، تۆ تا سەرئێسقان ئیسپانیت؟*

–تۆ دەبینیت من چ هەستێکم هەیە.

*دون کامیلو چۆن لە ناسیونالیزم دەڕوانیت؟*

-وەك مەترسییەك، مەترسییەكی گەورەیە، كە ئێستا دەی بینین چۆن دەیەوێت رەگ دابكوتێت، نازانم.. ئەمە مەترسییەكی گەورەیە.

***ئایا هەرەشە لە كۆمەڵگای مرۆڤایەتی دەكات؟***

-زۆر بێگومانم، بێ لەوەی كە تێكەڵیەك لەگەڵ بەنرخترین شت دەكات كە خۆشەویستی نیشتمانە، بە مانای عەشقی ئەو سەرزەمینەی كە لەوێدا لەدایك بوویت، ئەمە زۆر جیاوازە لە نەتەوەپەرستی كە بیروباوەڕێكە وای دادەنێت ئەو وڵاتەی تۆی تیا لەدایك بوویت چاكترین سەرزەمینی دنیایە، بەڵام وەك ئەنجام رۆژێك هەردێت كە ئەو جۆرە بیركردنەوەیە چاك بكرێت.

***كارە ئەدەبییە بەراییەكانت بە كۆمەڵێك شیعر دەستی پێكرد بەناوی "ئاژانتیفی بچووك"***

-بەڵێ، لە رۆژنامەی "لاپلاتا ***Laplata***"دا.

***پاشانیش ئەو شیعرانەی بە ماریا سامبرانۆ Maria Zambrano ت پێشكەش كرد، ئایا ئەمە لەبری ئەو یارمەتیانە بوو كە ئەم نووسەرە مالاگاییە بە تۆی كردبوو، بەتایبەت ئەو میواندارى چاخواردنەوانەی كە سازی دەكرد؟***

-من زۆرم رێز لێ دەگرت، زۆر، ئەو یارمەتی و هاوكاری دەكردم و لەو میوانیانەدا میگل هێرناندسم ناسی، هەروەها لەگەڵ كارلوس دیاس فرناندس Carlos Diadz Fernandez دا كە بێچارەیە پاشان بوە پزیشكی چارەسازی من، ئەو لە شەڕی ناوخۆدا كۆلۆنێل و سەرۆكی پاراستنی تەندروستی سوپای كۆماریو پاشانیش لە ستالینگراد پزیشكی دەكرد.

## ***پێڵێنانی گوماناوی روناكی رۆژ:***

***ئەی پیدرو سالیناس؟***

-من لە كۆرسەكانی زانكۆی فەلسەفەو ئەدەبیات لە بەشی ئەدەبیاتی هاوچەرخی ئیسپانی بەشداریم كرد، لانی كەم گوێی لە قسەكانم دەگرت و ئەمەیش بۆ لاوێك مایەی شانازییەكی زۆر بوو.

***نووسین لەگەڵ گۆشت و خوێنی تۆدا تێكەڵ بووە، تۆ بە درێژایی ئەم ساڵانە، هەمووكات و لەهەر جێگایەكی ئەم دنیایەدا بووبیت نوسیوتە، زیاد لە نیوەی ژیانتان و زۆر بە شەوق و ئارەزوویشەوە..***

-هەموو ژیانم، لە راستیا من بێجگە لە نووسین چ كارێكی ترم نەكردووە، ئەمە پیشەی منە.

***شەڕی ناوخۆ دەست پێ دەكات و تۆ "پێڵێنانی روناكی رۆژ" دەنووسیت، كارێكی پاك و جوان و ناسكە لەنێو هەموو شیعرەكانتدا.***

-ئەو شیعرانەم لەنێوان رۆژانی ***1*** تا ***11*** نۆڤەمبەری ساڵی ***1936***دا نووسی، لە شەقامی كانودیو كونیو پلاكی ***91***. لە ماڵی باوانم، ئەو خانوەی كە دوایی لەناوچوو، روخاندیان و پاشان دەزگای دەوڵەتیان تیا دروست كرد، من وای بۆ دەچم كە كارێكی زۆر ناشیرینن، بەڵام ئیتر...

***شەڕ چ ئاسەوارێكی لە دوای خۆی بەجێهێشت؟***

-زۆر، هەر بەو جۆرەی كە بەسەر هەموو ئیسپانیەكیەوە داینا. شتێكە كە هەمیشە وەك كێلی گۆڕ لە گەڵماندایە، چونكە سەردەمێكی تەپین و فریودان و زۆر پڕ لە مەترسی بوو، رۆژگارێكی جەریەزەیی.. بیرخستنەوەو باس نەكردنی چاكترە، رەنگە ئەگەر ماوەیەكی زیاتری بەسەردا تێپەڕێت باشتر بێت.

***تۆ بیرت لەوە دەكردەوە كە لەو سەردەمەو لەوكات و شوێنەدا رۆمانی "خێزانی پاسكوال دوارتە" ئەو سەركەوتنە زۆرە بەدەست بێنێت؟***

–له راستیا نەخێر، نازانم له نووسینیدا زۆر سەرکەوتوو بووم، وایشم بیر لێ نەدەکردەوە، کەچی وا پێش هات و لەلایەکی تریشەوە بۆ من زۆر چاك دەرچوو.

## گۆڕینی بەرگی ئەدەبی:

***له نێوچوونی شاعیرو مانەوەی چیرۆکنووس.***

–بڵێین چی، وا وایە.

***بەراستی تۆ بۆ پیشەیەك دروست بوویت، پیشەی نووسەری..***

–خۆیشم وای بیر لێدەکەمەوە، من وەك نووسەر تەماشای خۆم دەکەم، چونکە ئەوەی لای من گرنگە وەسفی خۆمە بەو وشانەی دەم و دەست ئەیانڵێم، نەك بە وشەگەلێکی ئامادەکراو.

***تۆ بایەخ بە شێوازی ئەدەبی ئەدەیت؟***

–نه زۆر، نه کەم.

***"پیشەی تاریك" "سان کامیلو 1936" "پووڕەی هەنگ" "پاسکوال دوارتە" چوار بەرهەمی درەوشاوەی ئەدەبیاتی سەدەی بیستی ئیسپانین، نووسەر بۆ ئەوەی تووشی دووبارەبوونەوە نەبێت له هەریەکێکیاندا بونیادی چیرۆکنووسیەکەی خۆی گۆڕیوە، خوێنەر لە بەردەم هەر بەرهەمێکی تازەیدا سەری سووڕدەمێنێت، هەمیشە شتێك لە بەرهەمەکەدا هەیە کە سەرسوڕمانەکە زیاتر ئەکات، تۆ چۆن ئەتوانیت ئەو بەرگە ئەدەبیەی خۆت بگۆڕیت؟***

–من دەزانم کە له تاقیکردنەوەی ڕێگا تازەکاندا دوودڵیەکم تیایە، سەردەمێك بیکاسو پێی دەوتم و راستیشی دەکرد کە: "شەوق و ئارەزوو لە سەرەتادایە، چونکە هەر له دوای سەرەتاوە کۆتایی دەست پێدەکات" دەبێت هەمیشە ڕێگای تازە تاقی بکەینەوە، ئەو شتەی کە زۆر ترسناکە، چونکە فڕینە لە بۆشایی و فەزایەکی بێکۆتاییدا، تۆ دەکەویتە سەرزەوی و دەمریت، سەرتان لە لەشتان جیا دەبێتەوە، باشە، کەواتە ئەمە تێکەوتنێکی ترسناکە کە دەبێت بەسەریدا تێپەڕییت، چارچیە! چەند خراپە نووسەر دوچاری دووبارەبوونەوە بێت و خۆبکاتە کاریکاتێر، لە راستیدا ئەمە خراپترین ڕێو ڕەسمی لە گۆڕانی نووسەرە.

***ئەمەیش زۆر ڕوودەدات؟***

–ئاه، زۆر.. زۆرو وەحشەتناکیشە.

***ئایا گۆزەیەکی گڵ هەیە کە کەرەستەکانی بەرهەمی ئەدەبی خۆتان لەوێوە دەربهێنن؟***

–من لەناو خودی ژیانەوە ئەو کەرەسانە دەردێنم.

***ئەبێت نووسەر هەمیشە ڕاوچیەکی گەورە بێت؟***

–ڕاوچیەکی بەردەوام، نازانم گەورە یان بچوك، بەڵام هەمیشەیی..

***تۆ لە گروپە ئەدەبیەکان خۆت ئەپارێزیت و دوور ئەکەویتەوە..***

–بەڵێ، چونکە بە بڕوای من هیچ کاتێك نە ڕێخۆشکەرن و نە ڕێ پیشاندەریشن.

## ئیلهام و فێڵبازان:

***تۆ لە بەرهەمەکانتدا هەوڵت داوە حەرامەکان و خوا جۆراو جۆرەکانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی تێك بشکێنیت، یەکێك لەو شتانە مەسەلەی "ڕەگەزایەتیە"***

–ئەگەر باش لەم مەسەلەیە بڕوانین، ئەمە بابەتێکی ئاسان نیەو ڕاڕاییەکی تیایە، مەسەلەی "ڕەگەزایەتی" گرنگیەکی ئەساسی هەیەو واقیعیە، ئەمانە هەوێنی ئەسڵی دەروون ناسین.

** ئایا رەخنەگرەکان کاتتان دەگرن؟*

*نەء، ئیتر لەبیرم کردوون، من لە رەخنەگری باش سوپاس گوزارم، بەردەوام ئەوانە بە سوودی من کاریان کردووە، لە بیرمە "باروخا"ی پیر کاتێك وتارێك لە "یا Ya"دا لە دژی نوسرا بەگاڵتەوە وتی: "بیستوومە وتارێکتان لە دژم بڵاوکردۆتەوە" هەر بەو گاڵتەکردنەوە لەسەری ڕۆیشت: "باشە، خۆ دەبێت خەڵکی تریش نان بخۆن" ژمارەیەکی زۆری رەخنەگر هەن کە زۆر حەقیقەت بینن و ئەوانەن کە بەرهەمەکانم دەخوێننەوەو بە بیری تیژەوە رەخنە لە کارەکانم دەگرن.

**تۆ بەشداریت لە کتێبی ریکۆردەکانی "گینس"کردوە، لە مەبەستێکی تایبەتیدا داوای لێ کردیت دەربارەی چۆنیەتی نووسینی رۆمانی "پاسکوال دوئارتە" قسە بکەیت، تۆ میکرفۆنەکەت بە دەستەوە گرت و مەبەستەکەت وا دارشت "کاغەزو قەڵەمم هەڵگرت، لە پشت مێزەوە دانیشتم و دەستم بە نووسین کرد: "من، بەرێزان مرۆڤێکی خراپ نیم..." هەموو ئەم قسانەت زیاد لە دەقیقەو نیوێکی نەخایند، زۆر کورت و پوخت بوو.*

–ئاشکرایە، وایە، دەبێت دانیشیت و بنووسیت. هیچ ڕێسایەکی تر نیە.

**لە بارەی "ئیلهام"ەوە بدوێ، ئەمە بیانوو و خۆدزینەوەیە یان بەهەشتێکە بۆ قێڵبازەکانی ئەدەب؟*

–بەڵێ، بەڵێ. ڕۆژێك لە بۆنەیەکی تایبەتیدا پیکاسۆ پێی وتم کە ئەو بڕوای بە ئیلهام نیە، ئەگەر ڕۆژێك لەسەرخۆ پەنایەکت لێ بگرتایە، دەت بینی کە ئەو هەمیشە لەکارکردندا بوو، بودلیر **Baudelaire** لە وەڵامی خانمێکدا کە دەربارەی ئیلهام لێی پرسی بوو وتبووی "ئیلهام، خانم ئەوەیە کە هەموو ڕۆژێك کاربکەیت. دیستوفیکیش لەسەر ئەوە پێی دادەگرت کە بلیمەتی، خۆگرتن و ئارام گرتنێکی بەردەوامە. هەموو ئەمانە راستن.

** پلەو پایەی ڕۆمانی گەورە لە کوێدایە؟*

–ڕۆمانی گەورە ڕەنگدانەوەی حاڵەتێکی ئازاو دلێرانەی چرکەساتێکی مێژوویی و ئەمرە نە کەم و نە زیاد.

**تۆ چۆن قسە دەکەیت وایش دەنووسیت؟*

–من هەمیشە هەوڵی ئەوەمداوە، لەگەڵ ئەوەیشدا هەر بەو جۆرە پەخشانەیە کە دەشێت ڕۆمانێك بنووسرێت. بێگومان جیاوازیەکی زۆر هەیە لە نێوان ئەو پەخشانەی وتارێکی پێ دەنووسرێت لەگەڵ پەخشانێکی شیعری و ڕۆمانێك، من زۆرم هەوڵ داوە ئەو شتانەی لە دەورووبەرماندان بەو وشانە ڕەنگ ڕێژ بکەمەوە کەلە کۆڵان و بازاڕدا بەکاردەبرێن. ئەوەی لە ڕۆماندا باوە ئەوەیە کە ساختمانە ئەخلاقیەکانی زەمانە کە ئێمە لە ژیاندا هەستی پێ دەکەین چاکیان بکەین.

–بەم شێوەیە دەتوانین لەو وتەیە بڕوانین کە دەڵێت: "مرۆڤ گیانلەبەرێکی قسەکەرە".

***پەراوێز:***

*1–Edgar Allan Poe (1809–1849) نووسەرو شاعیری گەورەی ئەمریکی لە دایك بووی بوستن.*

*2–Francisco de Quevedeo (1580–1645) شاعیرو نووسەری بەناوبانگی ئیسپانی، لە بواری ڕۆمان نووسی، سیاسەت و شیعر، گەلێك بەرهەمی بەنرخی هەیە.*

***سەرچاوە:***

*گۆڤاری مانگانەی (گلستانە) ژمارە 19 ساڵی دەوی 1379.*

# کتێبی ژمارە



## ڕەگەز پەرستی چییە؟

(گفتوگۆ لەگەڵ کچەکەم دا)

تاهیر بن جەللون

وەرگێڕانی لە سویدییەوە: خەبات عارف

# ڕەگەزپەرستی چییە؟[1]

## -گفتوگۆ لەگەڵ کچەکەمدا-

■ نووسینی: تاهیر بن جەللون

● و. لە سویدییەوە: خەبات عارف

### پێشەکی:

لە 1997/2/22 کاتێك لەگەڵ کچەکەمدا بەشداری خۆپیشاندانێکمان دەکرد دژی پێشنیازی وەزیری ناوخۆی فرانسا، دۆبرێ، لەمەڕ دەرکردنی یاسایەك سەبارەت بەمافی گەشتکردن و مانەوەی بیانییان لە فرانسادا، کەوتمە سەر ئەو بیرەی ئەم دەقەی بەردەستت بنووسم. کچەکەم، کە ئەوسا دە ساڵان بوو، کۆمەڵێك پرسیاری لێکردم. دەیویست بزانێت بۆ خۆپیشاندانمان دەکرد، داواکانی ئێمە لە خۆپیشاندانەکەدا ■ مانایەکیان هەبوو، دەیویست بزانێت نارەزایدەربڕینی ئێمە لەسەر شەقامەکان کەڵکی چی دەگرت و پرسیاری دیکەی لەو چەشنە.

هەر لە سۆنگەی ئەو پرسیارانەشدا بوو کە دەستمان بە باسوخواس کرد لەسەر ڕەگەزپەرستی. هەر ئەوسایش پرسیار و سەرنج و تێڕامانەکانی ئەوم بیر کەوتەوەو دەستم کرد بە نووسینی چەند دێڕێك.

سەرەتا پێکەوە ئەو دێڕانەمان خوێندەوە، پاشان، ئەو دەقەی کە نووسیبووم سەرلەبەر نووسیمەوە. هەندێك لەو چەمکە دژوارانەی لە دەقەکەدا هاتبوون گۆڕیمن و هەندێك لەو چەمکانەیش کە تێگەشتنیان ئاسان نەبوو، باشتر لێکم دانەوە. جارێکی دیکە دەقەکەمان لەگەڵ دوو هاوڕێی کچەکەمدا خوێندەوەو تێڕامان و هەڵوەستەی ئەوان لە بەرانبەر دەقەکەدا بۆ من زۆر گرنگ بوون و، لە فۆرمەلەکردنی ئەم دەقەدا هاریکاریان کردم.

بەلانی کەمەوە پانزە جار گۆڕانکاریم لەم دەقەی بەردەستدا کردووە. بۆ ئەوەی بەتەواوی ڕوون و سادەو پێوەست بێت بە تێوەڕۆکی باسەکەوە. ئەگەرچی من بەتایبەت ڕووی دەمم لە منالانی هەشت تا چواردە ساڵانە، بەڵام هیوادارام لە لایەن هەموو کەسێکەوە پێشوازی لێ بکرێت و بخوێنرێتەوەو باوکو دایکی ئەو منالانەش بیخوێننەوە.

**■ روانگەی منەوە تێکۆشان دژی ڕەگەزپەرستی لە خوێندنگەوە دەست پێ دەکات، مرۆڤ دەتوانێت منالآن، نەك گەورەکان، پەروەردە بکات. ئەمەیش هۆیەکە کە ئەم دەقە هەم لە ڕووی بیرلێکردنەوە و هەم لە ڕووی شێوازی نووسینەوە. بەنیازو مەرامی پەروەردەیی نووسراوە.**

**لێرەدا دەمەوێت سوپاسی ئەو هاوڕێیانەم بکەم کە ئەم دەقەیان خوێندووەتەوەو لە ڕاوبۆچوونی خۆیان ئاگاداریان کردووم. سوپاس بۆ هاوڕێیەکانی مریەمیش کە لە سیاغەکردنی پرسیارەکاندا بەشدارییان کردووە.**

***—بابە، ڕەگەزپەرستی چییە؟***

—ڕەگەزپەرستی جۆرێکە لە بوون، کە تا ڕادەیەك بەربڵاوە، لە هەموو کۆمەڵگایەکدا هەیەو بەداخەوە لە هەندێك وڵاتاندا بووە بە خۆراکێکی ڕۆژانە، بە جۆرێك کە چی تر مرۆڤ هەستی پێ ناکات. ڕەگەزپەرستی، بەدگومانی و تەنانەت ڕقلێبوونەوەیە لەو مرۆڤانەی کە لە ئێمە جیاوازن و بەجۆرێکی جیاواز لە ئێمە هەڵسوکەوت دەکەن.

***—مەبەستت لە "خۆراکی ڕۆژانە" ئەوەیە، کە هەموو شتێك ئاساییە؟***

—نا.. کە شتێك دەبێت بە خۆراکی ڕۆژانە، بەو مانایە نییە کە هەموو شتێك ئاساییە. مرۆڤ حەز بە بەدگومانی دەکات، لە بەرانبەر ئەوەی کە لە خۆی ناچێت، بۆ نموونە: بەرانبەر بیانییەك. ئەمەش جۆرێکە لە بوون، کە هێندەی کەونارایی مرۆڤ کۆنەو سەرانسەری دنیاشی گرتۆتەوە. ئەمەش پێوەندی بە هەموومانەوە هەیە.

***—کەوایە، ئەگەر پێوەندی بە هەموومانەوە هەبێت، دەبێت منیش ڕەگەزپەرست بم!***

—منالآن ڕەگەزپەرست نین، هیچ منالێك وەکو ڕەگەزپەرست لە دایك نابێت، ئەگەر دایك و باوك، یان کەسوکاری منالێك، بیرۆکەی سەیرو سەمەرەی ڕەگەزپەرستانەیان نەخستبێتە مێشکی منالەکەیانەوە، هیچ هۆیەك نییە بۆ ئەوەی منالێك ببێت بە ڕەگەزپەرست. بۆ نموونە: ئەگەر ئێمە ئەوە بخەینە مێشکی تۆوە، کەئەوانەی پێستیان سپییە باڵاترن لەوانەی ڕەنگی پێستیان تاریکەو، تۆش ئەوە بە جددی وەربگریت، ئەوا ڕێی تێدەچێت تۆ بە جۆرێکی ڕەگەزپەرستانە لە بەرانبەر پێستتاریکەکاندا ڕەفتار بکەیت.

***—ئەوەی کە باڵاتر بێت، چ مانایەکی هەیە؟***

—بۆ نموونە: ئەوە دەگەیەنێت، کە مرۆڤ هەر لەبەرئەوەی سپییە، زیرەکترە لە کەسێك کە پێستی ڕەنگێکی تری هەیە، ئەوجا ئەو پێستە ڕەش بێت یان زەرد. کە لەشی مرۆڤەکان لەیەکتر جیاوازن و، ئەوەش بووەتە هۆی ئەوەی لە یەکتر نەچن، بەو مانایە نییە کە ئێمە ناتوانین یەکسان بین.

***—لەو باوەڕەدایت منیش بتوانم ببم بە ڕەگەزپەرست؟***

—بێگومان دەتوانێت ببێت، ئەوە پێوەندی بەو جۆری پەروەردەیەوە هەیە، کە پێی گۆش دەکرێیت. باشترین شت ئەوەیە، کە ڕەگەزپەرستی بناسین و ئاگادار بین، نەبین بە ڕەگەزپەرست. بەواتایەکی تر: لەوە تێبگەین کە هەرمنالێك، هەر گەورەیەك، ڕۆژێك لە ڕۆژان دەتوانێت هەست بە ڕق بکات و ڕقی خۆی بەرانبەر کەسێك، کە هیچ خراپەیەکی بەرانبەر نەکردووە، نیشان بدات. هێندە نەبێت کە لەو ناچێت و جیاوازە. ئەمەش زوو زوو ڕوودەدات. ئێمە هەر یەکێکمان دەتوانین، ڕۆژێك لە ڕۆژان، نائۆستانە ڕەفتار بکەین و هەست بە ناڕەحەتی و بێزاری بکەین. ئەوکاتە بەرانبەر کەسێك کە نایناسین، ڕقمان هەڵدەستێت، لەو باوەڕەداین کە لەو باشترین، لە بەرانبەر ئەودا هەست دەکەین، یان باڵادەست یان بندەستین، نامانەوێت توخنی بکەوین، نامانەوێت

ببێت بە دراوسێمان. لەوەش زیاتر نامانەوێت ببێت بە هاوڕێمان، ئەمەش تەنیا لەبەرئەوەی ئەو کەسە لە ئێمە ناچێت و جیاوازە.

*–لە ئێمە ناچێت؟*

–لە یەکنەچوون، پێچەوانەی لە یەکچوونە. واتە: کەسێك کتومت وەکوو تۆ نەبێت. ئاساییترین لەیەکنەچوونیش، لە یەکنەچوونی جنسییە. پیاوێك بە جۆرێکی جیاواز لە ژنێك هەست دەکات و بە پێچەوانەوە. بەڵام ئەگەر لێکنەچوون لەم جۆرەیان بێت، زۆربەی جاران، سەرنجراکێش و خۆشە.

لە بارێکی تردا، ئەوەی کە مرۆڤ بە "جیاواز" ناودێری دەکات، کەسێکە، کە ڕەنگی پێستی لە ڕەنگی پێستی ئێمە ناچێت، زمانێکی تر دەپەیڤێت جیاواز لەو زمانەی ئێمە قسەی پێ دەکەین، ئەو جۆرە خواردنە لێ نانێت کە ئێمە دەیخۆین، خوونەریتی لەهی ئێمە جیاوازە، لەسەر دینێکی ترە، بە شێوەیەکی تر دەژی و بە شێوەیەکی جیاواز لە ئێمە جەژنەکانی بەسەر دەکات. جیاوازییەك لە ڕەنگ و ڕووخساریدا هەیە –درێژیی لەش، ڕەنگی پێست، سەروسیماو شتی تری لەو جۆرە– هەروەها جیاوازە لەوەدا، کە چۆنە، چ بڕوایەکی هەیەو چۆن بیر دەکاتەوە.

*–کەواتە ڕەگەزپەرست حەز لە زمان، جۆری خواردن و ئەو ڕەنگانە ناکات کە هی خۆی نین؟*

–نا.. بەو جۆرە نییە، ڕەگەزپەرستێك دەتوانێت حەز لەوە بکات زمانی تر فێر ببێت، چونکە لە کاروباری ڕۆژانەیدا پێویستی پێیەتی، یان هەر بۆ خۆشیو ڕابواردنی خۆی، بەڵام دەتوانێت ڕقی لەو خەڵکە بیبێتەوە کە بەو زمانە قسە دەکەن. کتومت وەکوو ئەوەی کە ڕەگەزپەرستێك نەخوازێت ژوورێك بە خوێندکارێکی بیانی بەکرێ بدات، بۆ نموونە: بە ڤێتنامییەك، بەڵام بەوپەڕی دڵشادییەوە بچێت لە چێشتخانە ئاساییەکان نان بخوات. ڕەگەزپەرست ئەو کەسەیە کە پێی وایە ئەوەی لە شتەکانی خۆی جیاوازە هەڕەشە لە هێمنی و ئاساییشی ئەو دەکات.

*–ئایا ڕەگەزپەرستە، کە هەست بە نائێمنی و هەڕەشە دەکات؟*

–نا، چونکە ئەو لە هەموو شتێك، کە لە خۆی نەچێت، دەترسێت، ڕەگەزپەرست کەسێکە کە بەدەست گرێیەکی دەروونییەوە ئازار دەچێژێت، ئەویش هەست بەخۆ بەنرختر یان کەمتر زانینە. ئەمەشی بە ئاسانی بۆ ناچێتە سەر، چونکە لە هەردوو بارەکەدا دڵ پڕ لە ڕق و کینە هەڵسوکەوت دەکات.

*–دەترسێت؟*

–مرۆڤ دەیەوێت هەست بە هێمنی و ئارامی بکات. حەزی لەو شتانە نییە، کە دەبن بە هۆی تێکدانی ئەو ئارامییەی پێی قایل و ڕازییە. حەز دەکات، لە بەرانبەر هەر شتێکی تازەدا، بەدگومان بێت. ئێمە، زۆربەی جاران هەست بە ترس دەکەین لە بەرانبەر شتێکدا کە نایناسین. دەترسین کاتێك تاریك دەبێت، چونکە، دوای ئەوەی گشت ڕووناکییەکان کوژاونەتەوە، ئەوە نابینین کە چی ڕوو دەدات. لە بەرانبەر ئەو شتەدا کە نایناسین هەست بە دەستەوەستانی دەکەین. هەموو مەترسییەك لە پێش خۆماندا دەبینین. بێ هیچ هۆیەك. بێ هیچ لێکدانەوەیەکی ژیرانە. هەندێك جار هیچ هۆیەك بۆ ئەو ترسە نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەترسین، هیچ گرنگ نییە چۆن لەوە تێدەگەین و لێکی دەدەینەوە، کەچی بە جۆرێك هەڵسوکەوت دەکەین کە هەڕەشەیەکی گەورەمان ڕوویەڕوو ببێتەوە. ڕەگەزپەرستی شتێك نییە کە مرۆڤ بتوانێت ژیرانە گفتوگۆی لەسەر بکات.

*–بابە ئەگەر ڕەگەزپەرست کەسێك بێت کە ئەوەندە بترسێت، دەبێت ئەو پیاوەی*

***ڕێبەرایەتیی ئەو پارتە دەکات، کە حەزی لە چارەی بیانییان نییە، هەمیشە بترسێت(2). لەگەڵ ئەوەشدا، هەر جارێك كە لە تەلەفیزیۆندا دەردەکەوێت، منم كە دەترسم! ئەو دەقیژێنێت، هەڕەشە لە ڕۆژنامەنووسان دەکات و بە مێزەکەی بەردەمیدا دەکێشێت؟***

—ئا، بەڵام ئەو ڕێبەرە سیاسیەی تۆ لە بارەیەوە دەدوێیت، بە سیاسەتمەدارێکی تووڕەو تڕۆ ناسراوە. ڕەگەزپەرستییەکەی ئەو لە وشەگەلێکی پڕ لە زەبروزەنگدا خۆی دەردەبڕێت. بۆ ئەو خەڵکانەی کە پلەی خوێندەوارییان نزمە بەسەرهات و چیرۆکی بێ بنج و بنەوان و بێ سەروبەر دەگێڕێتەوە کە دەیانترسێنێت. ئەو ترس و بیمی خەڵك بەکار دەهێنێت، ترس و بیمێك، کە هەندێ جار خەڵکەکە لە ڕاستیشدا هەستی پێ دەکەن. بۆ نموونە، ئەو دەڵێت: كە پەنامێنەکان بۆ ئەوە هاتوونەتە فرانسا کە دەست بەسەر کاروباری فرانسییەکاندا بگرن، بیمەی کۆمەڵایەتی و چارەسەری خۆڕایی لە خەستەخانەکاندا بەدەست بهێنن. ئەمە ڕاست نییە. چونکە پەنامێنەکان زۆربەی جاران ئەو کاروبارانە دەکەن، کە فرەنسییەکان پێیان ڕازی نین و نایانەوێ. پەنامێنەکان، باج دەدەن و هەروەها ئەو خەرجییە کۆمەڵایەتییانەش دەدەن کە پێویستە لە سەریان بیاندەن، کەواتە: مافی ئەوەشیان هەیە، کاتێك نەخۆش دەکەون، چارەسەر بەدەست بهێنن. ئەگەر سبەینێ گشت پەنامێنەکان لە فرانسا دەربکرێن، وڵاتەکەمان لە پەلوپۆ دەکەوێت.

—تێ دەگەم. ڕەگەزپەرست دەترسێت، ئەگەرچی هیچ هۆیەکی بە دەستەوە نییە بۆ ئەوەی بترسێت.

—ئەو لە هەر کەسێکی نامۆ، هەر شتێك كە لە نزیکەوە نەیناسێت، دەترسێت. بەتایبەت ئەگەر ئەو کەسە نامۆیە لەخۆی بێدەرامەت و هەژارتر بێت. ئەو زۆر زیاتر بە گومانەوە لە کرێکارێکی ئەفریقایی دەنواڕێت، وەکوو لە دەوڵەمەند و پارەدارێکی ئەمریکایی. ئەوجا با باسی ئەوە هەر نەکەین کە میرێکی عەرەب کاتێك بۆ گەشتوگوزارو ڕابواردن دێت بۆ ریفیێرا، چۆن پێشوازیی لێ دەکرێت و باوەشی بۆ دەکرێتەوە، چونکە ئەوەی بەو شێوەیە بەخێرهاتنی دەکرێت عەرەبێك نییە، بەڵکە پیاوێکی دەوڵەمەندەو بۆ ئەوە هاتووە ماڵ و سامانەکەی بە فیڕۆ بدات.

***—وشەی نامۆ چی دەگەیەنێت؟***

—وشەی "نامۆ" ئەوە دەگەیەنێت، کە مرۆڤ نامۆیە، کە مرۆڤ لە جێگایەکی ترەوە، لە دەرەوە، هاتووە. نامۆ، کەسێکە کەسەر بە ئێمە نییە، خزموکەسی ئێمە نییە، لە خۆمان نییە، کەسێکە کە لە وڵاتێکی دیکەوە هاتووە، وڵاتێك کە ڕەنگە دوور یان نزیك بێت لە ئێمەوە، هەندێ جاریش لە شارێکی ترەوە، یان لە دێیەکی ترەوە، هاتووە. هەر لەوەشەوە وشەی "دژایەتیکردنی بیانییان" کەوتۆتە نێو ناوانەوە، کەواتە: دژایەتیی هەر شتێك، هەر کەسێك، بکەیت کە بەتۆ نامۆ بێت. ئەمڕۆ وشەی "بیانی" بۆ شتێکی سەیرو سەمەرەتر بەکار دەهێنرێت، شتێك کە زۆر جیاوازترە لەوەی ئێمە پێی ڕاهاتووین و دەتوانین لە دەوروبەری خۆماندا ببینین. بە واتایەکی تر هەر شتێك، کە "ریزپەڕ" بێت.

***—ئەی من بیانییەکم کاتێك کە دەچمە سەردانی هاوڕێیەکم لە نۆرماندی؟***

—بێگومان بۆ خەڵکی ئەو دەوروبەرە تۆ بیانییت، چونکە تۆ لە پاریسەوە دەچیت و بێجگە لەوەیش لە بنەچەوە خەڵکی مەغریبیت. دێتەوە بیرت کە لە سەنیگال بووین؟ بۆ سەنیگالییەکان تۆ بیانی بوویت.

***—بەڵام سەنیگالییەکان لە من نەدەترسان، منیش لەوان نەدەترسام!***

–وایە، بەڵام زۆر پێش ئەوە من و دایکت بۆمان باس کردبوویت کە لە غەریبان نەترسیت، بەبێ گوێدانە ئەوەی دەوڵەمەند یان هەژار بن، درێژ بن یان کورت، سپی یان رەش بن. ئەمەت لەبیر نەچێت! ئێمە هەمیشە بۆ کەسێك بیانیین، بە واتایەکی تر: ئێمە هەمیشە لەلایەن کەسێکەوە هەمان ئەسلوفەسلی ئێمەی نییە بە بیانی تەماشا دەکرێین.

*–بابە، لەگەڵ ئەوەشدا، لەوە تێناگەم بۆ رەگەزپەرستی، کەم و زۆر، لە هەموو جێیەك هەیە.*

–لەو کۆمەڵگایانەدا کە لە زۆر کۆندا هەبوون، ئەو کۆمەڵگایانەی کە ئێمە بە کۆمەڵگا سەرەتاییەکان ناویان دەبەین، خەڵکی زۆرجاران وەکوو گیانلەبەران هەڵسوکەوتیان دەکرد. پشیلەیەك، پێش هەموو شتێك، ئەو جێیە دیاری دەکات کە تییدا دێت و دەچێت و بەجێی خۆی دەزانێت. ئەگەر پشیلەیەکی تر، یان هەر گیانلەبەرێکی تر، هەوڵ بدات خواردنەکەی بخوات، یان بیەوێت پەلاماری بەچکەکانی بدات، پشیلەکە لە جێیەکەی خۆیەوە هەوڵی پاراستنی خۆی و بەچکەکانی دەدات و چڕنووکەکانی دەخاتە کار. مرۆڤیش بەهەمان شێوەیە. مرۆڤ دەیەوێتماڵەکەی خۆی بە ئاشتی و ئاسایشی بهێڵێتەوە، دەیەوێت پارێزگاری لە زەوییەکەی بکات، دەیەوێت ئەو ماڵومولکەی هەیەتی و ئەوەی لە پێناویدا دەجەنگێت، بیهێڵێتەوە. ئەمەش شتێکی سەیر نییە. بەڵام رەگەزپەرستێك، پێی وایە کە بیانییەك –بێ گوێدانە ئەوەی ئەو بیانییە کێیە– هاتووە بۆ ئەوەی هەموو مولکوماڵەکەی لەژێر دەست دەربهێنێت. بۆیە هەمیشە لە پارێزدایە، بێ ئەوەی هیچ بیرێك بکاتەوە. گیانلەبەرێك، بەر لەوەی هێرشی بکرێتە سەر، هێرش ناکات. بەڵام مرۆڤ هەندێ جار لە بیانییەك دەدات، بەبێ ئەوەی ئەو بیانییە هەر بیری لەوەش کردبێتەوە بچووکترین و بێنرخترین شتی لێ بدزێت.

*–لە هەموو جێیەکیش هەر بەو شێوەیەیە؟*

–ئا، کەم تا زۆر، لە هەموو جێیەك بەو شێوەیەیە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە دەبێت هەر بەو شێوەیە بمێنێتەوەو بەردەوام بێت. مرۆڤ هەمیشە بەو شێوەیە هەڵسوکەوت و رەفتاری کردووە. سروشت شتێکە و کولتووریش شتێکی تر. شتێك هەیە لە ناخەوە مرۆڤ هان دەدات بە جۆرێك هەڵسوکەوت بکات، بێ ئەوەی بیری لێ بکاتەوە، بێ هیچ زیرەکی و لێوردبوونەوەیەك. هەروەها جۆرێکی تریش لە هەڵسوکەوت هەیە، کە لە دوای بیرکردنەوەو لێوردبوونەوە دەکرێت، جۆرێك لە هەڵسوکەوت کە مرۆڤ لە گۆشکردن و پەروەردەکردنەوە، لە عەقڵ و قوتابخانەوە، فێری بووە. واتە: ئەوەی ئێمە بە "کولتوور" ناوی دەبەین، کە پێچەوانەی "سروشت"ە. لە رێی کولتوورەوە فێر دەبین کە لەگەڵ یەکتریدا بین، بێجگە لەوەش فێر دەبین کە ئێمە تەنیا کەسانێك نیین لە دنیادا، گەلانی تریش هەن کە خاوەنی خوونەریتی تایبەت بە خۆیانن، کە بەشێوەیەکی تر دەژین و هەمان نرخ و بەهای ئێمەیان هەیە.

*–ئەگەر تۆ مەبەستت لە کولتوور ئەوەیە کە وەکوو پەروەردەکردن وایە، کەواتە رەگەزپەرستییش دەتوانێت ئەوە بهێنێتە ئاراوە کە مرۆڤ بتوانێت فێری ببێت..*

–مرۆڤ بە رەگەزپەرستی لە دایك نابێت، دەبێت بە رەگەزپەرست. پەروەردەکردنیش باش و خراپی هەیە. پەیوەندیی بەوەوە هەیە کێ بەکاری پەروەردەکردن هەڵدەستێت، بێ گرنگیدان بەوەی کە

ئەو پەروەردەکردنــە لـە فێرگـە یـان لـە ماڵدا پـێڕەو دەکرێت.

*-کەواتــە گیانلەبــەرێك، کــە پــەروەردەش ناکرێت، دەتوانێت لە مرۆڤێك باشتر بێت!*

-گیانلەبەران پێش دەست بڕیار لەســەر هیــچ شتێك نـادەن. بـەڵام مـرۆڤ کۆمـەڵێك دیـدو ڕوانینـی پێشدەست بڕیار لەسەردراوی خۆی هەیە. بەرلـەوەی کەسانی دیکە بناسێت، بڕیار لەسەریان دەدات. پێی وایە، کە پێشدەست دەزانێـت ئـەو کەسانە کێـن و چ بەهاو نرخێکیان هەیە. زۆریــەی جارانیش بـە هەڵـەدا دەچێت. تر س و بیمەکانیشی هەر لەوێوە ســەرچاوە دەگرن. بۆ ئـەوەش کــە بــەرەنگاری ئــەو تـرس و بیمانـــەی ببێتـــەوە، پـــەنا دەباتـــە بـــەر جـــەنگ هەڵگیرساندن. ئـەوەش بزانـە، کاتێك دەڵێم مـرۆڤ دەترســێت، پێــت وا نـــەبێت کـــە لـــە ترســـاندا هەڵدەلـــەرزێت، بـــە پێچەوانـــەوە، ترســـانەکەی توڕەوتــڕۆو سەرشـێتی دەکـات و پــەلامار دەدات. ڕەگەزپەرست تووڕەو تڕۆو پەلاماردەرە.

*-کەواتــە ڕەگەزپەرستی دەبێــت بــەهۆی بەرپابوونـی جەنگ؟*

-لـە هـەندێ جاردا. هەمیشـە کەسـانێك هـەن، دەیانەوێت مـاڵ و سامانی خـەڵکی دیکـە بـۆ خۆیـان زەوت بکـەن. هــەندێك کــەس ڕەگەزپەرسـتی، یـان ئایین، بەکاردەهێنن بۆ ئـەوەی وا لـە خـەڵکی بکـەن ڕقیان لە یەکتر ببێتەوە، ئەگەرچی یەکتر ناناسن و بە یەکدی ئاشنا نین. هەمیشە ترسـێك لە بەرانبـەر ئـەو شتانەدا هەیە کە بیانین، لـە بەرانبـەر ئـەوەدا کــە کەسێکی بیــانی بێـت و ماڵەکـەم، ئیشـەکەم یـان خاووخێزانەکـــەم لـــە ژێردەســـت دەریـــهێنێت. کەموکوڕی لە زانیاریشدا، ژیان بەترس دەبەخشـێت. من نازانم ئەو بیانییە کێیە، ئەویش نازانێت مـن کێـم. بۆ نموونە: بیر لە دراوسێکانمان بکـەرەوە. ئـەوان تـا درەنگانێکیش لە بەرانبەر ئێمەدا بەدگومان بوون، تـا ئــەو ڕۆژەی بانگمــان کــردن بــۆ ئــەوەی بێــن و (کوسـکوس)(3)مـان لەگـەڵدا بخۆن. هـەر ئەوسـاش بۆیان دەرکـەوت کـە ئێمـەش وەکـو ئـەوان دەژیـین. چیتر ئێمـە لــە چـاوی ئـەواندا ترسـناك نـەبووین، ئەگــەرچی ئێمـــە خـــەڵکی مـــەغریبین. کـــاتێك بانگهێشـــتمان کـــردن، بەدگومانییەکـــەیانمان ڕەواندەوە. لەگــەڵ یــەکتردا دوایـن و نـەختێك لـە یەکتری شارەزا بووین. پێکەوە پێکەنین. ئەمەش بەو مانایـە ئێستاکە هـاوڕێ و دراوسێی یـەکترین، بــە پێچەوانەی جارانەوە کە کاتێك لەسەر پلیکانەکان بـە یەکتر دەگەیشتین، تەنیا سڵاوێکی ئاساییمان لەیەکتر دەکردو هیچی تر.

*-کەواتــــە، ئەگـــــەر بمانــــەوێت لــــە دژی ڕەگەزپەرستی بوەستینەوە، دەبێت میوانداریی یەکتری بکەین!*

-ئەمـە پێشنیازێکی چاکـە. یەکترناسین، قسـە لەگەڵ یەکتر کردن و پێکـەوە پێکـەنین، هـەوڵدان بۆ ئەوەی شتە خۆش و خەمڕەوێنـەکان لەگـەڵ یـەکتردا بـــەش بکـــەین، هـــەروەها شـــتە دژوارو خەمهێنـەرەکانیش، نیشـاندانی ئـەوەی کــە زۆریــەی جاران هەمان خەم و پەژارەمان هەیەو لە هەمان شت ورد دەبینـەوە، شـتێکە کـە دەتوانێـت بــەر بــە ڕەگەزپەرستی بگرێت و بەسەریدا زاڵ بێت. گەشـت و گـەڕانیش شـێوەیەکی تـرە بـۆ ناسـین و ئاشـنابوون بەوانی دیکە. ناسین و ئاشـنابوون بـە خـەڵکی دیکـە، بۆ ئـەوەی زیاتر خۆمـان بناسـین و بـەخۆمان ئاشـنا بین.

*-ئایا ڕەگەزپەرستی هەمیشە لە ئارادا بووە؟*

-نــا، بــە درێژایـــی هـــەبوونی مـــرۆڤ، ڕەگەزپەرستییش هەبووە، بـەڵام بەشـێوەو شـێوازی جۆراوجـۆر و هـاوجووت لەگـەڵ ئـەو سـەردەمەی کـە مرۆڤ تێیدا ژیاوە. لە کۆندا خەڵك بـە چـەکی سـادەو

سەرەتایی، بە کۆتەك، بۆ پاراستنی جێوڕێی خۆیان، بۆ پارێزگاریکردن لە کوختەکەیان، بۆ زەوتکردنی ژنێك، بۆ بەدەستهێنانی بژێو و شتی لەو جۆرە، لەگەڵ یەکتردا دەجەنگین. بەو جۆرە سنووری قەڵەمڕەوەکانی خۆیان بەدیوار دەتەنی و چەکەکانیان تیژ دەکردەوە، چونکە لەوە دەترسان کە هێرش بکرێتە سەریان. تەنیا شتێك کە مرۆڤ بیری لێ دەکاتەوە خۆپاراستن و هەست بە دڵنیایی کردنی خۆیەتی، ئەمەش وا دەکات کە جارنا لە دراوسێیەکی، لەو کەسەی بەو نامۆیە، بترسێت.

***—ئایا رەگەزپەرستی و جەنگ هەمان شتن؟***

—هەڵگیرساندن و بەرپابوونی جەنگ دەتوانێت چەندین هۆی هەبێت، زۆربەی جارانیش پێوەندی بە ماڵ و سامانەوە هەیە. بەلام، لەگەڵ ئەوەشدا، هەندێك جەنگ لە ئەنجامی ئەوەدا بەرپا دەبێت کە گرۆیەك پێی وایە لە گرۆیەکی تر شایستەترو بالادەستترە. ئێمە دەتوانین لە رێگای عەقڵ و پەروەردەکردنەوە خۆ لەم جۆرە تێڕوانینە رزگار بکەین. بۆ ئەوەی بەو رزگارییەش بگەین، دەبێت مرۆڤ بڕیار بدات کە چی تر لە دراوسێیەکەی و لە بیانییان نەترسێت و سڵیان لێ نەکاتەوە.

***—کەواتە دەتوانین چی بکەین؟***

—دەتوانین خۆمان فێربکەین. زانیاریی زیاتر بەدەست بهێنین. بیر لە کارو کردەوەکانمان بکەینەوە. هەوڵ بدەین تێبگەین و بە سەرنج و تێڕامانەوە لەو شتانە ورد ببینەوە کە پێوەندییان بە مرۆڤەوە هەیە، هەوڵ بدەین لەو هۆکارانە بگەین کە هاندەرن بۆ ئەوەی مرۆڤێك..

***—هاندەر، مەبەستت لە هۆکاری هاندەر چییە؟***

—هۆکارە هاندەرەکان ئەوانەن کە پاڵ بە مرۆڤێکەوە دەنێن بۆ گەیشتن بە ئامانجێك بەرێ بکەوێت. ناوەرۆکی ئەمەش لە بنەچەدا دەگەڕێتەوە بۆ "دەرپەڕاندن" —راونان و دەرپەڕاندنی دوژمنەکانت— واتە: راونان و بەدواکەوتنی کەسێك. دەرپەڕاندنی کەسێکیش، کتومت رقلێبوونەوە لەو کەسە دەگەیەنێت. ئەمەش هەستێکە کە کەس نایەوێت توشی ببێت.

***—ئایا کە کەسێك بیەوێت بیانییەك، هەر لەبەرئەوەی رقی لێی دەبێتەوە، دەرپەڕێنێت، رەگەزپەرستە؟***

—ئا، چونکە ئەگەرچی ئەو کەسە هەست بە **هیچ** هەڕەشە و ترسێك لەسەر ژیان ناکات، بیانییەك راو دەنێت و دەیەوێت ولاتبەدەری بکات، هەر تەنیا لەبەرئەوەی حەزی لە چارەی نییە، بۆ ئەوەی خۆی بە رەوا بناسێت و پاساوی کارو کردەوەکانی خۆیشی بداتەوە، ئەو هۆکارانە دەدۆزێتەوە کە لەگەڵ خۆیدا دەگونجێن. هەندێ جار پەنا دەباتە بەر زانست، بەلام زانست قەت رەگەزپەرستیی بە رەوا نەناسیوە. ئەو لەو بڕوایەدایە: زانست دەتوانێت هەر شتێك بڵێت، چونکە پێی وایە کە زانست دەتوانێت بەڵگەی وا بهێنێتەوە کە هیچ کەس نەتوانێت لە روویدا بەدەنگ بێت و بەرەنگاری ببێتەوە. رەگەزپەرستی هیچ بنەمایەکی زانستیی نییە، ئەگەرچی کەسانێك هەن هەوڵ دەدەن هۆکاری زانستییانە بەکاربهێنن بۆ ئەوەی جێوڕێ بۆ بیروبۆچوونەکانیان لە بارەی بە نزمی تێڕوانین و بێبەهاکردنەوە خۆش بکەن.

***—مەبەستت لە بەنزمی تێڕوانین چییە.***

—بە نزمی تێڕوانین و بێبەهاکردن و ئەوەیە کە گرۆیەك، لە رێگای ئەوەوە کە بە شێوەیەکی نزمتر مامەڵەی لەگەڵدا بکەیت، لە گرۆیەکی دیکە جیا بکەیتەوە. وەکوو ئەوەی، کە بەڕێوەبەری قوتابخانەکەتان بڕیاری ئەوەی دابێت خوێندکارە رەشپێستەکان لە پۆلێکدا کۆبکاتەوە، چونکە پێی وابووە ئەوان هێندەی قوتابییەکانی تر زیرەك و بەئەقڵ نین. خۆشبەختانە، ئەم جۆرە هەڵاواردن و

بێبەهاکردنە لە قوتابخانەکانی فرانسادا نییە. بەڵام لە قوتابخانەکانی ئەمریکاو خوارووی ئەفریقادا هەیە. کاتێك مرۆڤ گرۆیەك ناچار دەکات دوورەپەرێزو لاتەریك لە گرۆیەکانی تر بژی، شتێك دەهێنێتە ئاراوە کە پێی دەوترێت (گێتوو).

*-(گێتوو) جۆرێکە لە زیندان؟*

-وشەی "گێتوو" ناوی گەڕەکێکە لە شاری ڤێنیسیا لە ئیتالیا. ساڵی **1516** جولەکەکانی ڤێنیسیایان ڕەوانەی ئەو گەڕەکە کردو لە خەڵکی شارەکەیان هەڵاواردن تا لەوێوە بۆ خۆیان و دوورەپەرێز لە خەڵکی شارەکە ژیان بەسەر بەرن. گێتوو، جۆرێکە لە زیندان. بەهەمەحاڵ ئەمەش جۆرێکە لە بێبەهاکردن و بە نزمی تێڕوانین.

*-چ بەڵگەیەکی زانستی هەیە بۆ ئەوەی کە کەسێك ڕەگەزپەرستە؟*

-هیچ بەڵگەیەك نییە، بەڵام ڕەگەزپەرستێك پێی وایە و بە خۆی ڕەوا دەبینێت کە بیانییەك سەر بە ڕەگەزێکی ترە، ڕەگەزێك کە ئەو پێی وایە لە ڕەگەزەکەی خۆی بندەست و بێبەهاترە. بەڵام لەوەدا بە هەڵەدا چووە و بەتەواوی شوێنەون بووە، چونکە تەنیا یەك ڕەگەز هەیە -بەجیا لە گیانلەبەران- ئەویش ڕەگەزی مرۆڤە. لەنێو گیانلەبەراندا جیاوازییەکەی زۆر هەیە لە جۆرێکەوە بۆ جۆرێکی تر. سەگ هەیەو گایش هەیە. لەنێو سەگاندا جیاوازییەکان هێندە بەرچاون کە بە ئاسانی (شێفەر)ێك لە (تاکس)ێك جیادەکەیتەوە، کەواتە مرۆڤ دەتوانێت جۆرەکان لە یەکتری جیابکاتەوە. ئەمە لەنێو مرۆڤاندا ناکرێت، چونکە هەر مرۆڤێك لەوی دیکە دەچێت.

*-بەڵام، بابە، خەڵك دەڵێن: کەسێك سپیپێستە، کەسێکی تر ڕەشپێست و، کەسێکی دیکە پێستی زەردە، ئەمە لە قوتابخانە دەبیستین. لەم ڕۆژانەدا مامۆستاکەمان وتی: عەبدو، کە خەڵکی (مالی)یە، سەر بە ڕەگەزی پێستڕەشانە.*

-ئەگەر مامۆستاکەت وای وتبێت، بەهەڵەدا چووە -ببوورە، دەزانم مامۆستاکەتت خۆش دەوێت- بەڵام بە هەڵەدا چووەو لەو بڕوایەشدام بۆ خۆیشی لەوە بێئاگایە. گوێ بگرە، کچە شیرینەکەم، مریەم: هیچ ڕەگەزێکی مرۆڤی هەبوونی نییە. تەنیا یەك بەرەبابی مرۆیی هەیەو لە نێو ئەویشدا ژن و پیاوان هەن، ڕەنگ، درێژی و تواناو لێهاتووییان، لە یەکتر جیاوازە. هەروەهاش لەنێو گیانلەبەراندا ڕەگەزی جیاواز هەن. وشەی "ڕەگەز" دەبوو بۆ ئەوە بەکار نەهێنرایە کە مرۆڤەکان لە یەکتری جودان. هیچ بنەمایەکی زانستی بۆ وشەی "ڕەگەز" لە ئارادا نییە. ئەم وشەیە بۆ ئەوە بەکارهێنراوە زێدەڕۆیی بە جیاوازییە دیار و ئاشکراکانەوە، بە واتایەکی دیکە: جیاوازییە فیزیکییەکانەوە، بکرێت. هیچ کەسێك مافی ئەوەی نییە لە جیاوازییە فیزیکیەکانەوە -ڕەنگی پێست، درێژی و سەروسیما- ڕێ هەڵگرێت بۆ ئەوەی یەکێك لە یەکێکی دیکە جیابکاتەوە، یان بە مانایەکی تر لەو باوەڕەدا بێت کە کەسانێك هەن لەسەروو کەسانێکی دیکەوەوەن و لەوان باڵادەستترن. کەس مافی ئەوەی نییە پێی وابێت، بەر لەهەر شتێکی دیکەش ناوی ئەوە بهێنێت، کە هەر لەبەر ئەوەی مرۆڤێك سپییە بەو مانایەیە کە لە کەسێکی ڕەنگپێست باڵادەستترە. هیوادارم تۆش چیتر وشەی "ڕەگەز" بەکارنەهێنیت. ئەو وشەیە هێندە لە لایەن نەفامانەوە بەخراپی بەکار هێنراوە، چاکترە سووك و هاسان بگۆڕدرێت بە "مرۆڤ". بە مانایەکی دیکە: یانی گشت مرۆڤەکان، کە ژمارەیان یەکجار زۆرەو زۆر لە یەکدیش جیاوازن. بەڵام ئێمە هەموومان، پیاوان و ژنانی سەر ئەم زەمینە هەمان خوێن لە دەمارەکانماندا هەیە، ئەگەرچی پاشان ڕەنگی

پێستمان، پەمەیی، سپی، رەش، قاوەیی تۆخ و زەرد یان هەر رەنگێکی دیکەیە.

*-بۆ ئەفریقاییەکان رەشپێست و ئەورووپاییەکان سپیپێستن؟*

-رەنگی پێست چۆن دەردەکەوێت، پێوەندی بەو پێکهاتەیەوە هەیە کە رەنگی پێستەکە دیاریی دەکات و پێی دەوترێت: میلانین. ئەم پێکهاتەیە شتێکە کە لە هەموو مرۆڤێکدا هەیە. بەڵام پێستی ئەفریقاییەکان لەچاو ئەورووپاییو ئاسیاییەکاندا، رێژەیەکی زیاتر دەردەدات لەو..

*-میلانین، وەکوو پێکهاتەیەکی رەنگی وایە.*

-کەواتە ئەو لە من زیاتر میلانین دەردەدات. ئەوەش دەزانم کە رەنگی خوێنی ئێمە، هەموومان، سوورە، بەڵام کە دایکم پێویستی بە خوێن بوو دۆکتۆر وتی: گرۆی خوێنی تۆ جیاوازە.

-ئا، گرۆی خوێن جیاوازن. (*A*)، (*B*)، (*O*)، و گرۆی (*AB*) هەن، گرۆخوێنی (*O*) دەتوانێت خوێن بە هەموو گرۆیەکانی دیکە بدات. گرۆخوێنی (*AB*) دەتوانێت لە هەموو گرۆیەکانی دیکە وەربگرێت. ئەمەش هیچ پێوەندی بەوەوە نییە کێ لە کێ باشترە، یان خراپترە. جیاوازییەکان لەنێو کولتووردان، لە زماندان، لەخوو نەریت و جۆری هەڵسوکەوت و رەفتارەکاندا، لەجۆری چێشتلێنان و شتی لەو جۆرەدان. (تام)، کە دایکت دەیناسێت، ئەگەرچی خەڵکی ڤێتنامیشە، خوێنی دا بەدایکت و دایکیشت خەڵکی مەغریبە. ئەوان هەمان گرۆخوێنیان هەیە، ئەگەرچی لە دوو جۆر کولتوری جیاوازەوە هاتوون و رەنگی پێستیشیان وەکوو یەك نییە.

*-یانی ئەگەر هاورێی پۆلەکەم، عەبدو، رۆژێك پێویستی بە خوێن بێت، دەتوانێت لە منی وەربگرێت؟*

-بێگومان، ئەگەر یەك گرۆخوێنتان هەبێت.

*-رەگەزپەرست چییە؟*

-رەگەزپەرست ئەو کەسەیە بەو بۆنەیەوەی کە ئەو هەمان رەنگی پێستی نییە، هەمان زمان ناپەیڤێت و جەژنەکانی بەهەمان شێوە بەسەر ناکاتەوە، کە کەسێکی دیکە دەیانکات، پێی وایە لەو کەسە باشتر و باڵادەستترە. ئەو جەخت لەسەر ئەو باوەڕە دەکات، کە چەند رەگەزێك هەن و خۆی بەوە قایل دەکات کە: "من وەکوو رەگەز جوان و ئەوانی دیکە ناشیرینن و لە حەیوان دەچن".

*-ئەی هیچ رەگەز نییە، کە لە رەگەزێکی دیکە باشتر بێت؟*

-نەء.. لە چەرخی حەڤدە و هەژدەدا بەشێك لە مێژوونووسان هەوڵیان دا ئەوە نیشان بدەن -چونکە پێیان وابوو- کە لە کۆندا رەگەزێکی سپی هەبووە هەم بەهێزتر بووەو هەم لەبیرکردنەوەشدا لە رەگەزێکی رەش باشتر بووە. ئەوکاتە خەڵکی پێیان وابووە کە مرۆڤایەتی بەسەر چەند رەگەزێکی وێکنەچوو و جیاجیادا دابەش بووە. تەنانەت مێژوونووسێك ئاماژەی بۆ ئەوەش کردووە کە کام لە گرۆ مرۆڤییەکان سەر بە "رەگەزی تەپەسەرو بندەست" بوون: رەشپێستەکانی ئەفریقا، هاووڵاتییە ئەسڵییەکانی کیشوەرێك لە کیشوەرەکان، ئەبۆرگینییەکان لە ئوستراليا و هیندیە سوورەکانی ئەمریکا. ئەو لەو باوەڕەدا بووە کە: "رەشپێستێك بە بەراورد لەگەڵ مرۆڤێکدا وەکوو کەرێك بووە بە بەراورد لەگەڵ ئەسپێکدا"، بە مانایەکی دیکە: "سەروسیمایەکی هەم کەرۆکەو هەم ناشیرین!" بەڵام پرۆفیسۆرێکی دەرمانسازی، کە شارەزایەکی تەواوە لە خوێنناسیدا دەڵێت: "لە دنیای گیانلەبەراندا، رەگەزە ناتێکەڵ و خالیسەکان تەنیا وەکوو کەرەسەیەك بۆ توێژینەوە و لێکۆڵینەوە بوونیان هەیە، واتە: تەنیا لە لابۆرەکاندا، بۆ نموونە: وەکوو مشك". هەروەها دەڵێت: "جیاوازییە سۆسیۆکولتوورییەکان لەنێوان چینییەك،

هاووڵاتییەکی خەڵکی مالی و فرانسییەکدا زۆرترن لە جیاوازییە جەنەتیکییەکان".

*-مەبەست لە جیاوازییە سۆسیۆکولتوورییەکان چییە؟*

-جیاوازییە سۆسیۆکولتورییەکان ئەو جیاوازییانەن، کە گرۆیەك لە مرۆڤان، لە رووی چۆنیەتیی ژیانەوە لە کۆمەڵگایەکدا، لە گرۆیەکی تر جیا دەکەنەوە -بیرت نەچێت کە هەر گرۆیەك لە مرۆڤان، خودانی خوو و نەریت و هەڵسوکەوتی تایبەت بە خۆیانن-، هەروەها لە رووی ئەفراندنی کلتووریشەوە -مۆسیقای ئەفریقایی هەمان ئاوازی مۆسیقای ئەورووپایی نییە-. کولتووری یەکێك لە کولتووری ئەوی دیکە ناچێت. بەهەمان شێوەش، چۆنیەتیی ژنهێنان و شووکردن و یادکردنەوەی جەژن و بۆنەو یادە خۆشەکان.

*-ئەی جیاوازییە جەنەتیکییەکان، چین؟*

-وشەی "جەنەتیکی" دەگەڕێتەوە بۆ جینەکان، واتە: ئەو پێکهاتە مادییەی کە بۆماوەکانی(4) نێو لەشمانی لەنێو خۆیدا هەڵگرتووە. جینێك ئەو شتەیە کە بۆماوەیەکی لەش دەپارێزێت و بەردەوامیی پێ دەدات. دەزانیت میرات و بۆماوەکان چین؟ ئەو شتانەن کە لە رێی دایك وباوکانەوە بۆ منداڵەکانیان دەمێننەوە: لە رووی پێکهاتەی لەشەوە، یانی هەموو خەسڵەتێکی فیزیکی، و لە رووی ئەوەشەوە کە چۆنیت، هەموو خەسڵەتێکی سایکۆلۆژی. بۆماوەکان وێکچوونە فیزیکییەکان و بەشێك لەو خەسڵەتە تایبەتانە روون دەکەنەوە، کە پێوەندییان بە کەسایەتیی مرۆڤێکەوە هەیەو لە دایك و باوکانەوە بۆ نەوەکانیان دەمێننەوە.

*-کەواتە زیاتر جۆری پەروەردەکردنمانە، نەك جینەکان، کەوا دەکەن ئێمە لە یەکتر جیاواز بین؟*

-هەرچۆنێك بێت، ئێمە لەیەکتر جیاوازین و لێك ناچین. تەنیا ئەوەیە کە کەسانێك لە ئێمە لە هەندێك لەو بۆماوانەدا، کە کەسایەتیان دیاری دەکات، هاوبەشن. زۆربەی جاران ئەو کەسانە ئەوە هەڵدەبژێرن کە پێکەوە بژین و گرۆیەك لە خەڵك پێك دەهێنن کە لە رووی چۆنیەتیی ژیانەوە لە گرۆیەکانی دیکە جیاوازن. زۆر گرۆی مرۆڤان هەن کە بەهۆی رەنگی پێستیانەوە، بەهۆی مووی لەشیانەوە، بەهۆی جیاوازیی سەروسیمایانەوە؛ بەڵام هەروەهاش بەهۆی کولتووری تایبەت بە خۆیانەوە، لە گرۆ مرۆڤییەکانی تر جیاوازن. کاتێکیش ئەو گرۆ جیاوازانە تێکەڵ بە یەکتر دەبن -بەهۆی ژنهێنان و شووکردنەوە- ئەو منداڵانە دەخەنەوە کە بە (مێستیس)ەکان ناودەبرێن -تێکەڵەیەك لە کولتوورو ئەندامی بۆماوەی وێکنەچوو-. زۆربەی جارانیش (مێستیس)ەکان جوانن. هەر ئەو تێکەڵەیەشە وا دەکات کە هێندە جوان و ژیکەڵە بن. تێکەڵبوونی جۆرە وێکنەچووەکان خۆپاراستنێکی چاکە لە بەرانبەر رەگەزپەرستیدا.

*-ئەگەر ئێمە هێندە لە یەکتر جیاواز بین، کەواتە هیچ شتێکی وێکچوومان لەگەڵ یەکدیدا نییە.*

-هەر مرۆڤێك بۆ خۆی دانسقەیە. لە سەرانسەری دنیادا دوو مرۆڤ نین، کە لە هەموو روویەکەوە، لە یەکتری بچن، تەنانەت جمکە یەکهێلکەییەکانیش لەیەکتر ناچن. خەسڵەتی هەرە دیاری مرۆڤ ئەوەیە کە خۆیەتی. بێگومان دەتوانیت کەسێك کە کارێکی دیاریکراو دەکات بە کەسێکی دیکە بگۆڕیت، بەڵام خولقاندنەوەی کەسایەتیی تایبەتی مرۆڤێك مەحاڵە. هەر یەك لە ئێمە دەتوانێت بڵێت: "من وەکوو ئەوانی دیکە نیم" و هەقیشیەتی. وتنی: "من دانسقەم" بە مانای "من باشترینم" نییە. ئەوە تەنیا بۆ ئەوەیە جەخت لەسەر ئەوە بکرێت، کە هەر مرۆڤێك لە جۆری

خۆیدا تاك و تەنیایە. یانی هەر سەرو سیمایەك پەرجوو (موعجیزە)یەکە، شتێکە دانسقەیە کە هیچ کەسێکی دیکە ناتوانێت لاسایی بکاتەوە.

*-منیش؟*

-بێگومان تۆش. تۆ تۆیت، کتومت چۆن عەبدو عەبدوەو (سێلین)یش (سێلین)ە. لە هیچ جێگایەکی ئەم سەرزەمینەدا دوو جێپەنجەی وەکوو یەك نییە. هەر پەنجەیەك، جێپەنجەی تایبەتی خۆی هەیە. هەربۆیە ئەو فیلمانەی لە بارەی دۆزینەوەی تاوانکارانەوەن، بەوە دەست پێ دەکەن کەئەو جێپەنجانە دیاری بکەن، کە لەسەر شتوومەك بەجێ مێڵراون تا لەو رێیەوە ئەو کەسانە بناسنەوە کە لە کاتی روودانی تاوانەکەدا لەو جێیەدا بوون، کە تاوانەکە تێیدا رووی داوە.

*-بەڵام بابە، لەم رۆژانەدا لە تەلەفیزیۆندا فیلمێکم لەسەر بەرخێك بینی، کە دوو دانەی کتومت وەکوو یەکیان لێ دروست کردبوو!*

-ئەوەی تۆ ئێستا باسی دەکەیت ئەوەیە کە بە "لەبەرگرتنەوە" ناودەبرێت، یانی بەرهەمهێنانەوەی شتێك چەند جار بخوازیت. ئەوە دەتوانرێت لەگەڵ شتومەکدا بکرێت. شتومەك بە مەکینە بەرهەم دەهێنرێت و دەتوانێت هەمان شتومەك چەند جاران بەرهەم بهێنێتەوەو گشت جارەکانیش لەیەك بچن. بەڵام دەبوو ئەوە لەگەڵ گیانلەبەرو، بەتایبەتیش لەگەڵ مرۆڤدا نەکرایە.

*-منیش هەر لەو بڕوایەدام یەك (سێلین) لە پۆلەکەماندا بەسەو لەو زیاترم ناوێت.*

-دەزانی ئەگەر مرۆڤ بیتوانیایە مرۆڤ بخولقێنێتەوە، وەکوو چۆن دەتوانێت فۆتۆکۆپی بکات، ئەوسا دەیتوانی دەست بەسەر دنیادا بگرێت، چونکە دەیتوانی هەندێك لە مرۆڤان بێشومار زیاد بکات و وا لە هەندێکیش بکات لە گۆڕێ نەمێنن. ئەگەر وا بووایە زۆر خەتەرناك دەبوو.

*-ئەوە دەمترسێنێت.. من تەنانەت نامەوێت کۆپیەی باشترین هاوڕێی خۆیشم هەبێت!*

-بێجگە لەوەش، ئەگەر خەڵك رێی بە "لەبەرگرتنەوە" بدایە، هیچ دوور نەبوو نەگریس و پیاوخراپان بۆ بەرژەوەندیی تایبەتی خۆیان بەکاریان بهێنایە، بۆ نموونە: بۆ ئەوەی دەسەڵات بگرنە دەست و هەموو بندەست و بێدەسەڵاتان لەناو بەرن. ئێستا، خۆشبەختانە، رەوش بە جۆرێکە کە هەر مرۆڤەو بۆ خۆی دانسقەیەو ناتوانرێت کۆپییەکی کتومت وێکچووی وەکوو ئەو بکەیت. چونکە من کتومت وەکوو دراوسێیەکم، یان وەکوو برا جمکەکەم نیم و، چونکە ئێمە هەموومان لە یەکتر جیاوازین. لەبەرئەوە دەتوانین بڵێین: "ئێمە بەتایبەت لەبەر ئەوەی لە یەك ناچین، دەوڵەمەندین".

*-ئەگەر باش لێت حاڵی بووبم، ئەوا رەگەزپەرست بۆیە لە بیانی دەترسێت، چونکە نازانێت چۆنەو سەری لێ شێواوە، چونکە پێی وایە چەند رەگەزێك هەن و رەگەزەکەی ئەویش باشترینی ئەو رەگەزانەیە؟*

-هەر وایشە، بەڵام ئەمە هەمووی نییە، تۆ زەبروزەنگ و خواستی بەزۆر خۆسەپاندن بەسەر خەڵکانی دیکەتدا لەبیرکردووە.

*-رەگەزپەرستێك ئەو کەسەیە شوێنەوڕ بووەو بەهەڵەدا چووە.*

-رەگەزپەرستان تەواو دڵنیان لەوەی کە سەر بە گرۆیەکن -گرۆیەك دەتوانرێت بە وشەکانی وەکوو ئایین، نەتەوە، زمان و یان گشتیان پێکەوە- وەسف بکرێت، کە بەنرخترە لەو گرۆیەی لەبەردەمی خۆیاندا دەیبینن.

*-چۆن دەکەن بۆ ئەوەی هەست بکەن کە بەنرخترن؟*

-ئەوان لەو بڕوایەدان و بانگەشەی ئەوە دەکەن کە جیاوازیی سروشتی، لەجۆری سروشتی فیزیکی،

هەیە، واتە: جۆرێک کە لە یەکەم تێڕوانیندا دەردەکەوێت. یان لەو بڕوایەدان کە ئەو جیاوازییە پێوەندی بە جیاوازیی کولتوورییەوە هەیە، ئەمەش وا دەکات کە هەست بەوە بکەن کە لە گرۆیەکانی تر بەنرختن. هەندێک لەوانە پەنا دەبەنە بەر ئایین بۆ ئەوەی پاساوی ڕەفتارو هەستەکانی خۆیانی پێ بدەنەوەو بە ڕەوا بیانناسێنن. هەندێک هەن پێیان وایە، کە ئایینەکەی ئەوان بۆ هەمووان باشترین ئایینەو ئەوانەی شوێن ئەو ئایینە ناکەون ڕێگایەکی چەوتیان گرتووە.

*—مەبەستت لەوەیە کە ئایینە جیاوازەکان ڕەگەزپەرستانەن؟*

—بە هیچ جۆرێک مەبەست ئەوە نیە، ئەوە ئایینە جیاوازەکان نین، کە ڕەگەزپەرستانەن، بەڵام خەڵکی زۆرجاران ئایینەکان بۆ نیازو مەرامی ڕەگەزپەرستانە بەکاردەهێنن. ساڵی **1905** پاپا ئوربانی دووەم لە کۆبوونەوەی کڵێساکاندا لە (کلێرمۆنت– فێرناند) دەستپێشکەریی کرد بۆ هەڵگیرسانی جەنگ دژی موسوڵمانەکان، کە بە بێباوەڕان دانران. بە هەزاران لە خاچهەڵگران بەرەو خۆرهەڵاتی ناوین بەکێش کران بۆ قڕکردن و لەناوبردنی عەرەب و تورکان. ئەم جەنگە، بەناوی خواوە، بە جەنگی "خاچپەرستان" ناوبرا، —خاچ هێمای خاچهەڵگرانە، بە پێچەوانەی هیلالەوە کە هێمای موسوڵمانانە—.

خاچهەڵگران، لە چەرخی یانزەوە تا سەرەتای چەرخی پانزە، موسوڵمان و جوولەکانی ئیسپانیایان بە بیانووی جیاوازیی ئاینییەوە لە ئیسپانیا وڵات بەدەر دەکرد.

بۆیە کەسانێک هەن کە بە پاڵپشتی کتێبە پیرۆزەکان، هەوڵ دەدەن بانگەشەی ئەوە بکەن لە کەسانی دیکە باشترن. شەڕوشۆڕی ئاینیش شتێکی نائاسایی نییە.

*—تۆ وتووتە کە قورئان دژی ڕەگەزپەرستییە.*

—نا، قورئان و تەورات و ئینجیلیش، گشت ئەم کتێبە پیرۆزانە، دژی ڕەگەزپەرستین. قورئان دەڵێت کە هەموو مرۆڤان لەبەردەمی خوادا چونیەکن و لە چۆنیەتیی باوەڕیاندا لە یەکدی جیاوازن. لە تەوراتدا نووسراوە: "نابێت نامەقی بە بیانییەک بکەیت و بیچەوسێنیتەوە". ئینجیل جەخت لەسەر ڕێزگرتنی ئەوی تر دەکات، بە واتایەکی تر: ڕێزگرتنی هەر مرۆڤێکی دیکە، ئەوجا ئەو مرۆڤە دراوسێیەکەت، خوشکت یان بیانییەک بێت. لە ئینجیلی نوێشدا نوسراوە: "بەڵام من پێتان دەڵێم: دوژمنەکانتان خۆش بووێت". و "ئەوی ترت وەکوو خۆت خۆش بووێت". هەموو ئاینێک ئاشتی لەنێو گشت مرۆڤاندا ڕادەگەیەنێت.

*—بەڵام ئەی ئەگەر کەسێک باوەڕی بە خوا نەبێت؟ ئەمە دەڵێم چونکە هەندێ جار بیر لەوە دەکەمەوە ئاخۆ لە ڕاستیدا بەهەشت و دۆزەخ هەیە یان نا..*

—ئەگەر کەسێک باوەڕی بە خوا نەبێت، بە بەدگومانییەوەو، جارنا بەتەواوی بەدگومانییەوە، لەلایەن ئەو کەسانەوە تەماشا دەکرێت کە بڕوایان بە خوا هەیە، هەندێک لەوانیش، کە زۆر کارامەو وریان و شایانی ڕێزلێگرتنن، بەچاوی دوژمنایەتییەوە لە بێباوەڕان دەڕوانن.

*—هەراوزەنای چەند ڕۆژێک لەمەوبەر، کە لە تەلەفزیۆنەوە نیشان درا، لەلایەن یەکێک لە ڕۆژنامەنووسەکانەوە درایە پاڵ ئیسلام و موسوڵمانانی پێ گوناهبار کرا. تۆ پێت وایە کە ئەو ڕۆژنامەنووسە ڕەگەزپەرست بوو؟*

—نا، ئەو ڕەگەزپەرست نییە، بەڵام هەر هێندەیە کە زۆر شارەزایی نییە. ئەو ڕۆژنامەنووسە سیاسەت و ئیسلامی تێکەڵ کرد. ئەوە

سیاسەتمەدارانن، کە لە خەبات و تێکۆشانی خۆیاندا، ئیسلام بەکاردەهێنن. ئەوانە بە ئیسلامیستەکان ناودەبرێن. واتە: ئیسلامیستە دەمارگیرەکان.

*-ئەوانە رەگەزپەرستن؟*

-ئیسلامیستەکان، دەمارگیرن. دەمارگیر، یەکێکە کە لەو بڕوایەدایە خۆی خودانی حەقیقەتە. حەقیقەت بەهەموو مانایەکی وشەکە. دەمارگیری و ئایین، زۆرجاران، دەست لەنێو دەستی یەکدین. لەنێو هەموو ئاینێکدا دەمارگیرەکان هەن. ئەوان پێیان وایە کە بەمرەیەکی خودایی رێبەرێتییان دەکات. ئەوانە رێهەڵەکردوون و بەر شەوارەی باوەڕەکەی خۆیان کەوتوون و دەیانەوێت گشت کەسێکی تر ناچار بکەن کە باوەڕ بەهەمان شت بهێنن، کە بۆ خۆیان باوەڕیان پێیەتی. ئەوانە ترسناکن، چونکە هیچ رێزو ئاگایەکیان لە ژیانی خەڵکانی دیکە نییە، لای ئەوان، ژیانی خەڵکانی دیکە هیچ نرخێکی نییە، بەناوی خواکەیانەوە ئامادەن بکوژن و تەنانەت خۆ بە کوشتیش بدەن. زۆربەیان لە لایەن رێبەرێکەوە فریو دەدرێن. ئەوانە بێ هیچ بێنەو بەردەیەك رەگەزپەرستن.

*-وەکوو ئەوانە وان کە دەنگ بۆ (لۆپێن)(5) دەدەن؟*

-(لۆپێن) رێبەرایەتیی پارتێك دەکات، بەرەی نەتەوەیی، کە لەسەر بنجی رەگەزپەرستی هەڵچنراوە، واتە: لەسەر رەگوریشەی رقەبەرایەتیکردنی بیانییان، دژایەتیکردنی پەنامێنەران، رقەبەرایەتیکردنی موسوڵمانان و دژایەتیکردنی جوولەکەکان و هەروەها.

*-یانی پارتی رق و کینەیە!*

-ئا، بەڵام رەنگە گشت ئەوانەی دەنگ بە (لۆپێن) دەدەن، رەگەزپەرست نەبن.. هەندێ جار بیر لەوە دەکەمەوە.. چونکە ئەگەر وا نەبێت، دەبێت چوار ملیۆن رەگەزپەرست لە فرانسادا هەبن! ئەمە ژمارەیەکی زۆرە! ئەمانە فریو دەدرێن، یان ئەوەیە کە نایانەوێت ئەوە ببینن کە لە واقیعدا چۆنە. هەندێ کەس دەنگ بە (لۆپێن) دەدەن، چونکە ریسەکەیان لێ بووەتەوە بە خوری و خۆشیان نازانن چی بکەن. بەڵام پەنا بۆ شێوازێکی هەڵە دەبەن.

*-بابە، چی بکەین بۆ ئەوەی خەڵك دەست لە رەگەزپەرستی بەرداو لێی دوور بکەوێتەوە؟*

-دەبێت بەرچاوی خۆمان رووناك بکەینەوەو دوورتر بڕوانین. زۆر ئاسانترە وا لە خەڵك بکەیت فێری رق و کینە ببن، وەکوو لەوەی فێری خۆشەویستییان بکەیت. زۆر ئاسانترە یەکێك کە نایناسیت خۆشت نەوێت و بەدگومان بیت بەرامبەری، لەبری ئەوەی خۆشت بووێت. ئەمە وەکوو ئەو هۆکارە ماندەرە وایە کە پێشتر باسمان کرد، ئەو هۆکارە ماندەرەی لە شێوەی دەست بە رووەوەنان و ولکردندا خۆی دەردەبڕێت.

*-دەست بە رووەوەنان و ولکردن چییە؟*

-ئەوەیە کاتێك مرۆڤ هەموو دەرگاو پەنجەرەکانی بەرووی خەڵکیدا دادەخات. ئەگەر بیانییەك لە دەرگا بدات، لێی ناکاتەوە. ئەگەریش دیسان لە دەرگا بدات، دەیکاتەوە بەلآم دەست بە روویەوە دەنێت و رێی نادات بچێتە ژوورەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت: ئەو کەسە با وڵ بێت و ڕوو لە جێگایەکی دیکە بکات.

*-ئەمەش رق هەڵدەستێنێت؟*

-ئەمە بەدگومانییەکی سروشتییە، کە هەندێ کەس لە بەرامبەر کەسانی دیکەدا هەستی پێ دەکەن. رق هەستێکی زۆر قووڵتر و جددیترە، چونکە رق لە بەرانبەر پێچەوانەکەی خۆیدا -لە بەرانبەر خۆشەویستیدا- بوونی هەیە.

*-تێ ناگەم، باسی چ جۆرە خۆشەویستییەك دەکەیت؟*

—ئەوەی مرۆڤ لە ئاستی خۆیدا هەستی پێ دەکات.

*—کەس هەیە حەز لە خۆی نەکات و خۆی خۆش نەوێت؟*

—ئەگەر کەسێك حەز لە خۆی نەکات و خۆی خۆش نەوێت، کەسی تریشی خۆش ناوێت و حەزی لێ ناکات. ئەمەش وەکوو نەخۆشییەك وایە. بەڵگەی هەژاریو کڵۆڵییە. ڕەگەزپەرستێك ناتوانێت هێندە خۆی خۆش بووێت، تا جێگای خەڵکی دیکەیش لە دڵیدا ببێتەوە. هەر بۆیەشە هێندە خۆویستە.

*—کەواتە ڕەگەزپەرست کەسێکە کە هیچ کەسێکی خۆش ناوێت و خۆویستە. دەبێت زۆر بەدبەخت و چارەڕەش بێت، چ دۆزەخێکی بۆ خۆی خوڵقاندووە!*

—بەڕاستیش وایە، ڕەگەزپەرستی دۆزەخە.

*—لەم ڕۆژانەدا کە لەگەڵ ماممدا دەدوایت وتت: "دۆزەخ ئەوانی دیکەن". مەبەستت لەوە چی بوو؟*

—ئەوە هیچ پێوەندییەکی بە ڕەگەزپەرستییەوە نییە. مرۆڤ، کاتێك ناچارە بەرگەی ئەو کەسانە بگرێت کە هیچ ئارەزوویەکی نییە ژیان لەگەڵیاندا بەسەر بەرێت، ئەوەی بە دەمدا دێت.

*—با.. ئەمە وەکوو ڕەگەزپەرستی وایە.*

—نا، بە تەواوی نا، چونکە مەسەلەکە ئەوە نییە کە ناچار بیت حەز لە هەموو کەسێك بکەیت. ئەگەر کەسێك، بۆ نموونە: ئامۆزا شرووشێتەکەت، بچێتە ژوورەکەتەوەو دەفتەرەکانت بدڕێنێت و ڕێ لەوە بگرێت بۆ خۆت و لەگەڵ خۆتدا یاری بکەیت، ئەوە ڕەفتارێکی ڕەگەزپەرستانە نییە، ئەگەر لە ژوورەکەت بیکەیتە دەرەوە. بەڵام ئەگەر هاوڕێیەکت لە پۆلەکەتدا، بۆ نموونە: وەکوو عەبدو، بێتە ژوورەکەت، سەلارو شاغر هەڵسوکەوت بکات و هەر لەبەر ئەوەی ڕەشپێستە لە ژوورەکەت بیکەیتە دەرەوە، ئەوە ڕەفتارێکی ڕەگەزپەرستانەیە. لە جیاوازییەکە تێ دەگەیت؟

*—ئەی چۆن، بەڵام هێشتا لەوە تێ ناگەم کە "دۆزەخ ئەوانی دیکەن". یانی چی؟*

—ئەوە حیواری یەکێك لە شانۆنامەکانی (سارتەر)ە، بەناوی "لەبەردەم دەرگا داخراوەکاندا". سێ کەس، دوای مردنیان، لە ژوورێکی جوان و قەشەنگدا، بۆ هەتاهەتایە، دادەنیشن، ناچارن پێکەوە بژین و هیچ ڕێچارەیەکی دیکەیان نییە. ئەوێ دۆزەخە. هەربۆیەشە یەکێکیان دەڵێت: "دۆزەخ ئەوانی دیکەن".

*—کەوایە ئەوە ڕەگەزپەرستی نییە. من ناچار نیم حەز لە هەموو کەسێکی دیکە بکەم، بەڵام چۆن بزانم چ کاتێك ڕەگەزپەرستییە و چ کاتێك ڕەگەزپەرستی نییە؟*

—هیچ کەسێك ناچار نییە بەوەی بێ قەیدو شەرت هەموو کەسێکی دیکەی خۆش بووێت، ئەگەر ئەو کەسەش ناچار بێت لەگەڵ کەسانێکدا بژی کە هەڵبژاردەی خۆی نین، لەوانەیە ئەو ژیانەی پێ ناخۆش بێت و گشت هەڵەو چەوتییەکی چاوەڕواننەکراو لەو ژیانەدا بدۆزێتەوەو ئەمەش وا بکات وەکوو ڕەگەزپەرستێك بێتە پێش چاوان. ڕەگەزپەرستێك هەوڵ دەدات ناحەزیی خۆی بەرانبەر ئەوانی دیکە بە ڕەوا بناسێنێت و کۆمەڵە شتێك بە بیانوو بهێنێتەوە، کە پێوەندییان بە سەروسیمای ئەوانی دیکەوە هەیە، لەوانەیە بڵێت: من حەزم لە چارەی ئەو، یان ئەوی دیکە نییە، چونکە لووتێکی ناقۆڵای هەیە، یان قژبژو قژ لوولە، یان چاوەکانی خێل و قیچن و هەروەها شتی دیکەی لەو جۆرە. ڕەگەزپەرستێك لەناخەوە بەم شێوەیە بیردەکاتەوە: "من پێویستم بەوە نییە بزانم چ هەڵەیەك لە چ کەسێکدا هەیە، یان ئەو کەسە چۆنە، بۆ من هێندە بەسە، کە بزانم ئەو کەسە سەر بە گرۆیەکی تایبەتە

بۆ ئەوەی بتوانم دەست بە روویەوە بنێم و خۆمی لێ تارو تەریك بكرم". بۆ ئەوەش پشت بە خەسلەت و وێكنەچوونی فیزیكی یان سایكۆلۆژی دەبەستێت، تا بیانوو بۆ ئەوە بهێنێتەوە كە بۆچی دەست بە روویەوە دەنێت و خۆی لێ تارو تەریك دەگرێت.

*-دەتوانیت چەند نموونەیەكم بۆ بهێنیتەوە؟*

-لە بارەی رەشپێستانەوە دەڵێن كە ئەوان: "تۆكمەو تۆڵن. بەلام تەمبەڵ و تەوەزەل، چلێس و پیس و پەلۆخن". لە بارەی چینییەكانەوە دەڵێن: "بچكۆلەن، خۆویست و زاڵمن" لە بارەی عەرەبەكانەوە دەڵێن: "سرقایم، تووڕەو تڕۆو مەڵخەلەتێنن، بە توركانیش دەڵێن: "بەهێزو بەزەبرو زەنگن" و لە بارەی جوولەكەكانیشەوە بەهەموو چەوت و چەوێڵییەكی چاوەڕوانكراو و نەكراو بار دەكرێن، بۆ ئەوەی بیانوو بۆ ئەوە بهێنرێتەوە كە بۆ بەو جۆرە راوەدوونران و.. نموونە پڕن. رەشپێستان دەتوانن بڵێن: سپیپێستان بۆنێكی سەیریان لێو دێت، ئاساییەكانیش دەتوانن بڵێن: رەشپێستان دڕندەن و شتی دیكەی لەو جۆرە. تۆ دەبێت گشت وشەیەكی بێسەروبەر لە گەنجینەی وشەكانتدا بكەیتە دەرەوە، دەستەواژەی وەكوو "سەرڕەش"، "كاری قولەڕەش"، "ورتەورتی چینی" و شتی دیكەی لەو چەشنە. ئەوانە گشتیان دەبەنگێن و دەبێت وەدەرنرێن.

*-چۆن بتوانین -لە گەنجینەی وشەكانمان- بیانكەینە دەرەوە؟*

-بەر لە هەر شتێك دەبێت خۆمان فێری هەستی رێزلێگرتن بكەین، رێزگرتن شتێكی بنچینەییە، خەلكی داوای ئەوە ناكەن هەموو كەسێك خۆشیان بووێن، بەلام داوا دەكەن كە وەكوو مرۆڤ رێزیان لێ بگیرێت. رێزگرتن ئەوەیە كە بەتەنگەوە بێیت و بە ئاگاییەوە رەفتار بكەیت. رێزگرتن ئەوەیە بتوانیت گوێ بگریت. بیانییەك نە داوای خۆشەویستی و نە هاوڕێیەتی دەكات، بەلام ئەو -چ ژن بێت، چ پیاو- دەیەوێت بە رێزەوە پێشوازیی لێ بكرێت. هاوڕێیەتی و خۆشەویستی دەتوانن، پاش ئەوەی خەلكی یەكتریان باشتر ناسی و نرخیان بۆ یەكتر دانا، بێن. بەلام لە دەستپێكدا نابێت هیچ راوبۆچوونێكی پێشتر بڕیاردراو هەبێت. بە مانایەكی تر: نابێت دیدو تێڕوانینی پێشوەخت و بڕیار لەسەردراو هەبێت. بەلام رەگەزپەرستی لەسەر ئەو كلێشانە گەشە دەكات و پەرە دەستێنێت كە خەلكی دیكەو كولتوورەكەیان چۆنن. نموونەی چەند تێڕوانینێكی گشتگرانەی بێ بنجوبنەوانت بۆ دەهێنمەوە: سكۆتلاندی و سمۆلێنییەكان(6) رژدو چكوسن، بەلچیكیەكان زۆر فێلباز نین، قەرەچەكان دزن، خەلكی ئاسیا سرقایمن و هەروەها شتی لەو چەشنە. هەموو شتە گشتگرە سەپێنراوەكان دەبەنگن و زەمینە بۆ هەلەو چەوتیی نوێ خۆش دەكەن. هەربۆیەشە هەرگیز بۆمان نییە بڵێین: "عەرەبەكان واو و وان"، "فرانسییەكان وان و وا نین" و هەروەها. رەگەزپەرستێك حالەتێكی تایبەت بە هەموو حالەتێكی دیكە دەگرێت. ئەگەر عەرەبێك دزیی لێ بكات، دەگاتە ئەو دەرئەنجامەی كە گشت عەرەبان دزن. رێزگرتنی ئەوی دیكە، بە بەتنگەوەهاتن و لەسەركردنەوەی یەكسانییە.

*-بەلام مرۆڤ دەتوانێت چیرۆك لە بارەی بەلچیكی و نەرویژییەكانەوە بگێڕێتەوە. بەبێ ئەوەی لە سۆنگەی ئەو چیرۆكانەوە بشبێت بە رەگەزپەرست!*

-بۆ ئەوەی گالتەوگەپ بە كەسانی دیكە بكەیت، ناچاریت كە بە خۆشت پێ بكەنیت. ئەگینا مرۆڤ ئەو كاتە بۆ خۆی خودانی هیچ گالتەوگەپێك نییە. گالتەوگەپ یەكسانە بەهێز.

*-ئەرێ بە راست گالتەوگەپ چییە، وەكوو پێكەنین وایە؟*

-کە دەرۆستی گاڵتەوگەپ بێت و کەیف و خۆشیی لێ وەربگریت، وەکوو ئەوەیە کە بتوانیت گاڵتەو شۆخی بکەیت و خۆشت لە بەرانبەریدا نەرمونشل بکەیت و زۆر بە جددی وەرینەگریت. لە هەموو حاڵێکدا ئەوەیە کە ئەوە بهێنیتە پێشەوە، کە کەسێك وا لێ بکات بخەنێت و پێ بکەنێت. شاعیرێك وتویەتی: "گاڵتەو گەپ سەرلێشێوانێکی ئاغرانەیە".

*-ئایا رەگەزپەرستان هیچ میزاجێکیان هەیە، یام کەیف و خۆشی لە گاڵتەوگەپ وەرئەگرن؟*

-لێرەدا جێگۆرکێت بە وشەکان کرد، چونکە لە کۆندا "میزاج" ئەو وشەیە بوو کە خەڵك بۆ باسکردنی گاڵتەوگەپ بەکاریان دەهێنا. نا، رەگەزپەرستان هیچ هەستونەستێکیان لە ئاست گاڵتەوگەپدا نییە، هێندەی پێوەندیی بە میزاجیشیانەوە بێت، زۆربەی جاران، بەدخواست و بەدکارانەیە. ئەوان بە هەست و نەستێکی بەدکارانەوە بە خەڵکی دیکە پێ دەکەنن و پەنجە بۆ کەموکوڕییەکانیان رادەکێشن، وەکوو ئەوەی بۆ خۆیان هیچ کەموکووڕییەکیان نەبێت و بێ غەلوغەش بن. کاتێك رەگەزپەرستێك پێ دەکەنێت، بۆ ئەوەیە وا نیشان بدات کە لەو بڕوایەدایە ئەو باشترینە، بەلام ئەوەی لە راستیدا نیشانی دەدات ئەوەیە، کە چەند کەم دەزانێت، چەند کەرۆکەیە و چەند خوازیاری ئازاردان و خراپەکردنە بەرانبەر خەڵکانی دیکە. کە لە بارەی خەڵکەوە دەپەیڤێت، وشەی ناحەزو نزێو بەکاردەهێنێت، سووکایەتییان پێ دەکات، بیانییان بە (سەررەش)، (قوللەرەش)، (بلاتە)(7) و شتی دیکەی لەو چەشنە ناودەبات.

*-ئەی ئەوەی کەرۆکەو دەبەنگە رەگەزپەرستە؟*

-نەء، بەلام ئەوەی رەگەزپەرستە دەبەنگ و کەرۆکەیە.

*-ئەگەر باش لە یەکتر حاڵی بووبین، رەگەزپەرستی لەسەر: 1-ترس، 2-نەفامیو 3-دەبەنگی، هەڵچنراوەو لەوانەوە سەرچاوە دەگرێت.*

-بێ کەم و زیاد. بەلام دەبێت ئەوەش بزانیت کە مرۆڤ دەتوانێت زانیاری و شارەزایی هەبێت و زانستەکەشی بۆ بە رەواناساندنی رەگەزپەرستیش بەکاربهێنێت. مرۆڤ دەتوانێت زیرەکیی خۆی بۆ نیازو مەرامی خراپیش بەکاربهێنێت، لەبەرئەوە هێندە سادەو ساکار نییە.

*-ئەی چۆن؟*

-ئەوەش روو دەدات کە خەڵك، ئەگەرچی بە شێوەیەکی دروست پەروەردە کراون و خوێندەواریشیان هەیە تووشی بەدبەختییەك دەبن - بۆ نموونە: بێکار دەبن- و هۆی ئەو بێکارییەش دەدەنە پاڵ بیانییان. ئەوان لە ناخەوە دەزانن کە ئەوە گوناهی بیانییان نییە، بەلام دەبێت رق و کینەی خۆیان ئاراستەی کەسێك بکەن. ئاراستەی کەسێك کە خەڵکی بە (قوربانی) ناوی دەبەن.

*-قوربانی چییە؟*

-لە کۆندا خەڵك لە ئیسرائیل تەگەیەکیان هەڵدەبژاردو گشت ئەو گوناهانەی لە ئەستۆ دەگرت کە خەڵکەکە بۆ خۆیان کردبوویان و بەرەڵای چۆڵ و بیابانیان دەکرد. کاتێك ئێمە دەمانەوێت کەسێکی دیکە بەرپرسێتیی هەڵەو چەوتییەکانی ئێمە لە ئەستۆ بگرێت، قوربانییەك هەڵدەبژێرین. کە ئێمە لە فرانسا لە قەیرانی ئابووریدابین، رەگەزپەرستەکان دەیانەوێت بیانییەکانی پێ گوناهبار بکەن و بیخەنە ئەستۆی ئەوان. رەگەزپەرستان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە پەناهێنەکان هەم کارو هەم بژێوی فرانسییەکان زەوت دەکەن. هەربۆیە بەرەی نەتەوەیی، کە پارتییەکی رەگەزپەرستە، فرانسای پڕ کردبوو لەو بەیداخانەی کە لەسەریان نووسرابوو:

"سێ ملیۆن بێکار یەکسانە بە سێ ملیۆن پەنابەری نەخوازراو". ئەوەش بزانە، پێنج یەکی فەرەنسییەکان لە بنوبنەچەدا بیانین.

*-بەڵام بێکاری تووشی پەنابەرەکانیش دەبێت! باوکی سوعادی ئامۆزای دایکم، ئەوە بۆ دوو ساڵیش دەچێت بێکارە. ئەو بەدوای کاردا دەگەڕێت و بەڵام هیچ کارێک نابینێتەوە. هەندێ جار کە بە تەلەفۆن لە کارێک دەگەڕێت، هەموو شتێک بۆ داواکردنی ئەو کارە بۆی لەبارو ئاساییە، بەڵام کە دەچێت بۆ جێگای کارەکە پێی دەڵێن: "بەداخەوە، درەنگ پێی ڕاگەیشتی!"*

-بێگومان وایە. بەڵام ڕەگەزپەرستان درۆ دەکەن. هەرچییەکیان بەدەمدا بێت دەیڵێن و هیچ گرنگییش بەوە نادەن چی ڕاست و چی درۆیە. ئەوەی ئەوان دەیانەوێت ئەوەیە، ئەندێشەی خەڵکی بەجنێو و قسەی پڕووپووچ پڕ بکەن. تۆژینەوەی ئابووری دەریخستووە ئەو هاوکێشەیەی کە "سێ ملیۆن بێکار یەکسانە بە سێ ملیۆن پەنابەری نەخوازراو". هەڵەیەکی بێ سەروبەرەو هیچی تر. بەڵام کەسێک کە لەبەر بێکاری تووشی بەدبەختی بووە، بڕوا بە هەر دەبەنگییەک دەکات، کە نەختێک هێوری بکاتەوە.

*-بەڵام هەڵکوتانە سەر پەنابەرانیش هیچ کارێکی بۆ مەیسەر ناکات!*

-بێگومان نا! بەڵام ئا لێرەدا جارێکی دیکەش ترس لە بیانییان دەبینینەوە، کە ناچارە گوناهی چەوتوچەوێڵیی هەر شتێک لە ئەستۆ بگرێت. زۆر لەوەش ئاسانترە. ڕەگەزپەرست ئەو کەسەیە کە خەڵکی تر گوناهبار دەکات.

*-خەڵکی تر گوناهبار دەکات؟*

-نموونەیەکت بۆ دەهێنمەوە: قوتابییەک کە لە بنەچەدا خەڵکی وڵاتێکی دیکەیە، نمرەی خراپ لە دەرسەکانیدا وەردەگرێت. لە باتی ئەوەی گوناهی کەمتەرخەمیی خۆی بخاتە ملی خۆی و دان بەوەدا بنێت کە تەمبەڵ بووە، دەڵێت کە مامۆستاکەی ڕەگەزپەرستەو هەر لەبەرئەوەش نمرەکانی ئەم خراپن.

*-(نادیا)ی ئامۆزام وا دەکات. لە لایەن قوتابخانەوە لە خراپیی ڕەفتارەکانی ئاگادار کرایەوە، کەچی بە دایکو باوکی خۆی وت کە مامۆستاکانیان حەزیان لە چارەی عەرەب نییە! زۆر بێشەرمە، چونکە من دەزانم کە ئەو خۆی لە دەرسەکانیدا خراپە.*

-کتومت مەبەستم لە گوناهبارکردنی خەڵکی تر ئەوەیە!

*-بەڵام (نادیا) ڕەگەزپەرست نییە..*

-ئەو بیانوویەکی پڕوپووچ دەهێنێتەوە بۆ ئەوەی خۆی لەو بەرپرسێتیە بدزێتەوە کە دەکەوێتە ئەستۆی، ڕەگەزپەرستەکانیش هەر بەو شێوەیە دەکەن.

*-کەواتە دەبێت گوناهبارکردنی خەڵکی دیکەش بخەینە سەر ترس، نەفامی و دەبەنگی.*

-بێ کەم و زیاد. من کە ئەمڕۆ دانیشتووم لە بارەی ئەوەوە کە مرۆڤ چۆن دەبێت بە ڕەگەزپەرست بۆ تۆ دەدوێم، دەمەوێت ئەوەت بۆ باس بکەم کە ڕەگەزپەرستی هەندێ جار پەنا دەباتە بەر دەربڕینی تراژیدیایی. ئەوکاتیش چیتر باس لە بەدگومانی و حەسوودی نییە بەرانبەر خەڵکانێک کە سەر بە گرۆیەکی دیاریکراون. جارێک لە جاران میللەتێک هەبوو کە بەدەست قڕکردن و ڕەگەزپەرستییەوە دەیناڵاند.

*-قڕکردن یانی چی؟ زایەڵەیەکی ناخۆشی هەیە!*

-قڕکردن ئەوەیە کاتێک مرۆڤ سەرلەبەری کۆمەڵگایەک، یان گرۆیەک، لە نێو دەبات.

*-چۆن؟ هەموویان دەکوژن؟*

-هەر ئەوەش بوو کە لە سەروبەندی جەنگی دووەمی جیهاندا رووی دا، کاتێك هیتلەر، رێبەری ئەڵمانیای نازیست، بڕیاری دا کە جوولەکە و قەرەچەکانی گشت دنیا لەناو ببرێن و قڕ بکرێن - هیتلەر عەرەبەکانی بە "رەگەزێکی دواکەوتووتر لە بۆق دادەنا!"- بەختیش بۆی یار بوو و توانیی پێنج ملیۆن جوولەکە بەگاز بخنکێنێت. هەموو ئەمانەش لە تیۆرییەکی رەگەزپەرستانەوە سەرچاوەی گرتبوو کە دەیوت "جوولەکەکان سەر بە رەگەزێکی (ناپاك)ن و نزمترن لە رەگەزەکانی تر، هەر لەبەر ئەوەش هیچ مافێکی ژیانیان نییەو، دەبێت قڕ بکرێن، کەواتە: دەبێت دواکەسیان لەناو ببرێت". هەربۆیە حکومەتەکانی ئەورووپا ناچار کران، کە جوولەکەی وڵاتەکانیان ناونووس بکەن و رەوانەی لای نازیستەکانیان بکەن. نازیستەکانیش ناچار بوون ئەستێرەیەکی زەرد بە سنگیانەوە هەڵواسن، بۆ ئەوەی خەڵك بیانناسنەوە. ئەم جۆرە لە رەگەزپەرستی بە (ئەنتی سێمیتیسم) ناو دەبرێت.

*-ئەو وشەیە لە کوێوە دێت؟*

-لە وشەی (سێمیت)ەوە دێت و ئەو گرۆیانە دەگرێتەوە کە لە خۆرهەڵاتی ناوینەوە دێن و زمانانێك دەپەیڤن کە خزمایەتییان لەگەڵ یەکتردا هەیە، وەکوو زمانی عیبری و عەرەبی. جوولەکەو عەرەبیش لە (سێمیت)ەکانن.

*-کەواتە ئەوەی (ئەنتی سێمیت)ە، (ئەنتی عەرەب)یشە؟*

-کاتێك مرۆڤ لە بارەی (ئەنتیسێمیتیسم)ەوە دەدوێت، زۆربەی جاران، مەبەستی لە رەگەزپەرستی دژ بە جوولەکەکانە. ئەمە جۆرێکی تایبەتە لە رەگەزپەرستیو زۆر خوێنساردانە بیری لێکرایەوە و پلانی بۆ دارێژرا لە پێناوی قڕکردن و لەناوبردنی گشت جوولەکەکاندا. بۆ ئەوەش راستەوخۆتر بەرسڤی پرسیارەکەت بدەمەوە، دەمەوێت بڵێم: ئەوەی دژی جوولەکەیە، دژی عەرەبیشە. بەهەمەحاڵ، رەگەزپەرست ئەو کەسەیە کە حەز لە کەسانی تر ناکات، ئەوجا ئەو کەسانە جوو بن، عەرەب بن یان رەشپێست.. ئەگەر هیتلەر لە جەنگدا سەرکەوتنی بەدەست بهێنایە، پەلاماری گشت مرۆڤایەتیی دەدا، چونکە بەدڵنیاییەوە هیچ رەگەزێکی خالیس و "پاك" لە ئارادا نییە. ئەوەش زۆر نالەبارو مەحاڵ دەبوو. هەر بۆیەشە پێویستە هەمیشە لەسەرخۆو بەئاگا بین.

*-ئەی جوولەکەیەك دەتوانێت ببێت بە رەگەزپەرست؟*

-جوولەکەیەکیش، کتومت وەکوو عەرەبێك، دەتوانێت ببێت بە رەگەزپەرست، هەروەکوو چۆن ئەرمەنییەك، قەرەچێك یان رەشپێستێك دەتوانێت ببێت بە رەگەزپەرست.. هیچ گرۆیەکی مرۆڤی نییە، کە کەسانی وای لە خۆ نەگرتبێت، کە چ لە بیرکردنەوەو چ لە مامەڵەو رەفتاردا نەتوانن رەگەزپەرستانە هەڵسوکەوت بکەن.

*-ئەگەرچی مرۆڤ بۆ خۆیشی رووبەڕووی رەفتاری رەگەزپەرستانە بکرێتەوە؟*

-مرۆڤێك کە بەخۆی تووشی بێدادی بووە، بە هیچ کلۆجێك مانای ئەوە نییە، ئەو مرۆڤە بۆ خۆی دادوەرە. بە نیسبەت رەگەزپەرستیشەوە هەر وایە. مرۆڤێك کە بۆ خۆی بووە بە قوربانیی رەگەزپەرستی، دەکرێت بۆ خۆیشی، لە هەندێ حاڵەتدا، ببێت بە رەگەزپەرست.

*-باسی بە کۆمەڵکوشتنم بۆ بکە.*

-بە کۆمەڵکوشتن ئەوەیە کە بە شێوەیەکی پلانبۆڕێژراو و لەسەر شێوازێکی تایبەت گرۆیەکی کەمایەتی قڕ بکەیت. کەسێکی خوێنخوارو شێتوویێت، بڕیار دەدات، خوێنساردانەو، بە هەر کەرەسەیەك کە دەستی پێی رادەگات، گشت ئەو کەسانە بکوژێت کە

سەر بە گرۆیەکی مرۆڤی دیاریکراون. زۆربەی جارانیش، کەمایەتییەکی (ئێتنیکی)ن کە دەبن بە نیشانە بۆ ئەم جۆرە بڕیارە.

*-وشەیەکی دیکەش کە لێی تێ ناگەم، ئێتنیکی چییە؟*

-گرۆیەکی ئێتنیکی ئەو گرۆیەیە کە لە زمان، خوو و نەریت، رەفتارو هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتی و کولتووردا هاوبەشن و ئەو هاوبەشییەی خۆیان لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر بەجێ دەهێڵن. واتە: گەلێك کە پێکڕا هەمان ناسنامەیان هەیە. ئەو مرۆڤانەش کە سەر بەو گرۆیەن دەکرێت بە زۆر لە وڵاتاندا بڵاوبووبنەوە.

*-چەند نموونەیەك بهێنەرەوە.*

-جووەکان، بەربەرەکان، ئەرمەنییەکان، قەرەچەکان، کالدییەکانی بابل: ئەوانەی زمانی ئارامی- زمانی دایکی مەسیح- دەپەیڤن و هەروەها.

*-ئەی ئەگەر ئەندامەکانی گرۆیەك زۆر نەبن، ئایا ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە دووچاری مەترسیی بە کۆمەڵکوشتن ببنەوە؟*

-مێژوو فێرمان دەکات کە کەمایەتییەکان -واتە: ئەوانەی کە ژمارەیان زۆر نییە- زۆربەی جاران راونراون. ئەگەر چاوێك بە چەرخی هەژدەدا بگێڕین، دەبینین کە ئەرمەنییەکان بە کۆمەڵ لەلایەن تورکانەوە، لە ساڵی **1915**دا، کوژران و رەدوونران - ملیۆنێکیان لێ کوژرا، کە بۆخۆیان میللەتێکی ملیۆنێك و هەشتسەد هەزار کەسین-. پاشان نۆرە هاتە سەر جووەکان، ئەو جوولەکانەی بە کۆمەڵ لە رووسیاو پۆلۆنیا کوژران -ئەم جۆرە بە کۆمەڵکوشتنەیان بە (پرۆگرام)(*8*) ناودەبرێت-. هەر یەکسەر دوای ئەوەش پێنج ملیۆن جوولەکە لە لایەن نازیستەکانەوە، لە ئۆردوگاکانی قڕکردنەدا، لە ئەورووپا، کوژران. زۆر دوور نەڕۆین هەر ساڵی **1933** لە ئەڵمانیا، جوولەکەکان وەکوو "رەگەزێکی بێنرختر"، "رەگەزێکی بندەست" سەیر دەکران، کتومت وەکوو ئەوەی کە تەماشای قەرەچەکانیش وەکوو رەگەزێکی "نزم و نەوی و بێبەها" دەکراو چەندینیان لێ کوژرا -دوو سەد هەزار کەس-.

*-بەڵام ئەمە دەمێکە رووی داوە، ئەی ئێستا چی؟*

-کوشتاری کەمەنەتەوەکان تا ئێستاش هەر لە گۆڕێدایە. هەر دوور نەڕۆین، ساڵی **1995**، (سربی)یەکان بەناوی "پاککردنەوەی ئێتنیکی"یەوە بە هەزاران موسوڵمانی (بۆسنیا)یان کوشت.

لە (رواندا)ش (هووتوو)ەکان کوشتاری (تووتسی)یەکانیان کرد -ئەو تووتسییانەی کە کەمایەتین و لە لایەن ئەورووپاییەکانەوە پشتیان گیرا بۆ ئەوەی لەگەڵ هووتووەکاندا بجەنگن-. هەردووکیان، هووتووەکان و تووتسییەکان، دوو گرۆن کە هەر لەو کاتەوەی بەلچیکییەکان ناوچەکانی دەورووبەری زەریاچەکانی ئەو وڵاتەیان کۆلۆنی کردبوو، لەگەڵ یەکتردا دەجەنگان. کۆلۆنیالیزم، کە پاشان دەگەڕێینەوە سەری، زۆربەی جاران میللەتانی پەرت پەرت کردووە بۆ ئەوەی بیانخاتە ژێر رکێف و دەستەڵاتی خۆیەوە. کوشتاری بە کۆمەڵ و خەموخەفەت دوو شتن، کە ئێمە بە ناچاری لەم چەرخەدا خۆمان داوە بە دەستیانەوە.

*-ئەی لە مەغریب، ئایا جوولەکە لەوێش هەن؟ ئەوەیان دەزانم کە لەوێ بەربەر هەن، چونکە دایکم بۆ خۆی بەربەرە.*

-لە مەغریب، جوولەکە و موسوڵمانان، لە هەزاران ساڵەوە پێکەوە ژیاون. جووەکان گەڕەکی تایبەت بە خۆیان هەبوو، کە بە "مێلاح" ناودەبرێت. ئەوان قەت تێکەڵ بە موسوڵمانان نەدەبوون، بەڵام هەرگیز شەڕیشیان لەگەڵدا نەدەکردن. موسوڵمان و جووەکان نەختێك لە بەرانبەر یەکدیدا درێژنگ بوون، بەڵام هەمیشەش بە چاوی رێزەوە لە یەکتریان

دەپوانی. گرنگترین شت ئەوەیە، کاتێك جوولەکەکان لە ئەورووپا بە کۆمەڵ قڕ دەکران، لە مەغریب پارێزگارییان لێ کرا. کاتێك ئەڵمانیا فرانسای داگیرکرد، پاشای مەغریب -محەمەدی پێنجەم- بەرپەرچی ئەو داوایەی دایەوە کە لە لایەن سوپاسالاری فرانسا (پێتێن)ەوە(9) لێی کرابوو، کە جوولەکەکانی مەغریب رەوانەی "ئۆردووگاکانی قڕکردن"ی نازیستەکان بکرێن، بە مانایەکی دیکە: رەوانەی دۆزەخ بکرێن. پاشای مەغریب پارێزگاری لێ کردن و بەرسڤی (پێتێن)ی دایەوە: "ئەوانە دەستوپێوەندی خۆمن، هاووڵاتی مەغریبن، ئێرە بە ماڵی خۆیان دەزانن، لێرەدا بە دڵنیاییو بێ ترس دەژین. من بەرپرسی پاراستنی ئەوانم". جوولەکەکانی مەغریب، کە ئێستاکە بە گشت دنیادا بڵاوبوونەتەوە، بەچاوی ڕێزو پێزانینەوە لەو پاشایە دەڕوانن. ئێستا چەند هەزار جوولەکەیەك لە مەغریب ماونەتەوە، ئەوانەش کە مەغریبیان بەجێهێشت، بەخۆشحاڵییەوە، دەگەڕێنەوە. مەغریب ئەو وڵاتە عەرەبییە موسوڵمانەیە کە زۆرترین ژمارەی جوولەکە تێیدا دەژی. دەزانی جوولەکەکانی مەغریب، شاری (سەفرو) بەچی ناودەبەن، ئەو شارەی دەکەوێتە خوارووی (فاس)ەوە؟ ئەوان پێی دەڵێن "قودسی بچووك".

*-ئەی بۆ مەغریبیان بەجێهێشت؟*

-کە مەغریب ساڵی ***1956*** سەربەخۆیی بەدەست هێنا، پشێوی دایگرتن، چونکە نادڵنیا بوون لەوەی چی روودەدات و چی چاوەڕێیان دەکات. ئەو جوولەکانەش کە ئەوسا لە ئیسرائیل نیشتەجێ بووبوون، هانیان دەدان مەغریب بەجێبهێڵن و بگەڕێنەوە لای ئەوان. پاشان جەنگی ***1967*** و پاش ئەویش جەنگی ***1973*** لە نێوان ئیسرائیل و وڵاتە عەرەبییەکاندا بەرپا بوو. ئەوجا بڕیاریان دا زێدەکەی خۆیان بەجێ بهێڵن و روو بکەنە، یان ئیسرائیل یان ئەورووپاو ئەمریکای ژوورو، بەڵام موسوڵمانەکانی مەغریب ئەوەیان پێ ناخۆش بوو، کە جوولەکەکان مەغریب چۆڵ دەکەن، چونکە ئەوان بەهەزاران ساڵ لەتەك جوولەکەکاندا لەم وڵاتەدا ژیابوون. چەندین گۆرانی و شیعر هەن کە لەلایەن جوولەکەو موسوڵمانەکانەوە بە عەرەبی نووسراون. ئەوانە بەڵگەیەکن بۆ ئەوەی کە ئەو دوو گرۆیە بە باشی لەگەڵ یەکتردا گونجابوون و رێك دەکەوتن.

*-کەواتە مەغریبییەکان رەگەزپەرست نین؟*

-بانگەشەی شتێکی لەو جۆرە هیچ مانایەکی نییە. هیچ میللەتێك نییە، کە ئەندامەکانی پێکڕا، رەگەزپەرست بن. مەغریبییەکانیش هەروەکوو میللەتانی دیکەن. لەنێو ئەوانیشدا، هەروەکو چۆن لەنێو گشت میللەتانی دیکەدا، مرۆڤی رەگەزپەرست هەن و مرۆڤیش هەن کە رەگەزپەرست نین.

*-ئەی حەزیان لە بیانییانە؟*

-مەغریبییەکان بە خۆشحاڵییەوە میوانداری دەکەن و نان لە بەردەم بیانییان دادەنێن، کتومت وەکوو گشت کەسێکی دیکە لە مەغریب، یان عەرەبەکانی بیابان و رەوەندەکان و ئەوانی دیکە. بەڵام هەندێکیش هەن کە بەو شێوە جوانە هەڵسوکەوت ناکەن، بەتایبەت لەگەڵ رەشپێستەکاندا.

*-بۆ بەتایبەت لەگەڵ رەشپێستەکاندا؟*

-چونکە زۆر لە کۆنڕا، ئەو کاتەی بازرگانەکانی مەغریب بە ئاڵوگۆڕی کەلوپەلەوە خەریك بوون، بەرەو وڵاتانی دیکە، وەکوو سەنیگال، مالی، سوودان و گینیا گەشتیان دەکردو هەندێك لەوان ژنی پێستڕەشیان لێ دەخواستن و لەگەڵ خۆیان دەیانهێنانەوە. ئەو منداڵانەی لەو ژنانە بوون، زۆربەی جاران، لەلایەن ژنە پێستسپییەکانیان و منداڵەکانیانەوە، نائینسانانە، رەفتاریان لەگەڵ دەکرا. بۆ نموونە: مامی من دوو ژنی رەشپێستی

هەبوو-. من ئامۆزای رەشپێستیشم هەن- دێتەوە بیرم کە ئەوان لەگەڵ ئێمەدا نانیان نەدەخوارد. ئێمە خۆمان بەوە راهێنابوو ئەوان بە "عەبد" بانگ بکەین.

زۆر پێش مەغریبییەکانیش، ئەوروپاییەکان، کەسێك کە رەشپێست بووایە بە "حەیوانێکە بۆ خۆی، مەیموونێك" ناویان دەبردن، بۆ نموونە: (بوفۆن)(*10*)، کە تۆژەرەوەیەکی ئەوروپاییەو لە چەرخی هەژدەدا ژیاوە، ئەوەی سەرەوەی نووسیوە. ئەو، لەگەڵ ئەوەشدا کە خوێندەو شارەزا بوو و لەوەش زیاتری دەزانی، کەچی نووسیبووی: "قولەڕەشەکان بندەستن و پێویست بەوەش ناکات بەوەوە خەریك بین، کە ئەوان کۆیلەن". ئێستا کۆیلەیەتی لە نزیکەی سەرانسەری دنیادا نەماوە. بەڵام لە هەندێ جێگادا تا ئەمڕۆ بوونی هەیە، ئەگەرچی رەنگە هەمیشە لەبەرچاو و دیار نەبێت.

*-ئەمە وەکوو ئەوە کە لەو فیلمە ئەمریکاییەدایە، کە خاوەن ماڵە سپیەکە، بە قامچی لە رەشپێستەکان دەدات..*

-رەشپێستەکانی ئەمریکا نەوەی ئەو کۆیلانەن، کە لەلایەن دەستەی یەکەمی پەناهێنەرەکانەوە بۆ ئەمریکا، لە ئەفریقاوە هێنابوویانن. کۆیلەیەتی لە خاوەندارێتی تایبەتەوە دەکەوێتەوە، کە بەسەر مرۆڤدا دەسەپێنرێت و پەیڕەو دەکرێت. ئەوکاتەش کۆیلە بەتەواوی هەموو سەربەستییەکی لێ زەوت دەکرێت، چ وەکوو لەش چ وەکوو رۆحیش دەبێتە موڵکی ئەو کەسە کە کڕیویەتی. رەگەزپەرستی دژ بە رەشپێستەکان هەمیشە و تا ئێستاش لە ئەمریکا ناحەزانە پەیڕەو دەکرێت. رەشپێستەکان خەباتی یەکجار زۆریان کردووە بۆ ئەوەی هەندێك مافی رەوای خۆیان بەدەست بهێنن. جاران لە هەندێ لە هەرێمەکانی ئەمریکا وابوو کە رەشپێستەکان بۆیان نەبوو لە هەمان جەوزدا لەگەڵ سپیپێستەکاندا مەلە بکەن، یان هەمان ئاودەست بەکاربهێنن کە سپیەکان بەکاریان دەهێنا، یان لە هەمان گۆڕستانی سپییەکان بنێژرێن، یان سواری پاسێك ببن و لە فێرگەیەك بخوێنن کە سپیەکان سواری دەبوون و لێیان دەخوێند. لە (لیتڵ رۆك)، کە شارێکی بچووکەو دەکەوێتە یەکێك لە هەرێمەکانی خوارووی ئەمریکا، ساڵی **1957**، سەرۆککۆمار (ئایزنهاوەر) و پۆلیس و سوپا ناچار بوون، بۆ ئەوەی نۆ منداڵ بتوانن لە فێرگەی (سەنتراڵ های سکوڵ)، کە فێرگەیەکی تایبەت بوو بە سپیپێستەکان، بخوێنن، دەست بخەنە نێو کاروباری ئەو هەرێمەوە.. خەبات لە پێناوی بەدەستهێنانی مافە رەواکانی رەشپێستاندا هێشتا کۆتایی نەهاتووە، سەرباری ئەوەش کە لە جەرگەی ئەو خەباتەدا، ساڵی **1968**، لە (ئەتلانتا)، (مارتین لۆتەر کینگ)(*11*) کوژرا. ئەمڕۆ هەندێك شت لە گۆڕاندان. وەکوو ئەوەی ئێستا لە خوارووی ئەفریقا روودەدات، لەوێ جاران سپیەکان و رەشپێستەکان هەر بە جیا لە یەکتری دەژیان. ئەوەیش بە (ئەپارتاید) ناو دەبرا. رەشپێستەکان، کە زۆرینەی خەڵکەکە بوون، لەلایەن کەمایەتیی سپییەوە، کە جڵەوی دەسەڵاتیان بە دەستەوە بوو، بە سووکتر و بێبەهاتر سەیر دەکران.

بەڵام هەروەها ئەوەش بزانە کە رەشپێستەکانیش وەکوو هەر کەسانێکی دیکەن و ئەوانیش دەتوانن لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە لە خۆیان ناچن، رەگەزپەرستانە، بجوولێنەوەو رەفتار بکەن. کە ئەوان زۆرجاران بوونەتە قوربانیی رەگەزپەرستی، رێ لەوە ناگرێت کە هەندێکیان رەگەزپەرستن.

*-پێش ئەختێك وتت کە کۆلۆنیالیزم میللەتان پەرت پەرت دەکات.. کۆلۆنیالیزم چییە، ئەویش هەر رەگەزپەرستییە؟*

-لە چەرخی نۆزدەدا وڵاتانی ئەوروپایی، وەکوو فرانسا، ئینگلستان، بەلجیکا، ئیتالیاو پورتوگال بە هێزی سوپایی خۆیان پەلاماری وڵاتانی تریان لە

ئەفریقاو ئاسیا دەدلو داگیریان دەکردن. کۆلۆنیالیزم بەزۆر خۆسەپاندن و بۆ خۆ زەوتکردنە. کۆلۆنیالیستێك پێی وایە، ئەو وەکوو سپی و شارستانی بەمافی رەوای خۆی دەزانێت کە "رەگەزە بندەستەکان بەرەو شارستانی بەرێت". ئەو لەو بروایەدایە، بۆ نموونە، کە ئەفریقاییەك، هەر لەبەرئەوەی رەشپێستە، هێندەی سپییەك زیرەك و لێهاتوو نییە، بە واتایەکی دیکە: لە رووی زیرەکییەوە کەمترە لە سپییەك.

*–کۆلۆنیالیست رەگەزپەرستە!*

–رەگەزپەرستەو خوازیاری بەدەستهێنانی دەسەڵاتیشە. کاتێك مرۆڤ لەلایەن وڵاتێکی دیکەوە بەڕێوە دەبرێت، ئازاد نییەو سەربەخۆیی خۆی لەدەست دەدات. بۆ نموونە: جەزائیر تا ساڵی ***1962***ش وەکوو بەشێك لە فرانسا سەیر دەکرا. خێرو بێری وڵاتەکە لەلایەن فرانسییەکانەوە بەکاردەهێنراو ئازادی لە هاووڵاتییانیش زەوت کرابوو. فرانسییەکان ساڵی ***1830*** هاتنە نێو خاکی جەزائیرو دەستیان بەسەر خاکەکەیدا گرت. ئەوانەی کە خوازیاری ئەو جۆرە بەڕێوەبردنەی وڵاتەکەیان نەبوون راو دەنران، لە زیندان توند دەکران و تەنانەت دەشکوژران. کۆلۆنیالیزم، رەگەزپەرستییەکە لە پلەی دەوڵەتدا.

*–چۆن وڵاتێك دەتوانێت ببێتە وڵاتێکی رەگەزپەرست؟*

–سەرلەبەری وڵاتێك نا، بەڵام ئەگەر حکومەتی ئەو وڵاتە، بەبێ گوێدانە مافی رەوای بەرانبەرەکەی، بڕیاریدا دەست بەسەر ناوچەیەکدا بگرێت کە هی میللەتێکی دیکەیە و بەزۆری زۆردارەکی دەسەڵاتی خۆی بەسەر ئەو ناوچەیەدا سەپاند، ئەوە لەبەرئەوەیە کە ئەو وڵاتە بە سووکی سەیری ئەو کەسانە دەکات کە لەو ناوچەیەدا دەژین و پێی وایە کولتوورەکەیان بێترخەو دەبێت، وەکوو خۆیان ناوی دەبەن، بەرەو شارستانییەت کێش بکرێن. زۆربەی جاران ئەو وڵاتە داگیرکراوە بەرەو پێش دەبرێت، رێگاوبانی تێدا دەکرێتەوە، خوێندنگەو خەستەخانەی تێدا بینا دەکرێت، هەندێ جار بۆ ئەوەیە ئەوە نیشان بدرێت کە داگیرکەران تەنیا لەبەر بەرژەوەندیی خۆیان روویان لەو خاکە نەکردووە، بەڵام هەمیشە بۆ مەبەستی بەدەستهێنانی دەستکەوتی زیاترە بۆ خۆیان. لە راستیدا کۆلۆنیالیست لەو بوارانەدا خاکێکی داگیرکراو بەرەو پێش دەبات، کە یارمەتیدەرو ئەدەرن بۆ ئەوەی بتوانێت تەواوی خێروبەرەکەتی ئەو خاکە بۆ خۆی بەکاربهێنێت. کۆلۆنیالیزم بەو شێوەیەیە. زۆربەی جاران بۆ ئەوەیە دەست بەسەر سەروەت و سامانی تازەدا بگرێت، بەڵام کۆلۆنیالیست خۆی قەت دەم لە ئاستی ئەوەدا ناکاتەوە و باسی ناکات. ئەوە داگیرکردنە، دزییەو هەلکوتانەسەرو پەلاماردانێکە کە هەندێ جار بۆ میللەتێك لە میللەتان دەرئەنجامی زۆر پڕ مەترسیی لێ دەکەوێتەوە. بۆ نموونە: لە جەزائیر بۆ دوایی‌پێهێنان بە دەسەڵاتی کۆلۆنیالیزم، چەندین ساڵ خەبات و بەرەنگاری و شەڕو شۆڕ پێویست بوو.

*–جەزائیر ئازادە..*

–ئا، جەزائیر لە ***1962***وە سەربەخۆیی بەدەست هێناوە، ئێستا جەزائیرییەکان خۆیان بڕیار دەدەن وڵاتەکەیان چی پێویستە..

*–لە 1830یەوە ب 1962، دەمێکی زۆر دوورو درێژە، سەدو سی ساڵ!*

–ژان ئەمرۆوچ، کە شاعیرێکی جەزائیرییە، ساڵی ***1958*** ئەم شیعرەی نووسیوە:

گشت شتێك لە جەزائیرییەکان زەوت کرا
وڵات و ناوی وڵاتەکەش
ئەو زمانەی پڕە لە وشەی یەزدانی و
ژیرانە لە بێشکەوە بۆ گۆڕ
رێنمایی مرۆڤ دەکات
خاك و خێروبێری خاك

سەرچاوەو گشت باخچەکانیان
نانی زارو نانی رۆح
-مەمووشتێکیان زەوت کرد-
(..)
جەزائیرییەکان دەرکران
لە هەرچییەك کە ناوی خاك و نیشتمان بوو
کران بە هەتیوو
کران بە زیندانی
لە سەردەمێکدا کە هیچ یادەوەری و داهاتوویەکی
نییە

-کۆلۆنیالیزم ئەوەیە، مرۆڤ پەلاماری ولاتێك دەدات، هەموو شتێك لە هاوولاتیانی ئەو ولاتە دەدزێت، ئەو کەسانە لە زیندان توند دەکات، کە نارەزایی لە دژی داگیرکردن دەردەبڕن و مرۆڤە توندوتۆڵ و بەکارەکانیش هەڵدەبژێردرێن و بۆ کارکردن رەوانەی ولاتە کۆلۆنیالەکە دەکرێن.

*-لەبەر ئەوەیە کە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی جەزائیر لە فرانسا دەژین؟*

-بەرلەوەی جەزائیر سەربەخۆیی بەدەست بهێنێت، وەکوو هەرێمێکی فرانسا تەماشا دەکرا، بەشێك بوو لە فرانسا. پاسپۆرتێك نەبوو تایبەت بە جەزائیرییەکان و وەکوو هاوولاتیی فرانسا سەیر دەکران. هەر لە سالی **1870**ەوە، گاورەکانی ئەو ولاتە بەچاوی هاوولاتی فرانسایی "راستەقینە"وە سەیر دەکران. جوولەکەکانیش هەروەها. بەلام موسولمانەکان بەخەلکی بە "رەچەلەك" جەزائیری سەیر دەکران. وشەی "رەچەلەك" بەو کەسە دەوترێت کە لە بنوبنەچەدا خەلکی ولاتێکی کۆلۆنیکراوە"، ئەمەش یەکێك لە دەستەواژە رەگەزپەرستانەکانی ئەو سەردەمەیە. "بەرەچەلەك" بەو کەسانە دەوترا کە سەر بە پلەی هەرە نزمی کۆمەلایەتی بوون. "بەرەچەلەك" یەکسان بوو بە بندەست و تەپەسەر. کاتێك سوپا، یان پیشەسازیی فرانسا، پێویستی بە خەلك بوو لە جەزائیرەوە دەیانهێنان. کەس لە راوبۆچوونی جەزائیرییەکانی نەدەپرسییەوە. مافی ئەوەیان نەبوو پاسپۆرتیان هەبێت. پسوولەی هاتوچۆی نێوخۆی ولاتیان دەدرایە، فەرمانیان بەسەردا دەکرا. ئەگەر سەرپێچیان بکردایە، دەگیران و سزا دەدران. ئەوانە دەستەی یەکەمی ئەو پەنامێنانە بوون، کە لە ولاتانی رۆژئاوای عەرەبستانەوە هاتن بۆ فرانسا.

*-بەرلەوەش پەنامێنەکان بە خەلکی فرانسا دەناسران؟*

-تا سالی **1958**یش ئەو کەسانەی کە لە جەزائیرەوە هێنرابوون، بۆیان نەبوو خۆیان بە خەلکی فرانسا ناو ببەن، یان ببن بە هاوولاتیی فرانسا، بە پێچەوانەی ئەو کەسانەوە کە لە مەغریب و توونسەوە دەهێنران. هەندێکی تر لە پەنامێنەران، وەکوو پورتوگالیەکان، ئیسپانییەکان، ئیتالییەکان و پۆلۆنیاییەکان بەخۆیان هاتن.

*-خۆ فرانساش وەکوو ئەمریکایە!*

-نا، هەموو ئەمریکاییەکان، بێجگە لە هیندە سوورەکان، کە هاوولاتییە ئەسلییەکانی ئەو کیشوەرەن، لە بنەچەدا پەنامێنن. لە سەرەتادا ئیسپانییەکان و پاشان ئەمریکاییە سپییەکان، زۆربەی هیندە سوورەکانیان لەناوبرد. کە (کریستۆفەر کۆلۆمبۆس) ئەو "دنیا نوێ"یەی دۆزییەوە، لەلایەن هیندەکانەوە پێشوازیی لێ کرا. ئەو زۆر سەری لەوە سوور مابوو کە ئەوانیش وەکوو میللەتانی دیکە، وەکوو ئەوروپاییەکان، رەفتاریان دەکرد. چونکە لەو سەردەمەدا، لە نواندواییەکانی چەرخی پانزەدا، زۆر کەس لە ئەوروپا بیرو مێشکیان بەوەوە خەریك بوو کە ئاخۆ هیندە سوورەکانیش - یان هیندییەکان، بەپێی وتەی کۆلۆمبووس، چونکە ئەو پێی وابوو ئەوانە هیندین- رۆحیان هەیە!

خەلکی پێیان وابوو کە ئەوان لە گیانلەبەرانەوە نزیکترن وەکوو لە مرۆڤ!

ئەمریکا لە چەندین گرۆی ئێتنیکی پێک هاتووە، لە چەندین جۆر نەتەوەی جیاجیا کە لە سەرانسەری جیهانەوە روویان لەو وڵاتە کردووە، بەڵام فرانسا لە دواداییەکانی چەرخی نۆزدەیەمینەوە بووە بە وڵاتی پەنابەران.

*—ئەی باشە بەر لەوەی پەنابەران بێنە فرانسا هیچ جۆرە رەگەزپەرستییەک هەبوو؟*

—رەگەزپەرستی لەهەر جێیەک مرۆڤ تێیدا بژی هەیە. هیچ وڵاتێک لە ئارادا نییە، کە بتوانێت بانگەشەی ئەوە بکات لە سنووری قەڵەمڕەوەکەیدا جۆرێک لە رەگەزپەرستی نەبێت. رەگەزپەرستی بەشێکە لە مێژووی مرۆڤ. وەکوو نەخۆشییەک وایە. مرۆڤ دەبێت ئەوە بزانێت و دەبێت خۆی فێری ئەوە بکات بەرپەرچی بداتەوەو لەنێوی بەرێت. ئێمە دەبێت دان بەخۆدا بگرین و خۆمان بەوە رازی بکەین کە "ئەگەر من لە بیانییەک بترسێم ئەوا ئەویش لە من دەترسێت و سڵ دەکاتەوە". ئێمە هەمیشە لەبەر یەکێکی دیکەدا بیانین. خۆفێرکردن بۆ ئەوەی پێکەوە بژین، وەکوو ئەوەیە لە دژی رەگەزپەرستی بجەنگیت.

—من هیچ حەز لەوە ناکەم خۆم فێر بکەم لەگەڵ (سێلین)دا بژیم، چونکە ئەو بەدکارە، شت دەدزێت و درۆیش دەکات..

—سەیرکە، ئێستا تۆش زێدەڕۆیی دەکەیت، ئەوە بۆ تەنیا کچێک کە لە تەمەنی تۆدایە زۆر زۆرە.

*—ئەو بەرانبەر عەبدو بێئەقڵ بوو. نایەوێت لە پۆلدا لە تەنیشت عەبدووەوە دانیشێت و قسەی خراپیش لەسەر رەشپێستەکان دەکات.*

—دایکو باوکی (سێلێن) ئەوەیان لەبیرچووە پەروەردەی بکەن. رەنگە ئەوان بۆ خۆیشیان بە باشی پەروەردە نەکرابن. بەڵام تۆ نابێت ئەو چۆنە لەگەڵ عەبدودا تۆیش لەگەڵ ئەودا وا بیت. دەبێت قسەی لەگەڵدا بکەیت، تێی بگەیەنیت کە ئەو بۆ بەهەڵەدا چووە.

*—قەت بە تەنیا ناتوانم ئەوە بکەم.*

—داوا لە مامۆستاکەت بکە لە پۆلدا باسی ئەو بابەتە بکەن. ئەوە بزانە کە مرۆڤ لەگەڵ منداڵاندا دەتوانێت شتێ بە شتێ بکات و چەوتوچەوێڵییەکان راست بکاتەوە. لەگەڵ گەورەکاندا زۆر زەحمەتترە.

*—بۆچی؟*

—چونکە هیچ منداڵێک بە رەگەزپەرستی لە دایک نابێت. زۆربەی جاران ئەوەیە کە منداڵێک ئەوە دەڵێتەوە کە لە دایك وباوکەوە، لە کەسوکارەوە، یان لە کەسانێکەوە کە لە دەوروبەریدا دەژین، بەر گوێی کەوتووە. بۆ منداڵێک زۆر ئاساییە لەگەڵ منداڵانی تردا یاری بکات. منداڵێک لەوە ناپرسێتەوە کە منداڵێکی تر رەنگی پێستی وەکوو رەنگی پێستی ئەو نییە، گوێ بەوە نادات لە خۆی بەنرختر یان بێنرخترە. بۆ منداڵێك، منداڵەکەی دیکە، بەر لەهەر شتێك، کەسێکە کە دەتوانێت یاریی لەگەڵدا بکات. رەنگە لەگەڵ یەکدیدا بگونجێن و رەنگە نەختێکیش شەڕ بکەن. ئەمەش هیچ سەیر نییە. هیچ پێوەندییەکی بە رەنگی پێستەوە نییە. بەڵام ئەگەر دایکوباوکی منداڵەکە پێی بڵێن کە خۆی تارو دوورە پەرێز بگرێت لە منداڵانی رەشپێست، ئەوسا ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی منداڵەکە لە ئاست رەشپێستەکاندا بەجۆرێکی جیاواز هەڵسوکەوت بکات.

*—بەڵام بابە، تۆ لە قسەکانتدا هەمیشە دەڵێیت رەگەزپەرستی لە هەموو جێیەک هەیەو بەشێکە لە کەموکورییەکانی هەر مرۆڤێکیش!*

—راستە، بەڵام مرۆڤ دەبێت منداڵان فێری کاری چاکە بکات، بۆ ئەوەی فێری ئەوە نەبن هەر ئەو

کارانە بکەن کە خۆیان بەدروستی دەزانن. هەروەها مرۆڤ دەتوانێت منالان فێری ئەوە بکات، کە چ شتێك خراپ و دزێوە. ئەمەش زۆر پێوەندی بەوەوە هەیە دایکوباوکان خۆیان چۆن بیر دەکەنەوەو چۆن گۆش کراون. رەنگە منالێك ناچار بێت بۆ دایکوباوکی خۆی راست بکاتەوە، کاتێك کە هەڵسەنگاندنی رەگەزپەرستانەیان بەرانبەر کەسێك یان شتێك بەدەمدا دێت. مرۆڤ نابێت دوودڵ بێت، یان بترسێت، لەوەی لە حاڵەتی وادا خۆ لە کاروباری گەورەکان هەڵقورتێنێت، هەر لەبەرئەوەی گەورەن.

–مەبەست لەمە چییە؟ مرۆڤ دەتوانێت منالێك لە رەگەزپەرستی قوتار بکات، بەڵام ناتوانێت گەورەیەك..

–بەڵێ، بۆ منالان ئاسانترە، یاسایەك هەیە کە رێنوێنی هەر مرۆڤێك دەکات لەو کاتەوە کە ئیتر پێ دەگات و گەورە دەبێت: نەگۆڕان! فەیلەسووفێك، کە ناوی (سپینۆزا) بوو، زۆر بەر لە ئێستا وتوویەتی: "هەموو مرۆڤێك لە هەوڵی ئەوەدایە، رۆژێك لە رۆژان، ببێت بەخۆی". رۆژانە خەڵکیش دەڵێن: "ئەوەی فێری بوویت بە شیری، بۆت تەرك ناکرێت بە پیری!" بە واتایەکی دیکە: مرۆڤ کە جارێك بوو بەوەی هەیە، هەر ئەوەیش دەمێنێتەوە. بەڵام منالێك هێشتا نەرموشلە، هێشتا کراوەیە و دەتوانێت فێر بێت، هێشتا دەتوانێت ببێت بە کەسێك. گرانە گەورەیەك کە بڕوای بە "نابەرابەریی نێوان رەگەزەکان هەیە" بهێنیتە سەر رێیەکی دیکە. کەچی منال دەتوانێت خۆی بگۆڕێت. هەر بۆیەشە قوتابخانە هەیە، بۆ ئەوەی منالان فێر بکات کە مرۆڤ بە بەرابەری لەدایك دەبێت و بە بەرابەریش دەمێنێتەوە، بەڵام لە یەکتری جیاوازن، بۆ ئەوەی منالان فێر بکات کە هەمەجۆری و فرەچەشنیی مرۆڤەکان سەروەت و سامانێکە، نەك پەککەوتەیی.

*–ئایا مرۆڤ دەتوانێت چارەسەری رەگەزپەرستی بکات؟*

–کەواتە پێت وایە کە رەگەزپەرستی نەخۆشییەکی درمە، لە یەکێکەوە دەچێت بۆ یەکێکی دیکە!

–نا، چونکە ئەوە شتێکی ئاسایی نیە، کەسێك رقی لە کەسێکی دیکە ببێتەوە هەر لەبەر ئەوەی رەنگی پێستی جیاوازە.

–ئەوانەی کە تووشی ئەو نەخۆشییە دەبن، تەنیا خۆیان بڕیار دەدەن ئەگەر خوازیاری چاکبوونەوە بن. ئەگەر بیانەوێت خۆیان بخەنە بەر لە خۆپرسینەوە یان نا.

*–مرۆڤ چۆن لەخۆی دەپرسێتەوە؟*

–لەخۆی دەپرسێت، گومان دەکات، بیر لەوە دەکاتەوە کە "لەوانەیە هەڵە لە منەوە بێت کە بەو جۆرە بیر دەکەمەوە، کە دەیکەمەوە" هەوڵ دەدات بیر لەوە بکاتەوە چۆنیەتیی مامەڵەکردن و لێکدانەوەکانی بگۆڕێت.

*–بەڵام خۆ تۆ وتت کە خەڵك هەرگیز خۆیان ناگۆڕن.*

–با، بەڵام مرۆڤ دەبێت لەوە تێ بگات کە هەڵە دەکات و ئەوە هەڵبژێرێت و هەوڵ بدات چارەسەرێکی بۆ بدۆزێتەوە. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە مرۆڤ، لە راستیدا، چ لە ناوەوەو چ لە دەرەوە، دەگۆڕێت. مرۆڤ خۆی دەگونجێنێت. ئەگەر مرۆڤێك جارێك لە جاران بۆ خۆی تووشی ئەوە ببێت کە ببێتە قوربانیی رەتدانەوەیەکی رەگەزپەرستانە، ئەوسا تێ دەگات کە رەگەزپەرستی چەند ناعادیلانەیە و قبوولکردنیشی چەند گرانە. ئێمە هەر ئەوەندەی گەشت بۆ جێیەکی دیکە بکەین و رووبەڕووی کەسانی دیکە ببینەوە، لەوە تێدەگەین. ئەوەی روو لە وڵاتانی دیکە دەکات، هەمیشە شتێکی بۆ گێڕانەوە هەیە. گەشتکردن یانی حەزکردن لە دۆزینەوەو

پەردە لە روو هەڵماڵین و فێربوونی شتی نوێ، یانی تێگەیشتن لەوەی کە کولتوورە جیاوازەکان چەندێ لە یەکتر جیاوازن و چۆن هەموویان جوان و دەوڵەمەندن. هیچ کولتوورێك نییە لە کولتوورێکی دیکە باڵادەستتر بێت.

*–کەواتە هیوایەك هەیە..*

–دەبێت بەرەنگاری رەگەزپەرستی ببینەوە، چونکە رەگەزپەرست هەم خەتەرناك و هەم قوربانیشە.

*–مرۆڤ چۆن دەتوانێت هاوکات هەم قوربانی و هەم خەتەرناکیش بێت؟*

–رەگەزپەرست خەتەرناکە بۆ سەر کەسانی دیکە و لە بەرانبەر خۆیشیدا قوربانییەکە. ئەو بەهەڵەدا چووە، بەڵام بەهەڵەی خۆی نازانێت، یان نایەوێت بزانێت. مرۆڤ پێویستە بوێرو چاونەترس بێت بۆ ئەوەی دان بە هەڵەو چەوتییەکانی خۆیدا بنێت. رەگەزپەرستیش هێندە بوێرو چاونەترس نییە. هێندە ئاسان نییە مرۆڤ دان بە هەڵەی خۆیدا بنێت و رەخنە لە خۆی بگرێت.

*–بەتەواوی تێناگەم مەبەستت لەوە چییە!*

–راست دەکەیت! با روونتری بکەینەوە. ئاسانە بڵێیت کە "تۆ هەڵەیت و من راست". زەحمەتیشە بڵێیت کە "تۆ راست دەکەیت و من بەهەڵەدا چووم".

*–ئێستە بیر لەوە دەکەمەوە ئاخۆ رەگەزپەرست بۆ خۆی دەزانێت کە بەهەڵەدا چووە.*

–نەو، ئەگەر نەختێك خۆی ماندوو بکات و بوێریو ئازاییەتی ئەوەی هەبێت لە گشت پرسیارەکان ورد بێتەوە، تێدەگات.

*–کام پرسیارانە؟*

–ئایا لە راستیدا من لەوانی دیکە باشترم؟ ئایا ئەوە راستە کە من سەر بە گرۆیەکی لە هەموو گرۆکان باڵادەستترم. گرۆی وا هەن کە نزم و نەویتر بن لە گرۆیەکەی من؟ ئەی ئەگەر گرۆی نزم و نەوی و بندەستتر هەبن، بۆ دەبێت من دژایەتییان بکەم و لە روویاندا بوەستمەوە؟ ئایا جیاوازیی لە سەروسیمادا ئەوەیش دەگەیەنێت، کە توانای تێگەیشتنی کەسێك بۆ فێربوونیش جیاوازە؟ بەواتایەکی دیکە: ئایا مرۆڤ هەر لەبەرئەوەی سپییە زیرەکترە لەوانی دیکە؟

*–ئایا مرۆڤە بێدەسەڵاتەکان، نەخۆشەکان، پیرەکان، منداڵ و پەککەوتەکان بندەستن؟*

–ئەوەی ترسنۆکە لەو بڕوایەدایە کە بندەستن.

*–رەگەزپەرستەکان لەوە بە ئاگان کە ترسنۆکن؟*

–نەء، چونکە مرۆڤ دەبێت ئازا و بوێر بێت بۆ ئەوەی بتوانێت دان بەوەدا بنێت کە ترسنۆکە...

*–بابە، ئەمە ئامانگەیێنێتە هیچ کوێیەك.*

–رەنگە، بەڵام من هەوڵ دەدەم ئەوەت نیشان بدەم، کە رەگەزپەرستێك چۆن لەنێو بیروبۆچوونە دژبەیەکەکانی خۆیدا زیندانی بووەو نایەوێت لێیان بێتە دەرەوەو خۆی رزگار بکات.

*–کەواتە ئەو نەخۆشە!*

–ئا، بە جۆرێك لە جۆرەکان. مرۆڤ کە رزگار بوو، رووبەڕووی ئازادی دەبێتەوە. رەگەزپەرست حەزی لە چ ارەی ئازادی نییە، لێی دەترسێت. هەروەکوو چۆن لە جیاوازی و وێکنەچوون دەترسێت. تەنیا ئازادییەك کە حەزی لێیەتی ئازادیی خۆیەتی، ئەو ئازادییەی کە رێی بۆ خۆش دەکات هەرچییەك بکات کە خۆی دەیەوێت، بڕیار لەسەر خەڵکی دیکە بدات و بوێرێت رقی لێیان بێتەوە تەنیا لەبەر ئەوەی لەو ناچن و جیاوازن.

*–بابە، دەمەوێت وشەیەکی ناشیرین بەکار بهێنم: رەگەزپەرست سەگ و سەگبابە!*

–وشەکەت زۆر ناشیرین نییە، کچە شیرینەکەم، بەڵام بێگومان زۆر راستە.

### پاشەکی:

دژایەتیکردنی ڕەگەزپەرستی شتێکە کە دەبێت هەمیشە لە بیرماندا بێت. بێداری و بەئاگاییمان هەرگیز نابێت لەق بێت. دەبێت دەست بەوە بکەین، نموونە بهێنینەوەو سەرنج لە وشە خەتەرناکەکانیش بدەین و بەئاگا بین. هەندێك وشە بۆ بریندارکردن و سووکایەتیپێکردن بەکاردەهێنرێن، بۆ ئەوە بەکار دەهێنرێن، بەدگومانی و تەنانەت ڕق و کینەیش بزێیننەوە. هەندێکیشیان هەڵدەشێلرێن و نیوەڕۆکێکی دیکەیان پێ دەبەخشرێت و بە سووکی سەیرکردن و پلەوپایەیان لێ دەکەوێتەوە. هەندێکی دیکەشیان جوان و بەختیارن. ئێمە دەبێت خۆ تارو دوورەپەرێز بگرین لە کلێشەکان، لەو قسە و قسەڵۆکانەش کە گشتگرن و لە درێژەی بەکارهێناندا دەبنە مایەی جێخۆشکردن بۆ ڕەگەزپەرستی. دەبێت ئەو دەستەواژانە لە گەنجینەی وشەکانمان دەربهێنین کە لەنێو خۆیاندا واتای ترسناك و چەوتوچەوێڵیان هەڵگرتووە. دژایەتیکردن و لە رووداوەستانی ڕەگەزپەرستی لە کارکردن لەگەڵ زماندا دەست پێ دەکات. ئەم دژایەتیکردنەش خواست و ویست، دانبەخۆداگرتن و فەنتازیا دەخوازێت. چیتر هەر ئەوە بەس نییە، کە تەنیا بە ڕەفتارو گوتاری ڕەگەزپەرستانە تووڕەو ناڕەحەت بین. دەبێت بەکردەوەش لە ڕوویاندا بووەستینەوە. بەگشتیش نابێت خۆ لە ئاست چەوتوچەوێڵییە ڕەگەزپەرستانەکاندا مت بکەین و هیچ گرنگییەکیان پێ نەدەین. هەرگیز نابێت وا بیر بکەینەوە: "ئەوەندەش ترسناك نییە!" ئەگەر مرۆڤ کەمتەرخەم بێت و گرنگیی پێنەدات، ئەوا ڕێ بۆ ڕەگەزپەرستی خۆش دەکات بەنێوماندا ڕەت بێت و لەنێو ئەو کەسانەشدا بگەشێتەوەو گەشە بکات، کە لە بارێکی تردا دەیانتوانی نەکەونە نێو ئەو داوەوە.

لە ڕوودانەوەستان و هیچ لە ئەستۆی خۆنەگرتن، دەبن بەهۆی ئەوەی ڕەگەزپەرستی ببێت بە شتێکی ڕۆژانە و درێو. بیرت نەچێت کە هەندێ یاسا هەن. ئەو یاسایانەی سزای ئەو کەسانەیان پێ دەدرێت کە قسەی تڕن و درێو لە دژی گرۆیەك لە گرۆ مرۆڤییەکان دەکەن. ئەوەشت لەبیر نەچێت کە چەندین کۆمەڵە و بزووتنەوەی دژ بە هەموو جۆرەکانی ڕەگەزپەرستی هەن و کارێکی زۆر پێویست و گرنگیان لە ئەستۆ گرتووە.

کە جارێکی دیکە دەچیتەوە پۆلەکەت، سەیری هەموو هاوڕێیەکانی پۆلەکەت بکەو ئەوە ببینەوە کە هەموویان جیاواز و وێکنەچوون و ئەم فرەچەشنییە شتێکی جوان و لەبەردڵانە. ئەوانە لە هەموو کونوقوژبنێکی ئەم دنیایەوە هاتوون. دەتوانن شتێکت پێ ببەخشن کە خۆت نیتە، هەروەکوو چۆن تۆش دەتوانیت شتێکیان پێ بدەیت کە ناناشنایە بەوان و نایناسن. تێکەڵبوون، شتێکە کە هەر هەمووومان دەوڵەمەندتر دەکات.

لە کۆتاییشدا ئەو ڕۆژانە کە هەر دەموچاوێك، موعجیزەیەکە بۆ خۆی، دانسقەیە. تۆ، قەت جارێك لە جاران بە دوو دەموچاوی تەواو وەکو یەك و وێکچوو ناگەیت. جوان یان ناشیرین، گرنگییەکی ئەوتۆی نییە. ئەو جۆرە وشانە تەنیا شتێکی ڕێژەیین و هیچی تر. هەر دەموچاوێك مێمایەکە بۆ ژیان. هەموو ژیانێکیش شایانی ڕێزو قەدرگرتنە. هیچ کەسێك مافی ئەوەی نییە سووکایەتی بە کەسێکی دیکە بکات. کاتێك مرۆڤ ڕێزو حورمەت نیشانی مرۆڤێك دەدات، لەو ڕێیەوە بە شانوباڵی ژیاندا، بە گشت قەشەنگی و بەخۆوە نازینێکیەوە، بە گشت جیاوازی و شتە چاوەڕواننەکراوەکانییەوە،

هەڵدەڵێت. ئێمە کاتێک بە ڕێزو حورمەتەوە ڕووبەڕووی کەسانی دیکە دەبینەوە، ڕێزو حورمەت نیشانی خۆیشمان دەدەین.

## پاشەکی بۆ وەرگێڕانی سویدی:

لە بەهارو زستانی 1998دا سەردانی نزیکەی پانزە خوێندنگەی پلەکانی دوا سەرەتایی و ناوەندیم لە فرانسا کرد. زۆربەی ئەو خوێندکارانەی بینیمن، لە تەمەنی پانزەو دوانزە ساڵاندا بوون. ئەوان لەگەڵ مامۆستاکانیاندا کتێبەکەی من "ڕەگەزپەرستی چیە؟ گفتوگۆ لەگەڵ کچەکەمدا"یان خوێندبووەوە.

ئەوەی سەرنجڕاکێشە بۆ من ئەوەیە، ڕەگەزپەرستی چەمکێکە کە بەلای ئەو خوێندکارانەوە گرنگەو پێوەی خەریکن. سەرجەمی گفتوگۆو لێدوانەکان دەرگا لەسەر ئەم سێ بابەتە ئاوەڵا دەکەن: چۆن بەرەنگاری ڕەگەزپەرستی ببینەوە؟ لێکدابڕان و هەڵاواردنی گرۆ مرۆڤییە جیاجیاکان چی دەگەیەنێت؟ دەتوانین چی بکەین لە ئاست ئەو ترسەدا کە بەرانبەر بە (بەرەی نەتەوەیی) هەمانە؟

سارا دوانزە ساڵانە، دوو چاوی ڕەشی گەورەی هەیەو خوێندکاری دوای سەرەتاییە، لە (مۆنپێلیر)، لە خوارووی فرانسا: لە بارەی ئەو دایکوباوکە عەرەبانەوە چی دەڵێیت، کە منداڵەکەیان لەو خوێندنگەیە دەردەهێنن، کە پڕە لە منداڵی عەرەب؟"

داوا لە (سارا) دەکەم پرسیارەکەی دووبارە بکاتەوە و لێی دەپرسم: "ئایا ئەوە پێوەندی بە دایکوباوکی منداڵانی عەرەبەوە هەیە؟" دەڵێت: "بێگومان". بۆی ڕوون دەکەمەوە کە لە ئاست ئەو کارەدا سەرسووڕماوم و پاشان لە خۆم دەپرسمەوە چۆن بتوانم ئەوەی بۆ ڕوون بکەمەوە، کە مرۆڤ چۆن قێزی لە چارەی خۆی دەبێتەوە. خۆم لە بەکارهێنانی ئەو وشانە دەپارێزم و لەبری ئەوە لەبارەی هەڵاواردن و لێکجیاکردنەوەی گرۆ مرۆڤییەکانەوە دەدوێم و پێی دەڵێم: "ئەوانە ئەو دایکوباوکانەن کە دەیانەوێت منداڵەکەیان وەکوو هەموو منداڵانی دیکە بێت". "دەیانەوێت منداڵەکەیان وەکوو هەموو منداڵانی تری فرانسی بێت و پێیان وایە ئەگەر منداڵەکەیان لە منداڵانی تری عەرەب دابڕن، تووشی ئەوە نابێت بە سووکی سەیر بکرێت". مامۆستاکەی (سارا)، کە لە کۆبوونەوەکەدا بەشدارە، خۆی لە گفتوگۆیەکە هەڵدەقورتێنێت و دەڵێت: "سارا باسی خۆی دەکات، ئەو بۆ خۆی دووچاری ئەو گرفتە بووە".

لە هەموو ئەو پرسیارانەی منداڵان لێیان کردم، پرسیارەکەی (سارا) بۆ من لەگشتیان چاوەڕوانەکراوتر و هاوکاتیش لە گشتیان بەهێزتر بوو، من زۆر جاران، دەمداچەقاو لە بەرامبەر ئەو دایکوباوکانەدا وەستاوم کە باسی ئەوەیان کردووە چۆن هەستیان بە سەرلێشێوان و بێدەسەڵاتی کردووە، کاتێک ڕووبەڕووی ئەوە بوونەتەوە منداڵەکانیان وشەی ڕەگەزپەرستانە بەکاردەهێنن و تەنانەت خۆیان لە ڕیزەکانی (بەرەی نەتەوەیی) نزیک دەخەنەوە و تێکەڵ بەوان دەبن. "بەڵام ئێمە هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدا بووین بە باشترین شێوە پەروەردەیان بکەین، هەمیشەش بۆ خۆمان لەنێو ئەو کۆمەڵانەدا، کە دژایەتیی ڕەگەزپەرستی دەکەن، چالاک بووین.." و شتی دیکەی لەو جۆرە. دایکێک،

لە یەکێك لە کتێبفرۆشییەکانی پاریسدا، لێم دێتە پێشەوەو دەڵێت: "من و پیاوەکەم تووشی شتێکی زۆر ناخۆش و دڵتەزێن بووین.کوڕەکانمان، کە پانزە و حەڤدە ساڵانن، زۆرجاران، لەلایەن کوڕانی عەرەبی مەغریبییەوە پەلامار دەدرێن. جار لەدوای جار هەوڵ دەدەم ئەوەیان بۆ روون بکەمەوە کە بە هەمان چاو سەیری هەموو مەغریبییەکان نەکەن، بەڵام تا دێت رەگەزپەرستانەتر لە مەغریبییەکان دەڕوانن. چی بکەین؟ تۆ لە کتێبەکەتدا ئەمەت باس نەکردووە".

هەمان پرسیارم لیّ دەکرێت، بەڵام بە شێوەیەکی دیکە، لەلایەن خوێندکارێکی پلەی دواناوەندییەوە لە (بۆرگێن): "من و باوکم لە یەکتری تێ ناگەین. ئەو چیتر حەوسەڵەی قبوولکردنی مەغریبییەکانی نەماوە، چونکە هەمیشە ئۆتۆمۆبیلەکانیان لە بەردەم گەراجەکەی ئێمەدا رادەگرن. بێگومان ئەمە شتێکی ناخۆشە، بەڵام دیارە ئەوان نایانەوێت لەوە تێ بگەن.."

مامۆستایەکی خەڵکی (رەیم) سکاڵا دەکات: "هەندێك لە خوێندکارە مەغریبییەکان لەنێو خۆیاندا بە عەرەبی قسە دەکەن، ئەمەش تەنیا بۆ ئەوەی من تێ نەگەم باسی چی دەکەن. ئەمە تووڕەم دەکات و رقم هەڵدەستێنێت. هیچ چارەیەکیشم نییە؟"

*(کامیلە) خوێندکاری هەمان خوێندنگەیەو چواردە ساڵانە: "تاقەت و حەوسەڵەی مرۆڤ تا چ سنوورێکە؟ چی بکەم کاتێك دراوسێیەکەمان کچە چواردەساڵانەکەیان ناچار دەکەن شوو بکات و لەچك ببەستێت؟" (مالیکە) وەڵامی دەداتەوە: "کەس بۆی نییە لە فرانسا وا بکات. ئەگەر باوکم ناچارم بکات شوو بکەم، لە لای نزیکترین هاوڕێم خۆم دەشارمەوە".*

(خەدیجە) کە لە یەکێك لە خوێندنگەکانی پلەی دوا سەرەتاییدا لە (بۆرگێن) کار دەکات، دەکەوێتە قسەو داوای لێبووردن دەکات کە خۆی لە گفتوگۆی منداڵەکان هەڵدەقورتێنێت و دەپرسێت: "کەی بیر لەوە دەکەیتەوە کتێبێك لە بارەی رەگەزپەرستییەوە بنووسیت، کە ژێر ناونیشانەکەی "گفتوگۆ لەگەڵ باوکودایکمدا"، بێت؟" پاشان باسی ئەوە دەکات کە چەند بۆ دایکو باوکی سەختە قبووڵی ئەوە بکەن شوو بە ناموسڵمانێك، بە ئەورووپاییەك، بکات. "بە بڕوای من ئەمە رەگەزپەرستییە". و لەسەر قسەکانی بەردەوام دەبێت: "دایکوباوکی من، لە هەر شتێك بەوان نامۆ بێت، دەترسێن. بەڵام من نامەوێت ئەو پیاوەی خۆشم دەوێت، تەنیا هەر لەبەرئەوەی دایکوباوکم قبووڵی بکەن، ناچار بێت بێتە سەر دینی ئیسلام".

لە فێرگەی (سێڤگنێ) لە (رۆیبای) (هۆوریا)ی دوانزە ساڵان دەڵێت: "لەو باوەڕەدایت بتوانیت کار بکەیتە سەر ئەو منداڵانەی دایکوباوکیان رەگەزپەرستن؟" هەمان پرسیارم لە لایەن (لیودیا)وە لە فێرگەی (ژان ژاورێ) لە (لۆمێ) کە دەکەوێتە دەوروبەری (لیل) لە سەرووی فرانسا لیّ دەکرێت: "ئەگەر باوکودایکم رەگەزپەرست بن، ئەوە دەگەیەنێت کە منیش رەگەزپەرستم؟ ئایا دەتوانم باسی ئەوەیان بۆ بکەم کە دەبوو چۆن بوونایە؟" هاوڕێی پۆلەکەی کە ناوی (کارین)ە بەدوای ئەوەدا دەڵێت: "لێرە، لەم خوێندنگەیەدا، یەکێك هەیە رەگەزپەرستە. ئەو نایەوێت کتێبەکەت بخوێنێتەوە، خەتای ئەویش نییە، دایکو باوکی زۆر تایبەتن. هەوڵمان داوە قسەی لەگەڵدا بکەین، بەڵام هیچمان

پێ ناکرێت، چونکە نایەوێت گوێمان لێ بگرێت. نازانین چی بکەین، بەڵام هیواداریــن تۆ بتوانیت لە بارەی ئــەوەوە بدوێیــت، کــە چــی لەگــەڵدا بــاس بکەین.."

(مریەم) خوێندکاری پلەی ناوەندییە لە (بازاس) لە خوارووی خۆرئاوای فرانسا. لە فرانسا لەدایك بووە و باوکو دایکی جەزائیرین. (مریەم) ئەوە دەگێڕێتــەوە برا گەورەکــەی، کــە لــە (تۆولــۆن)، لــە خــوارووی خۆرهەڵاتی فرانســا، دەژی، چۆن ناچار بووە نــاو و پاشناوی خۆی بگۆڕێت– بە ئومێدی ئــەوەی کــارێکی دەست بکەوێت و بتوانێــت وەکــوو هــەر کەسێکی تــر ژیان بەسەر بەرێت– ئەختێك بێدەنــگ دادەنیشێت و پاشــان دەڵێت: "ئــەوەش هیچــی نــەگۆڕی، چونکــە نەیتوانی سەروسیمای خۆی بگۆڕێت! بەڵام مــن لێرە هەست بە غەریبی ناکەم".

(مالیك)، منداڵی خێزانێکی فرانســی– جەزائیرییــە، وەڵامــی دەداتــەوە: "مــن خــۆم فێرکردووە چۆن بــە گاڵتــەو گەپــەوە ڕووبــەڕووی ڕەگەزپەرستی ببمــەوە. کاتێك لە (بۆردۆ) دەژیــاین، هــەر کە کەسێك قســەی ڕەگەزپەرستانەی بکردایە، پێ دەکەنیم، بەڵام هەمان شت کارێکی خراپی کردە سەر خوشکە بچکۆلەکــەم و ئێستا لە ناچاریدا دەچێت بۆ چارەسەری دەروونی".

هەموو منداڵان ئەو توانایەیان نییــە کــە بــە گاڵتــەو گەپــەوە ڕووبــەڕووی قســەو قســەڵۆکی ڕەگەزپەرستانە ببنەوە. ڕووم لەهەر لایەك کردبێت، هەمیشــە هــەمان پرسیار لە بەردەممدا قووت بووەتــەوە: "چی بکــەم؟ هیچ لەو بارەیەوە لە کتێبەکەتدا نەنووسراوە.."

ئەمە ڕاستە و لە کتێبەکەمدا نییە. من ئەوەی بــە بیر دەهێنمەوە کە نابێت دەستەوەســتان بــێن و هیــچ نەکەین؛ بەوەی کە نابێت لێگەڕێین هەرچی دەبێت با ببێت، بەوەی کە نابێت پێمان وا بێت کــە جۆرێك لــە ڕەگەزپەرســتیی ڕوون هەیــە، بــەوەی کــە چــەند یاسایەك دژی چالاکیی دژایەتیکردنی بیانییــان هەیــە، وەڵامیان دەدەمەوە.

لە (مۆنتێلیمار)، لە خوارووی خۆرهەڵاتی فرانسا، بەڕێوەبەری خوێندنگەکە، کە لــە کاتی گفتوگۆکردندا لەگەڵماندایە، ئیشارەت بۆ مــن دەکات. مامۆستایەك کە لە تەنیشتمەوە وەستاوە بە گوێمدا دەچرپێنێت: "وریابەو ئاگات لە خۆت بێت. بەڕێوەبەری خوێندنگە لــەوە دەترســێت کــە تــۆ ئــاگری شەڕوشــۆڕ لــە خوێندنگەکــەدا خۆش بکــەیت. دەبێت بەئاگا بیــت، منداڵان دەتوانن بکەنــە ئــەو بڕوایــەی کــە شتێکی زۆر ئاســایی و بەجێیــە لــە خوێندنگەکــەدا بکەونــە سەروگوێلاکی یەکتر".

جەخت لەســەر ئــەوە دەکــەم کە کــاتێك کەسێك ڕووبــەڕووی ســوکایەتیپێکردنی ڕەگەزپەرســتانە دەبێتــەوە، نــابێت پــەنا بــۆ بــەکارهێنانی وشــەی ڕەگەزپەرستانە بــەرێت، بەڵکــە دەبێت بەهێمنییەوە ڕووبەڕووی ببێتەوەو فرسەت بهێنێت تا بتوانێت، لە پۆلدا، کاتێك کە گشت خوێندکاران ئامادەن، باسی ڕەگەزپەرستی بهێنێتە کایەوە.

(ئاودرەی)، کە خوێندکاری هەمان خوێندنگەیــە و لە تەمــەنی باڵقبوندایــە، دەڵێت: "من قــەت تووشی ڕەگەزپەرســتی نــەبووم. قــەتیش ڕەگەزپەرســتانە ڕەفتارم نــەکردووە. ئــەوە خــەڵکی وڵاتــانی ســەرووی ئــەفریقان کــە لــە فرانســا دەژیــن لــە بەرانبــەر فرەنسییەکاندا ڕەگەزپەرستن. هەندێ لەو بیانییانەی کە لە فرانسا دەژین هیچ ڕێزو حورمەتێکیان بۆ یاساو

ڕێساکانی ئێمە نییە.." (لاورێنت)، کە خوێندکاری هەمان پۆلە، دوای قسەکانی ئەو بەردەوام دەبێت و دەڵێت: " ئەو ڕەگەزپەرستییەی لێرە هەیە، بەگشتی ئەو جۆرە ڕەگەزپەرستییەیە کە ڕەشەکان و مەغریبییەکان لە ئاست سپیەکاندا بەکاری دەهێنن. ئەگەر فرەنسییەک، ڕەنگپێستێك بکوژێت دوو هەفتە لە دەنگوباسەکانی تەلەفزیۆندا باس دەکرێت و بە پێچەوانەوەش تەنیا چەند ڕۆژێك باس دەکرێت و ئیتر قروقەپی لێ دەکرێت". منداڵێکی تر، لە هەمان پۆلدا، بە چرپە پێم دەڵێت: "حەزم لە چارەی عەرەبەکان نییە، چونکە زۆر بێنەقڵن و جارێك تووشی چەند عەرەبێك بووم کە جوێنیان پێدام". (مارلێن): "ئەگەر ئێمە شینین یان سەوز، ڕەشین یان سوور، زەردین یان سپی هیچ گرنگییەکی نییە، هەر هەموومان هەم دڵ و هەم مێشکیشمان هەیە. من قەت توشی کەس نەبووم هەڵیکوتابێتە سەرم و پێشم وا نییە قەت بۆ خۆشم پەلاماری کەسێکم دابێت". لە (لێیا)، لە پلەی ناوەندی، لە (بازاس) وەکوو زایەڵەیەك دێتە بەرگوێ: "من دەمەوێت شتێکتان بۆ بگێڕمەوە. کە بچووك بووم یەکێکم بە قولەڕەش بانگ کردو بەڵام لەوساوە قەت جارێکی تر ئەوەم بەکەس نەوتووە".

(جێسیکا)، لە (ڕەیمس)، لە سەرووی خۆرهەڵاتی فرانسا، تەمەنی دوانزە ساڵانە: "ئەگەر نە دایکوباوکی کەسێك و نە هاوڕێیانی کەسێك ڕەگەزپەرست نەبن، چی وا دەکات ئەو کەسە ببێت بە ڕەگەزپەرست؟"

(ئارتو) خوێندکاری هەمان پۆلە: "چیت دەکرد ئەگەر بتزانیبایە کە کچەکەی خۆت ڕەگەزپەرستە؟"

(ماریۆن): "ئایا کچەکەت قەت تووشی ڕەگەزپەرستی بووە؟"

(فرێدریك): "ئەی خۆت قەت تووشی ڕەگەزپەرستی بوویت؟"

زۆر لایان سەیرە کە دەڵێم نە من و نە منداڵەکانیشم توشی ڕەگەزپەرستی نەبووین، بەڵانی کەمەوە نە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و نە لە ڕێی بەکارهێنانی زەبروزەنگەوە. ئەوسا ئەو منداڵانەی کە لە بنەچەدا خەڵکی مەغریبن دەڵێن: "ئێوە خواپێداون".

بەرلەوەی کە بەو شێوەیە بە فرانسادا بگەڕێم نەمدەزانی ئەو منداڵانەی تەمەنیان لە نێوان یانزە و پانزە ساڵاندایە هێندە بیر لە (بەرەی نەتەوەیی) دەکەنەوە. ئەوان بانگوسەڵای ڕەگەزپەرستانەی ئەو پارتییە دەبیستن و لەوەش تێناگەن بۆ دیمۆکراتییەتی فەرەنسی زەمینەی بۆ ئەو بزووتنەوەیە خۆش کردووە تێیدا گەشە بکات و جێپێی خۆی تێدا توند بکات. خوێندکارانی پلەی ناوەندی، لە (مۆنتێلیە)، لە بارەی مەو شتێکی دیکەوە هێندەی ئەو ترس و بیمەی (بەرەی نەتەوەیی) خستوویەتییە دڵیانەوە، پرسیاریان نەکرد. (میشام)ی چواردە ساڵان لە (ڕەیم) دەپرسێت: "ئەگەر فرانسا چیتر ئەو کۆمارە نەبێت و لە بری ئەوە ببێت بە وڵاتێکی دیکتاتۆر و هەموو پەناهێن و بیانییان بکاتە دەرەوە، ئەوسا چی دەڵێیت؟"

کاتێك داوای لێ دەکەم پرسیارەکەی زیاتر ڕوون بکاتەوە، دەڵێت: "بەرەی نەتەوەیی دەیەوێت ڕژێمێکی دیکتاتۆر دەسەڵاتی فرانسا بگرێتە دەست و

فرانسای کۆماری لەناو بەرێت. ئەوساش ئەوە دەکات کە لە پێناویدا هاتۆتە کایەوەو بۆی تێدەکۆشێت".

منالێك کە لە بنەچەدا خەلکی مەغریبە قسەکەی لێ وەردەگرێت و دەلێت: "باشە ئەی ئەگەر یاسا دژی رەگەزپەرستی هەیە، ئەی بۆ بەرەی نەتەوەیی قەدەغە نەکراوە؟".

(تۆیۆمی)یش دەپرسێت: "ئەی چۆنە لە ولاتێکدا، کە مافە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ دەپارێزێت، رێ بە بوونی پارتییەکی وەکوو بەرەی نەتەوەیی دەدرێت؟".

لە (بازاس)، لە خوارووی خۆرهەلاتی فرانسا، زۆربەی خوێندکارەکان سەر بە خێزانی جووتیارانن. مامۆستایەك دەلێت: "لێرە کەس، یان راستتر زۆربەیان، هیچ لە بارەی رەگەزپەرستییەوە نازانن". لە کۆتایی کۆبوونەوەکەدا خوێندکارەکان دەکەونە باسوخواسی ئەوەی کە بێ ئەم کتێبۆکەیە، ئەوەیان نەدەزانی کە شتێك هەیە ناوی دژایەتیکردنی رەگەزە. لەو خوێندنگەیەدا تەنیا یەك پێستڕەش و کچۆلەیەکی مەغریبیم بەرچاو کەوت. (مریەم) بەتەوای تێکەل بەو ولاتە بووە کە تێیدا دەژیو بە زاراوەی ئەو ناوچەیەش دەدوێت. ئایا ئەوەندە ئاسانە ئەگەر لە جێیەك بیانیی لێ نەبێت، رەگەزپەرستیش لە ئارادا نییە؟ زۆر لەمە دلنیا نیم. چونکە کاتێك لەگەل منالەکاندا قسە دەکەم لەوە تێدەگەم کە رەگەزپەرستی شتێکە بە خۆیەوە خەریکی کردوون، ئەگەرچی وەکوو تر مێشکیشیان بە شتی دیکەوە خەریکە.

(ئاورێلییە) دەپرسێت: "ئایا مرۆڤ دەتوانێت رەگەزپەرست بێت، ئەگەرچی لەوەش بێئاگایە کە رەگەزپەرستە؟"

(ئێلۆدییە)یش لەوە دەپرسێتەوە کە بۆچی من باس لە رەگەزپەرستی دەکەم.

ئەو تاکە منالە رەشپێستەش کە لەو خوێندنگەیەدا هەیە هیچ نالێت. کە کۆبوونەوەکە کۆتایی پێ دێت لێم دێتە پێشەوەو داوام لێ دەکات کتێبەکەی دەستی بۆ ئیمزا بکەم و پاشانیش دەلێت: "لە راستیدا رەگەزپەرستی چ کەلکێکی هەیە؟"

لە (سێڤیگنێ) لە (رۆوبایخ) دەکەومە بەر رێژنەی پرسیار. یەکەم پرسیار لە بارەی ئەو شتە دژ بەیەکانەوەیە کە لە کتێبەکەدان: "ئایا ئەوە جۆرێك لە رەگەزپەرستی نییە، کە وا نیشان بدەیت منالانی (مێستیس) جوانترن لە منالانی تر؟" سەردانی هەر پۆلێکم کردبێت، ئەو پرسیارەم رووبەڕوو کراوەتەوە. هەروەها ئەوەش کە لە کتێبەکەدا هەر رەگەزپەرستێك بە سەگ و سەگباب دەستنیشان کراوە لە کتێبەکەدا زۆر کەسی تووڕەو شێتگیر کردووە. "تۆ دەلێیت مرۆڤ دەبێت رێزو حورمەتی بۆ یەکتر هەبێت، ئەگەرچیش وەکوو یەکیش بیر نەکەنەوە". ئەمە (ستێفان) لە (مۆنتپێلیێ) دەلێت و پاشان بەردەوام دەبێت: "بەلام لە کۆتایی کتێبەکەدا رەگەزپەرستەکان بە سەگ و سەگباب وەسف دەکەیت. ئەمە چۆن لەگەل دیتنەکانی دیکەتدا دەگونجێت؟" (ئێستێلە)ی دوانزە سالان، لە (رێیمس)، دەپرسێت: "ئایا بەر لەوەی کتێبەکەت بنووسیت، بیرت لە هەموو شتێك کردبووەوە؟" (ئاورێلیێ)یش کە خوێندکاری هەمان پۆلە دەپرسێت: "ئایا هیچ رەگەزپەرستێکت وا لێ کردووە دیدو بۆچوونی خۆی بگۆرێت؟"

پرسیارو بابەتی دیکەش تێکەل بە گفتوگۆکانمان بوون. بەر لە هەر شتێك ئەو منالانەی کە

دایکوباوکیان خەڵکی مەغریبن لە بارەی ترسەوە، ئەوەندە لە بارەی ئەو ترسەوە نا کە هەڵپەو پەلامارە رەگەزپەرستانەکان دەیخەنە دڵەوە، بەڵکە زیاتر لە بارەی ترسی جێی خۆکردنەوە لە کۆمەڵگای فرەنسیدا دەدوان. (حەنانە)ی چواردە ساڵان دەپرسێت: "هەڵاواردن و لێکجیاکردنەوەی گرۆ مرۆڤییەکان لە یەکتر چی دەگەیەنێت؟" مەبەستیشی لەوەیە کە: "ئایا من کە لە فرانسا لە دایك بووم و لە دایکوباوکێکی مەغریبیم کە بە عەرەبی لە ماڵەوە قسە دەکەین، رۆژێك لە رۆژان، دەتوانم لە کۆمەڵگای فرانسیدا جێی خۆم بکەمەوە؟" ئەو پرسیارەکەی خۆی بە پرسیارەکەی (سارا)وە دەبەستێتەوە لە بارەی ئەو دایك و باوکانەوە کە رێ نادەن بە منداڵەکانیان، بێجگە لە منداڵانی عەرەب، تێکەڵ بە کەسی دیکە ببن. ئەو براکەی (مریەم) دێنێتەوە بیرمان کە چۆن ناو و پاشناوی خۆی گۆڕیبوو. بەر لە هەر شتێك، منداڵانی پەناهێنەران و بیانییان، ئەو منداڵانەی کە هیچ داهاتوویەکیان لە وڵاتی دایکوباوکیاندا نییە، کە شایەتی زۆرترین نیگەرانی و پەشێوین، هاوکاتیش بەچەند وشەیەکی سادە و ساکار خواستێکی ئاشکراو راستەقینە نیشان دەدەن، کە دەیانەوێت لەم وڵاتەدا بمێننەوە و ببن بە بەشێك لە مێژووی ئەم وڵاتە.

منداڵانی (بازاس)، کە دەڵێن هیچ لە بارەی رەگەزپەرستییەوە نازانن، پێکەوە لێم دەپرسن: "دەتەوێ بە چ شێوەیەك گەورە بین و پێ بگەین؟"

(تۆماس)ی دوانزە ساڵانیش لە (مۆنتێلیمار) پارچە کاغەزێکی دایە دەستم، کە بۆ خۆی لەسەری نووسیبوو: "رەگەزپەرستی ئەوەیە کە هەمیشە لە جەنگدا بیت".

تاهیر بین جەلوون

مارتی 1998

## پەراوێزەکان:

1- بڕوانە: Vad ar rasism? Samtal med min dotter, Tahar Ben Jelloun. Oversattning av Mats Lofgren, Alfabeta Bokforlag. 1998.

2- مەبەست لە ژان ماری لۆپێن، سەرۆکی بەرەی نەتەوەییە لە فرانسا و یەکێکە لە لایەنگرەکانی رەگەزپەرستیی و دژایەتیکردنی بیانییان لە سەرانسەری ئەورووپادا.

3- کوسکوس: خواردنێکی تایبەتی گەلانی سەرووی ئەفریقایە، لە ساوەر وردترە و لە فرانسا زۆر باوە.

4- بۆماوە: ئەو خەسڵەتە بایۆلۆژییانەی لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر دەمێننەوە.

5- لۆپێن: ژان ماری لۆپێن. بڕوانە پەراوێزی (2).

6- سمۆلێنی: واتە: خەڵکی سمۆلاند. سمۆلاند، هەرێمێکە دەکەوێتە خوارووی خۆرهەڵاتی سویدەوە.

7- بلاتە: وشەیەکی ناشرینە لەلایەن سپییە رەگەزپەرستەکانەوە بە رەشپێستەکان دەوترێت و بەرانبەرەکەی لە کوردیدا نییە.

8- پۆگرۆم: وشەیەکی رووسییە. واتە: دژایەتی و بەکارهێنانی زەبروزەنگ دژ بە جوولەکە.

9- پێتێن: فیلیپ پێتێن، سوپاییەکی فرانسایی بوو. لە 1940/6/16دا، دوای داگیرکردنی فرانسا لەلایەن ئەڵمانەکانەوە بوو بە سەرۆکی حکومەتی ئەوسای فرانساو لە دوای جەنگی جیهانیی دووەم بە تاوانی خیانەتکردنی بەخاك و نەتەوەی فرانسا حوکم درا بە مردن و پاشان بە لێبووردن حوکمەکەی بۆ کرا بەمانەوە لەزینداندا تا مردن.

10- بۆفۆن: جۆرج لویس (1707–1788) سروشتناسێکی فرانساییە، یەکێك لە کارە گرنگەکانی بەرهەمێکە لە 44 بەرگدا لەسەر دنیای گیانلەبەران.

11- مارتین لۆتەر کینگ: (1929–1968) قەشەیەکی ئەمریکاییە، کە نوێنەرایەتیی بەکارنەهێنانی زەبروزەنگی دەکرد لە جەنگی بەدەستهێنانی مافی رەشپێستەکاندا. لە 1968دا کوژرا.

# وێستگەكانی سەردەم

- گلۆشینگیان.. براوەی خەڵاتی نۆبێلی ئەدەبی ساڵی 2000
- ئەركی فەلسەفەو ئیشكالیەتی هۆشیاری
- هەڵبژاردن لە نێوان تاریكی و ڕۆناهیدا
- پاش نوێگەری.. پاش ڕەخنە
- فرانكشتاین.. ئەفسانەو فەلسەفە
- تێبینییەكەی ئامیرابنا جەللون لەسەر رەگەز پەرستی
- ڕۆمانی (وەك ئاو بۆ شوكولات)
- بیرەوەرییەكانی فیستیڤاڵی ئاشانتای بۆكە شووشە
- بەشێك لە ژیانی تایبەتیی ماركیز
- ئەلیس مونرۆ
- شەڕ لەگەڵ فۆكۆ
- گفتوگۆ لەگەڵ میلان كۆندێرادا

BAMBI

مثل آب برای شكلات

Salman RUSHDIE

# گاوشینگیان

## له ڕێگەی نووسینەوە بوونی خۆم دەسەلمێنم

● و. له فارسییەوە: محەمەد کەریم



### کورتەیەک
### له بارەی ژیانییەوە

* 1940 لە (جیانزمو)ی ڕۆژهەڵاتی چین لە دایک بووە.

* لە سەرەتای شەستەکانی سەدەی ڕابردووەوە فەرەنسی خوێندووە.

* لە ساڵی 1988 ەوە لە فەرەنسا بووە بە پەنابەر.

* یەکەم نووسەری چینییە کە خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبی وەرگرتووە.

* جگە لە ڕۆمان شانۆگەریش دەنووسێ و وێنەکێشیشە.

گاوشینگیان، خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبی (2000) ی وەرگرت.

بەرپرسانی ئەکادیمی نۆبڵ، گاوشینگیانی نووسەری تەمەن

(60) ساڵەی چینی نیشتەجێی فەرەنسا بە ئەفرێنەری چەند بەرهەمێکی بە بەهاو تەندروستی جیهانی دەزانن، کە بە دیدگاو بەرچاو روونی تانە ئامێزو تازەگەریی لە زماندا چەند ئاسۆیەکی نوێی لە بەردەم ژانرەکانی رۆمان و شانۆگەریی چیندا والاکردووە. گاو یەکەم نووسەری چینییە کە توانی خەلاتی نۆبلی ئەدەبی بەدەست بێنێ و لەکاتی وەرگرتنی خەلاتەکەدا کە (900) هەزار دۆلارە وتی "دیارە ئەم خەلاتە بۆ چینییەکان شتێکی گرنگە بۆیە لەم وڵاتەدا خەلاتی نۆبڵ هەمیشە بابەتێکە نووڕەیی بەرپا دەکات"

ئەم نووسەرە لاوازو کورتەبالایە لە کاتی گفتوگۆی لەگەڵ رۆژنامەنووساندا لە ئاپارتمانەکەی کە دەکەوێتە کەناری پاریسەوە وتی "هەواڵی بەدەست هێنانی خەلاتەکە کە بە تەلەفۆن پێم راگەیاندرا، زۆر سەرسامی کردم، هەروەها پێیان راگەیاندم کە خۆم بۆ وتەیەکی چل و پێنج دەقەیی ئامادە بکەم کە بەرای من زۆر دوورو درێژە. نووسین بەلای گاوەوە هەمیشە ئازادی بەخش و پەسەند بووە، گاو لە یەکەمین وتوێژیدا لەگەڵ هەواڵنێراندا دەڵێت: "نووسین ئەسکین بە ئازارو ئەشکەنجەم دەدات، مرۆڤ دەتوانێت بە بەکارهێنانی وشە، زیهنی خۆی بە چوست و چالاکی بهێڵێتەوە، من لە رێگەی نووسینەوە هەموو جارێ بوون و ئامادەبوونی خۆم دەسەلمێنم". گاو کە هونەری نمایشی بەرتۆل بریخت و تازەگەریی ئەدەبی ساموێل بیکێت و پووچگەرایی ئۆژین یونسکۆ کاری تێکردووە، بەرهەمەکانی ئەمانی لە فەرەنسیەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی چینی. گەلێك جار گاو وەك یەكێك لە دیارترین شانۆنامەنووسە دیارەکانی نیوەی دووەمی سەدەی بیست لە قەڵەم دەدەن و بە قسەی رەخنەگران گاو یەکێکە لەو نووسەرانەی بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن کە توانیوویەتی بۆ دەرەوەی سنووری وڵاتەکەی (چین) هەنگاو هەڵبگری و بۆ دەروونی خۆشی بگەڕێتەوە. بە قسەی (لیو ئوفان لی) مامۆستای ئەدەبیاتی چینی زانکۆی هارڤارد، هەندێ جار گاو نیشاندەری ئەو شتەیە کە ناوی بیرکردنەوەی قووڵ و تێڕوانینی جیهانی و گشتییە. پەیوەستی گاو بە چینەوە تەنها لە سنووری یادەوەریی، مێژوو یان سیاسەتدا نییە. بەڵکو بەهرە لە هەموو ئەم ناوەرۆکانە وەردەگرێ وەکو چەند خوازەو دیمەنێك بۆ دۆزینەوەی مەعنای زیاتر.

گاو رەگەزنامەی فەرەنسی هەیەو بە هوشیاری تەواوەوە خۆی لە سیاسەتی چین بە دوور دەگرێ بۆ ئەوەی بتوانێ ئازادانەو بە شێوەیەك کە خۆی حەزی لێیەتی بیربکاتەوە. لەتەك زمانی دایکدا بە زمانی فەرەنسیش دەنووسێ و بەسەریدا زاڵە. بە قسەی "لی" لەبەر ئەوەی زۆربەی نووسەرە هاوچەرخەکانی چین توانای نووسینیان بە دوو زمان نییە لەم رووەوە گاو نوسەرێکی دەگمەن و تایبەتەو یەکێکە لەو یەکەمین نووسەرە چینیانەی کە دەتوانن بە دوو زمان بنووسن.

شانۆگەرییەکانی ئاوێتەیەکن لە تەکنیکی تازەو هاوچەرخ و بنچینەکانی شانۆی کۆنی چین، شانۆگەریی سێبەرەکان- (نمایشە لە رێگەی گوێزانەوەی سێبەری ئەکتەرەکانەوە بۆ سەرپەرشتی شانۆ) شانۆگەرییە کۆنەکانیش تیایدا ئەکتەرەکان دەمامك دەکەنە سەریان و سەماو مۆسیقای کۆنی تێدایە.

رۆمانەکانیشی ئاوێتەیەکە لە شێوازی جۆراوجۆر، بەلام زۆر جار دەتوانرێ وەکو شکۆدارکردنی رۆحی خەباتگێڕی مرۆڤ گوزارشت لە بەرهەمەکانی بکرێ. بە قسەی گوتەبێژی ئەکادیمی نۆبڵ گاو مرۆڤێکی بە گومان و زیرەکەو بە قووڵی دەڕوانێ کە دەربارەی بە توانایی خۆی لە وەسف و راڤەکردنی جیهاندا هیچ جۆرە ئیدیعایەکی نییە.

لەنێو شانۆگەرییە بەناوبانگەکانی گاودا دەتوانرێ ناوی (وێستگەی پاس Bus Stop 1983) ببرێ کە لە (چاوەڕێی گۆدۆدا)ی بیکیت وە

بیر دەهێنێتەوە و لەلایەن کاربەدەستانی حزبی کۆمۆنیستەوە مەحکوم کرا. یەکێك لە ئەندامە دیارەکانی حزبی کۆمۆنیستی چین ئەم شانۆگەرییەی بە وێرانکەرترین و زیان بەخش تریسن بەرهەمی نووسراو زانی لە دامەزراندنی کۆماری میللی چینەوە. یەکێك لە سیاسی ترین شانۆگەرییەکانی (مەڵاتووەکان)ە چیرۆکێکی عاشقانەیەو رووداوی قەتڵوعامی An Men Tian Sqare ساڵی 1989 ئاشکرا دەکات. بڵاوبوونەوەی ئەم بەرهەمە بوو بە هۆی ئەوەی گاو وەکو مرۆڤێکی ناپەسەندو نەویستراو لەقەڵەم بدرێو بڵاوبوونەوەی بەرهەمەکانی لەوێ قەدەغە بکرێ.

ڕۆمانی کێوی رۆح Soul Mountain واتە بەناوبانگ ترین ڕۆمانی گاو کە ڕۆمانێکی درێژی ئەمپر سیڤنیستی "دان بەخۆداگرتن" و ئەندێشە ئامێزە، بە قووڵی لە سروشت دەڕوانێ لەسەر بنەمای بە پێ ڕۆیشتنی شینگیان بە درێژایی رووباری یانگتز Yangtze. ئەم بەرهەمە وەکو هەڵاتنێك وایە لەبەر دیدەی چاودێرانی دەوڵەت. کتێبەکە ئاوێتەیەکە لە شێوازو تەکنیکە ئەدەبیەکان کە تیایدا شینگیان راوی جیاجیا بەکاردەهێنێ لەگەڵ گۆشە نیگایەك کە هەمیشە لە گۆڕاندایە، چیرۆکی ئەو خەڵکانە دەگێڕێتەوە کە بە درێژایی گەشتەکەی چاوی پێیان کەوتووە. ئەم بەرهەمە لە بەرهەمە تایبەتە ئەدەبیەکانەوە کە دیارە لەگەڵ هیچ بەرهەمێکی دیکەدا قابیلی بەراورد نییە لەگەڵ خۆیدا نەبێ و لە پایەی بەرهەمێکی تەواو مۆدێرن و هوشیارانەدا خۆی دەبینێتەوە. لە جێگایەکی ڕۆمانەکەدا (راوی) بە تەرزێکی بچڕبچڕ و بە دەربڕینی ئەم رستانە خودی نووسەر و بەرهەمەکە دەداتە بەر رەخنەو دەڵێت "تۆ بەوپەڕی بێ دیقەتییەوە یاداشتەکانی گەشتەکەت، قسەی بێ سەروبەرو داسەپاوی ئەخلاقی و پەندو ئامۆژگاری و هەست و سۆز، شتی بە پەلە نووسراو، سەرنج تێبینی، گفتوگۆی گریمانەیی و ئەو ئەفسانانەی کە لە ئەسڵەکەیان ناچن، هەموو ئەمانەت لە تەنیشت یەکەوە داناوە. لاسایی هەندێ گۆرانی ناوچەییت کردۆتەوە، کۆمەڵێ چیرۆکی دەستکردو بێ مەعناشت خستۆتە سەرو ناوت لێناوە ئەدەبیاتی چیرۆك".

هەرچەندە شانۆگەرییەکانی گاو لە سەرانسەری جیهاندا چوونەتە سەر تەختی شانۆ بەڵام ڕۆمانەکانی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نەناسراون. هەتا تەرجومەی ئینگلیزی ڕۆمانی کێوی رۆح تەنها لە ئوسترالیا بڵاوبۆتەوە. ئەم ڕۆمانە هێشتا لە ئەمریکاو بەریتانیا چاپ نەکراوە. بەڵام هەیە ئەگەر گاو تەنها وەکو نووسەرێکی چینی ناوببرێ. (هووارد گلدبلت– Howard Goldblatt) مامۆستای زمانی چینی زانکۆی کۆلۆرادۆ دەڵێت "گاو مرۆڤێکی ڕۆشنبیرەو تەواو ئەهلی قەڵەمە. هەزو ئارەزووەکانی لەسەر بنەمای چەند رووداوێکە کە لە چین روویان داوە زیاتر لە هەر شتێك هەستی مرۆڤایەتی لە ناخیدایە. تەنها رێبازی ئەو بەرەو ئازادی و سەرفرازییە لە رێگەی نووسینەوە. بۆیە کاتێ بە زمانی چینی دەنووسێ کات و شوێنی رووداوی بەرهەمەکانی دەباتە چین، حەز دەکات وەکو نووسەرێك ناوبانگ دەرکات کە بۆ خوێنەر زیاتر دەنووسێت.

هێشتا ژمارەیەکی کەم لە چینییەکان ئاشنای بەرهەمەکانی گاون، ماوە زیاتر لە (دە) ساڵە کە هیچ بەرهەمێکی لە وڵاتەکەی خۆی چاپ نەکراوە. پێش ئەوەش خۆی حەزی دەکرد زیاتر لای ئەو رۆشنبیرو کەسانە بناسرێ کە لەگەڵ شانۆکەیدا کەمێك ئاشناییان هەیە. بە قسەی (وو ژنگ– Wu Zheng)ی سەرنووسەری رۆژنامەی (شانگەهای دەیلی– Shanghai Daily) "زۆر مایەی داخە کە ئەوەی خەڵاتی نۆبڵی وەرگرتووە نووسەرێکی چینییە کە لە وڵاتەکەی خۆیدا خەڵکانێکی کەم بەناوەکەی ئاشنان"

چەندین تویژەر کە شینگیان لە جێگای (بیداو– *Be Dao*) کە شاعیرێکی چینییەو لەبەر رای جیاوازی لەگەڵ کاربەدەستانی چیندا لە ململانێو بەریەرەکانیدا بووە، خەلاتی نۆبلی بە نسیب بووە سەریان سوڕماوە، بەشێوەیەکی ئاسایی ئەکادیمیای نۆبڵ بەلای کەمەوە بۆ چەند ساڵێ خەلاتی نۆبلی ئەدەبی بە کەسێك نادات کە هاونیشتمانی بەر لەو وەری گرتووە، ئەمەش بەو مەعنایەیە کە رەنگە (مستەر– بی) بەم زوانە نەتوانێ خەلاتی نۆبلی ئەدەبی بەدەست بێنێ. دوای تەواوکردنی زمانی فەرەنسی لە زانکۆی پەکین، ئەنگیزەی دەست پێکردنی ژیانێکی ئەدەبی لای گاو سەرهەڵدەدات. بەلام لە کاتی شۆڕشی رۆشنبیریدا کە لە ئەنجامیدا رۆشنبیران لەبەر هۆشیارییان رووبەرووی توندوتیژی بوونەوە. شینگیان نێردرا بۆ کامپێکی فێرکردن و ناچار بوو بۆ ماوەی (*6*) ساڵ لەسەر زەوی کاری سەخت بکات. (مەبەست لەکاری کشتوکاڵە).

شینگیان دەڵێت "کاتێك ژنەکەم ئاشکرای کردم ناچار بووم برێکی زۆر لە نووسینەکانی خۆم کە لە سەرەتادا نووسیبووم بسوتێنم کە رۆمان و شانۆگەریی و وتاری تێدابوو، زۆر ئازاری پێ بەخشیم و ناڕەحەتی کردم. بەلام هەتا لە کاتێکدا کە نووسینەکانم شتێکیان وتبێ کە پێچەوانەی ئارەزووم بووبێ دیسان ئەنگێزەی نووسین لە ناخمدا هەبوو. و ئێستا شەوو رۆژی (*16*) سەعات سەرقاڵی نووسین و وێنەکێشانم".

گاو بەفرانس پرێس دەڵێت: "من هەمیشە سەبارەت بە نووسین کەڵکەڵەی فیکریو سەرقاڵی زیهنی لەو جۆرەم هەبووە. نووسین شتێکە کە لە چین بووە بەهۆی ئازارو ئەشکەنجەو بەدبەختی من، بەلام بە هیچ جۆرێ نیازی دەستبەردار بوونیم نییە. هەتا لە کاتی ئەو هەل و مەرجە دژوارەدا کە لە چین هەمبوو، بێ ئەوەی کە بیر لە چاپکردنی نوسینەکانم بکەمەوە بە دزییەوە درێژەم بە نووسین دەدا.

گاو هەتا پێش ساڵی ***1979*** نەیدەتوانی لە چین بەرهەمەکانی چاپ بکات یان سەفەری دەرەوە بکات. لە هەشتاکانی سەدەی بیستدا کورتە چیرۆك و شانۆگەری و وتارو کتێبێکی زۆری نوسی کە بێ ئەوەی بیەوێ بووە مایەی سەرنجی کاربەدەستان و بەرپرسان. بۆ نموونە ئەو وتارەی کە دەربارەی جوانناسی بوو ریالیزمی کۆمەلایەتی (ماو)ی خستە بەر پرسیارو گومانەوە و چەند مشت و مڕێکی پڕ مەترسی پڕ جۆش و خرۆشی دەربارەی کەلتووری فەرهەنگی ماو هێنایە ئاراوە.

گاو سەرئەنجام لە ساڵی ***1987*** دا چینی بەجێ هێشت و ساڵێك دوای ئەوە وەکو پەنابەری سیاسی لە فەرەنسا نیشتەجێ بوو، گاو لە دوای سەرکوت کردنی سەربازیانەی خۆپیشاندەران لە (تیان ئان مێن) لە ساڵی ***1989***دا کە تیایدا سەدان کەسی مەدەنی کوژران، وازی لە حزبی کۆمۆنیست هێنا لەژێر کاریگەری ئەو رووداوەدا شانۆگەری (هەلاتووەکان)ی نووسی. مایەی سەرنجە کە تا ئێستا هیچ کام لە شانۆگەرییەکانی لە چین نەچۆتە سەر تەختەی شانۆ.

شینگیان دەڵێت "من لەبەر ئەوە چینم بەجێ هێشت بۆ ئەوەی بتوانم بێ ئەوەی سەرئێشە بۆ خێزان و دۆستەکانم دروست بێ، ئازادانە بیرو بۆچوونی خۆم دەربڕم. من سیاسەتمەدار نیم و خۆم تووشی مەسەلە سیاسییەکان ناکەم، بەلام ئەمە نابێتە هۆی ئەوەی کە من رەخنە لە رێبازی چینی کۆمۆنیست نەگرم، من ئەوەی کە دەمەوێ دەیڵێم. ئەگەر من ئاوارەییم هەڵبژاردووە کەواتە دەبێ بتوانم بێ هیچ کۆت و بەندێ ئازادانە بۆچوونی خۆم دەربڕم"

گاو وێنەکێشیشە، وێنەی سەربەرگی کتێبەکانی خۆی دەکێشی و بە بەرهەمەکانی لە سەرانسەری جیهاندا پێشانگەی زۆری کردۆتەوە.

**سەرچاوە:**

*گۆڤاری گلستانە، ژمارە 23.*

# ئەركی فەلسەفەو ئیشكالیەتی هۆشیاری

## هانز جۆرج گادامێر مۆمی سەدساڵەی تەمەنی دادەگیرسێنێ

■ ئیبراهیم حەیدەری

● و. لە عەرەبییەوە: بڕوا عەلادین

هانز جۆرج گادامێر (بە تەمەنترین فەیلەسوفی ئەڵمانی) لە شاری هایدلبرگ ئاهەنگی جەژنی لە دایكبوونی (*100* ساڵ تەمەنی) خۆی گێڕا. ئەو بە یەكێك لەو فەیلەسوفانەی سەرەتا دادەنرێ كە بنەمایەكیان بۆ فەلسەفەی هیرمۆنتیكای هاوچەرخ دانا، فەلسەفەیەك كە هەوڵدەدات بەسەر هەقیقەت و مەنهەجیەتدا بكرێتەوەو دەروازەیەك بۆ هۆشیاریەكی تازە لە بەردەم گوتاری فەلسەفەی و جیاكاری و راڤەكانیدا بكاتەوە، ئەمەش لە ناوجەرگەی ئەو گفتوگۆیەدا كە ئەمڕۆ دەربارەی چەمكی زانست و تەكنیك هەروەها ئەركی فەلسەفە بەرامبەر عەقڵئامێری دەكرێت، بێ وازهێنان لە هێرمۆنتیكا لە رەوتی تێڕامانێكی فەلسەفیدا، بەو پێیەی هێرمۆنتیكا چالاكیەكی ئیجتیهادیەو لەسەر بنەمای جیاوازیی تێڕوانین و هەمەڕەنگی میتۆدەكان راگیر بووە. گادامێر (*11*ی شوباتی *1900*) لە (ئامبورگ) لە دایكبووەو لە زانكۆی (ماربورگ) فەلسەفەی خوێندووە. پاشتر لە زانكۆكانی (لایبزگ و فرانكفۆرت و هایدلبرگ) بووە بە مامۆستا و زۆر كاری زانستیشی ئەنجامداوە، لەوانە: دیالەكتیكی ئەخلاقیانەی ئەفلاتون، ئەفلاتون و شاعیران، گۆتە وەك فەیلەسوفێك، هۆڵدەرلین و پاشەڕۆژ، بنچینەی فەلسەفە، هەروەها حەقیقەت و میتۆد كە بە یەكێك لە كارە فەلسەفیە گرنگەكانی دادەنرێ. كاتێ (توماس شتورم) لە گۆڤاری (دیرشبیگل)ی ئەڵمانیەوە پرسیاری دەربارەی ئەركی فەلسەفە لێكرد، گوتی: زۆر

پرسیار هەن کە خەڵکی حەزدەکەن وەڵامی تێرو تەسەل و باوەرپێکەریان لە بارەوە دەست بکەوێ.

ئەگەر مرۆڤ پێی وابێ لەگەڵ پێشکەوتنی زانستی- تەکنیکی هاوچەرخدا ئەو جۆرە پرسیارانە نامێنن، ئەوا ئەمە خورافەتە.

بەڵام کام پرسیارانە.. ئەوانەی دەربارەی مەرگ و لە دایکبوونن یا ئاینن؟ لە راستیدا پرسیارگەلێکی قوڵترو گرنگتر هەن وەك ئیشکالیەتی هۆشیاری کە ناکرێ بەهۆی تیۆرەی زانیاریگەرایییەوە (المعلوماتیة) وەڵامبدرێتەوە، چونکە ئەوەی لەمبارەیەوە گرنگە ئەو مەنهەجیەتەیە کە فەیلەسوف بۆ چارەسەرکردنی ئەو پرسیارانە بەکاری دەهێنێ، نەوەك زانیاریەکان. بۆ نمونە کاتێك مرۆڤ دەیەوێ کەسێك بهێنێتە سەر رایەك شێوازێك بەکاردەهێنێ کە پێی دەوترێ بەلاغە.

بەڵام بەلاغە میتۆدێکی فەلسەفی نیە بەڵکو تەنها شێوازێکی ئیقناعە. لەگەڵ ئەوەشدا کە گەورە فەیلەسوفان بایەخ بەم شێوازە نادەن، بەتایبەتی کانت، ئەوا گادامێر بەلاغەت ناودەنێت میتۆدێکی فەلسەفی چونکە دواجار دەبێ مرۆڤ فێربێت کە چۆن گفتوگۆیەکی دروست ساز دەکات. لە راستیدا ئەم وەزیفەیە بەرپرسیاریەتیەکی گەورەیەو دەکەوێتە سەرشانی فەلسەفە.

بەهەرحاڵ، هەر ئاخاوتن و گفتوگۆیەکی پێشوەخت پێویستی بەوەیە (ئەوی دی) لەسەر هەق بێت، ئەمە لەلایەکەوە، بەڵام لەلایەکی دیکەیشەوە کۆمەڵی بۆچوونی هەڵە بەرامبەر ئەو فەلسەفەیە هەیە کە ناتوانێ ببێتە ئەڵتەرناتیڤی هیچ زانستێك. کاتێ هەندێ کەسی وا لە فەلسەفە دەڕوانن کە دەبێت کورتەو پوختەیەکی زانستیمان دەربارەی وێنەی جیهان بداتێ، ئەوا دەشێ ئەم رایە هەڵەیەکی گەورە دروست بکات، بەتایبەتی کاتێك هەندێ کەس باوەڕیان وایە پێویستە فەلسەفە (یا فەلسەفە دەتوانێ) زانستێك بێت.

لە راستیدا یەکەم کێشەی فەلسەفە گرەو نیە لەسەر مەنهەجیەتی زانستی. لە ژیاری خۆرئاوادا هەر لە گالیلۆوە بەردەوام پێشکەوتنێکی زانستی دەبینرێ بۆ کۆنترۆلکردنی سروشت و ملکەچکردنی بۆ خواست و ویستی مرۆڤ، بەڵام تێبینی ئەوەش دەکرێت کە ئەمڕۆ سروشت تۆڵەی خۆی بسێنێتەوە، وەك ئەوەی لە پیسبوونی ژینگەی جیهاندا دەبینرێ.

ئەو پرسیارەی سەرلەنوێ دێتەوە مەیدان بریتیە لەوەی: ئایا فەلسەفە دەتوانێ چی بکات و چی لێ چاوەڕوان دەکرێت؟ گادامێر وەڵامدەداتەوە: ئەرکێکی گەورە هەیە ئەویش بریتیە لەوەی سەرەتا مرۆڤ فێربێت چۆن پرسیار دەکات. بەڵام دەربارەی هەموو شتێك نا، هەروەها دەبێ لە سەرەتاوە بە بنەما سەرەکیەکانەوە پابەند بێت و وا نەزانێ دەتوانێ بەردەوام بە ئاسانی زانیاری گرنگی دەست بکەوێ، چونکە وشەی "زانیاری" ئاماژەیە بۆ شتێك و پێویست ناکات مرۆڤ زیاد لە پێویست بیر لەو شتە بکاتەوە. دووەمیان (کە گرنگترە) ئەوەیە کە مرۆڤ چۆن دەتوانێت رۆحی پرسیارکردن لە خەڵکیدا زیندوو بکاتەوە؟ وەڵامدانەوەی ئەمەش ئاسانە:

پێویستمان بە پرسیارکردنە، هەمیشە جۆرێك حەزکردن لە زانین (فضولیة) لەناو مرۆڤدا هەیە. باشتر وایە پرسیارکردن لە قۆناغی لاوێتیەوە دەست پێبکات، لە نێوان تەمەنی (14–18) و نابێ زانستێکی ئامادە بەسەر ئەو لاوانەدا بسەپێنرێ، بەڵکو دەبێت بایەخدان بە پرسیارکردنی فەلسەفیان تێدا زیندوو بکرێتەوە.

گادامێر خۆی عادەتی بوو زۆر زۆر سەردانی یەکێك لە قوتابخانە ناوەندیەکانی ئەڵمانیای دەکردو لێکچەری ئاسان و سادەی دەربارەی فەلسەفە پێشکەشی قوتابیان دەکردو لە بارەیەوە گفتوگۆی لەگەڵ دەکردن. ئەو پێی وابوو باشتر وایە خەڵکی لەو تەمەنەدا فێربکرێن و تێبگەیەنرێن. ئەگەر فەیلەسوفی ئاساییش بایەخێکی تایبەتی بە فەلسەفە نەدا ئەوا ڕەنگە دەبەنگەکان زیاتر بایەخی پێبدەن، بەڵام لەگەڵ جیاوازیدا: دەبەنگەکان توانای وەڵامدانەوەی پرسیارە فەلسەفیەکانیان نیە، بەڵام فەیلەسوفەکان (ئەگەرچی ئەو توانایەی هەیانە زۆر لە توانای ئەوان کەمترە) ئەتوانن بڵێین بۆچی ناتوانن وەڵامی ئەو جۆرە پرسیارانە بدەنەوە.

وەك گادامێر ڕای وایە زۆر کەس سڵ لە فەلسەفە دەکەنەوە چونکە وا باسی لێوە دەکرێ کە میتۆدێکە بۆ زانستەکان یا تیۆرەیەکی زانستیەو پەیوەندی بە لۆژیکەوە هەیە، ئەمەش تەنها بەلاغەیە.

بەهەرحاڵ گادامێر هەڵوێست بەرامبەر لۆجیك وەرناگرێ، چونکە لۆجیك و بیرکردنەوەی زانستی واقیعی ژیان تەرجەمە دەکەن و دەبێ لۆجیکستەکان ڕازی بن بەوەی کە گفتوگۆ کردن هەمیشە بەشێوەیەکی لۆجیکی تەوزیف ناکرێ و هەمیشەش لۆجیکی نیە.

ئەرکی فەلسەفە، یا وردتر بڵێین ئەوەی لێی چاوەڕوان دەکرێ لێرەدایە: پاڵ بە ئاین و ژیارەکانەوە بنێت بۆ دیالۆگ و تێگەیشتن لە یەکتری، چونکە ئیدی ئەمڕۆ جیهان چاوەڕوانی فریادڕەسێك یا ئەڵتەرناتیفێکی پێناکرێت. ئەرکی فەیلەسوفەکانیش ئەوەیە بە ئاشکرا لێکی بدەنەوە کە ئەو شتەی چاوەڕوانی دەکەن بەدی نایەت، چونکە ئێستا مەسەلەکە جیاوازە و ئەوەی لە مرۆدا هەموو جیهان باسی لێوە دەکات مافی مرۆڤە. لە لایەکی دیکەشەوە گادامێر باس لە ئاین و سروتەکان دەکات ئەمەش لە هەوڵداندا بۆ چاککردنەوەی ناوبانگی کە ئەمڕۆ تەواو خراپ بووە.

ئەوەش ئاسانە چونکە تا ئەمڕۆش ئاین و سروتەکان ڕۆڵێکی گرنگیان هەیە لە ژیاندا، هەروەها دەبێت مرۆڤ پراکتیزەیان بکات تاوەکو فێربێت چۆن بیر لە شتە گرنگەکانی وەك مەرگ و لە دایکبون دەکاتەوە، لەبەر ئەوەی ئەمانە وروژێنەری گرنگترین پرسیارەکانن.

وەك چۆن زاناکانی لاهوت کاردەکەن و ژیانیان بە [illegible] بەسەر دەبەن، دەبێ مرۆڤیش باری قورسی سەرشانی خۆی هەڵبگرێ کە (فێربوون)ە.

*سەرچاوە:*

*ڕۆژنامەی (الحیاة)، ژمارە (13766)– 2000/11/19.*

# هەڵبژاردن لەنێوان تاریکی و ڕۆناهیدا* ..

■ سەلمان ڕوشدی

● و.پەراوێزکاری: ئیسماعیل حەمە ئەمین

موحەممەدی کوڕی عەبدوڵا پیاوێکی بلیمەتی مەزنی مێژووی مرۆڤایەتی بووە، بازرگانێکی پاك و سەرکەوتوو بوو، هەروەها سەرکردەیەکی جەربەزەو پیاوێکی دەوڵەتی زیرەك بووە، سەرەڕای پەیامنێرێتی خودایی لەسەر زەوی، هەمیشە وەك مرۆڤێك لە گۆشت و خوێن جەختی لەسەر پەیامنێرێتی خۆی کردووە، لەبەر هەمان هۆ بووە هەرگیز رێگەی نەداوە وێنەی بکێشرێ، نەوەکو لە داهاتوودا وێنەکەی وەکو بت بپەرسترێ. *ئەو تەنها پەیامنێر بووەو دەبێت تەنها پەیامەکەی پیرۆز بکرێ.*

دیارە هاتنەخوارەوەی رەوشی خودایی (الوحی) پابەندبووە بە ئازارو تێکدانێکی رۆحی گەورە، هەندێ جار گوێی لە دەنگی سەیر سەیر دەبوو، زیندەخەون و زیندە وێنەی دەبینی، خۆ گوتەنی: وشەکان لە نێو قوڵایی دڵیەوە پەنگیان خواردبوو، دەربڕین و فۆرمالیزەکردنی ئەو وشە خودایانە پابەندبوو بە ژوورانێکی بێکۆتایی رۆحیو جەستەیی، لەو ساتانەدا پێغەمبەر دەترسا ئاوەز لە دەست بدات، بەڵام خێزان و سەحابە بەئەمەکەکانی هاوڕێی، هێوریان دەکردەوەو دەیانگووت ئەوە بەخشینێکە لە بەخشینەکانی رەوشی خودایی. لێرەوە دەتوانین بڵێین ئاینی موحەممەد لە زۆر رووەوە لە کریست جودایە، لە ئیسلامدا پێغەمبەر ناگاتە پلەکانی خواوەند، کەچی لای کریستەکان، عیسا دەگاتە پلەکانی خودا. ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە ئیسلام کۆنوێژی (بەجەماعەت نوێژ بە جێهێنان) ناکاتە مەرجێکی سەرەکی بۆ وەستان بەرامبەر بە میهرەبانی خودا، موسوڵمانان بە ئاسانی، بەبێ بوونی مەرجی سەختی نێوەندێك، لە هەموو شوێن و کاتێکدا دەتوانن بەرامبەر خودا بوەستن، لە ئایینی ئیسلامدا هیچ بەربەستێك نییە لە نێوان خوداوەندو مرۆڤ، خوداوەند

بەردەوام لەگەڵ بونیاندا درێژ بوونەوەیەکی زیندەگیانەی هەیە. بەداخەوە لە ڕۆژانی ئەمڕۆدا چەردەیەك پیاوی دەسەڵاتخواز دەستیان گرتووە بەسەر ئیسلامدا، ئەوانە ئێستا پۆلیسی بیری هاوچەرخن، ئەوانە پێغەمبەری خودایان کردۆتە بونەوەرێکی تەواوکاری سیفەت خودایی، ژیانی ئەویان کردۆتە ژیانێکی ئایدیالی و ڕەوشی خودایشیان کردۆتە ڕووداوێکی بێ کێشەو گرێی پیرۆز، کە ئەمەش بە تەواوەتی پێچەوانی ڕاستیەکانە، هەر ئەوەندە نا بەڵکو ئەمانە کەوتنە داتاشینی تابۆکان (نەکردەکان)، تا ئەو ڕادەیەی بواری ئەوە نەما مرۆ پێغەمبەر وەکو مرۆیەك لە گۆشت و خوێن تەماشا بکات، مرۆیەك وەکو هەموو عەبدەکانی خودا خاوەنی لاوازی و سیفەتی مرۆیی خۆی بێت، بە هەمان مێڵی تەریبیش ئیسلام وەکو دیاردەیەکی مێژوویی زەمەنی خۆی توانای وتوێژ لە خۆ بگرێو تاوتوێ بکرێت، وەك دیاردەیەکی ئایدیۆلۆژی و مێژوویی لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەنجامبدرێ. ڕۆمانەکەم (ئایەتە شەیتانیەکان) سنووری ئەو تابۆیانەی بەزاند، سنوورێکی دیکەی بەزاند، ئەویش سنووری شوێنانی ئافرەتە لە کۆمەڵگەی ئیسلامی و قورئاندا، لەبەر ئەو سنور بەزاندنە *ڕۆمانەکەم بە لەعنەتکراو سوتێنرا*.

پاڵەوانی ڕۆمانێکم -دکتۆر ئادەم عەزیز- باوەڕو ئیمان لەدەست دەدا، (کەلێنێکی گەورە دەکەوێتە دەروونیەوە، کەلێنێك بۆشاییەکی ترسناك لە ژوورێکی نێوەکی..)[٢]، منیش وەکو پاڵەوانی ڕۆمانەکەم خاوەنی ئەو کەلێنە گەورەیەم، ئەو کەلێنەی من شێوەی خودای وەرگرتووە.

جا لەبەر ئەوەی هەموو ڕەها ئاینیەکانم لا ناوازەو قبوڵناکرێ، بۆیە هەوڵم داوە ئەو کەلێنە بە ئەدەب پڕ بکەمەوە.

لەم سەرەتایەوە من شانازی بەئەدەبی ڕۆمانەوە دەکەم وەکو چۆن کتێب سوتێنەرەکانی برادۆق شانازی بە موسڵمانێتیە شەڕانگێزیەکەیانەوە دەکەن، ئەدەب شوێنی مەبەستمە بۆ



سەلمان روشدی

دۆزینەوەی گەورەترین پلەی بەهای کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی، کێشە دەروونیەکانی، دۆزینەوەی راستیەکانی چیرۆك و خەبات و دڵ، هەر بۆیە بەشەرهاتن لەسەر (ئایەتە شەیتانیەکان) بەشێوەیەك لە شێوەکان بەشەرهاتنی دوو بڕوایە، دیارتر بڵێم شەڕی نێوان دوو زمانە، وەکو چۆن پاڵەوانی خەیاڵی ڕۆمانەکەم سەلمان (مەبەستی سەلمان فارسییە- وەرگێڕ) دەربارەی پێغەمبەر (ماهوند) دەڵێت (قسە رەوشخوازییەکانی ئەو لە بەرابەر قسەکانی من وەستاوە).

لە راکێش راکێشی ئەمشەڕە قسەیەدا پارێزەرانی رەهما ئاینیەکان چەندەها دڕێیان بەنێو رەدوو کەوتووەکانی خۆیاندا بڵاوکردۆتەوە، کە گوایە من پێغەمبەرم بە شەیتان چواندووە، ناوی ماهوندم لە جیاتی ناوی محەمەد بەکارهێناوە، سەیر لەوەشدایە هەموویان باش دەزانن کە ناوی ماهوند لە داهێنانی من نییە، بەڵکو داهێنانێکی قێزەوەری ناوناتۆرییەکانی خاچپەرستەکانی ئەوسا بوو، بە پێغەمبەریانەوە لکاندبوو، بەڵام من لە ڕۆمانەکەمدا ئاماژەم بۆ ئەو ناوە کردووەو بەم شێوەیەی خوارەوە ئەم ناوە ڕووندەکەمەوە.

(قڵپکردنەوەی ناووناتۆرەکان بۆ هێزێك، ویگز[2] و تمریز رەشەکان بڕیاریاندا ئەو ناووناتۆرانە بەسەریەرزیەوە بکەن بە لەقەبی خۆیان و شانازی پێوە بکەن، لەبەر ئەوە تەنیا گۆشەگیرەکەمان، ئەوەی بەسەر کێوەکاندا هەڵدەزنا، بۆ ئەوەی ببێت بە پەیامنێری خودا دەبێت بە.. ماهوند)[3].

دیارە هەر تەنها ناوی ماهوند بەر هێرشی کوفر ریزە -تکفیر- نەکەتووە بەڵکو ناوی ڕۆمانەکەش لە خانەی کوفرکرندا جێی بۆ دانرا، بەڵام نیوەڕۆکی ناوی ڕۆمانەکە لە منەوە سەرچاوەی نەبەستووە، بەڵکو لە -تەبەری- وە هاتووە کە ئەویش سەرچاوەگیریەکی بڕواپێکراوە وەك زانایەکەی ئیسلام، لێوەی وەرگیراوە کە دەفەرموێ (لما رای رسول الله صلى الله عليه و سلم تولي قومه عنه.. كان يسره، مع حب قومه أن يلين له بعض ما غلظ عليه من امرهم)

بەم شێوەیە موحەمەد ئەم ئایەتانەی ئاوا وەرگرت و بتە مێینەکانی مەکەی وەك خوای میهرەبان لە تەنیشت خوای خۆیەوە قبولکرد[4] بەهۆی ئەو قبولکردنە کاتیەی خوداکانی مەکە، خەڵکی لە موحەمەد نزیکبوونەوەو دڵتەنگیان ڕەویەوە، بەڵام ئەوە لە دوای ئەو بەخشینی میهرەبانییەوە بە خوداکانی مەکە روویدا زۆر لەوە جوداتر بوو، موحەمەد غەمبار بوو، جوبرائیل فریشتە بە موحەمەدی گوت بڕیاری پەسەندکردنی خوداکانی مەکە لە تەنیشت خودای گەورەو تاك و تەنیا من نەبووم، بەڵکو شەیتان بوو شێوەی منی لەخۆ گرتبوو، هیچ رەوشێکی خودایی لە ئارادا نەبووە بۆ پەسەندکردنی ئەو بڕیارە کە من پێتی رابگەیەنم.

لەم ڕوونکردنەوەیەدا دەردەکەوێ بە یەککەیشتنێك هەبووە لە نێوان جوبرائیلی وەهمی و ئەو ئایەتە هەڵانەی کە خودا بتە مێینەکانی مەکەی پیرۆز کردووە، خاڵی جوانکاری لەوەدایە جوبرائیلی شارەزا لە کارە خوداییەکان، دڵنەوایی موحەمەدی کرد لەجیاتی سەرزەنشت، بەوەی زۆر لە پێغەمبەران بە درێژایی مێژوو و لەبەر چەندەها هۆی جوداواز تووشی ئەم جۆرە کێشەو هەڵانە بوون[5]. منیش لەو بڕوایەدام سەرلێشێواندنی محەمەد خەوشێك نییە، بە پێچەوانەوە مەزنێتی ئەو رادەگەیەنێ کە وەك عەبدێکی خودا هەڵە دەکات و دان بە هەڵەو سەرلێشواندنی خۆیدا دەنێت، ئەمەش هەمان رای فریشتەی خودا جوبرائیل بوو،

بەلام بەداخەوە دوژمنانی رۆمانەکە لە فریشتەی خودا دلڕەقتربوون.

توندڕەوەکان هەر بەوەوە نەوەستان و کەوتنە هەڵبەستنی بوختانی دیکە، بەوەی رۆمانەکەم رۆمانێکی پۆرنۆگرافیە (رووتبازی) و لەلایەکی دیکەوە رۆمانێکی دژە سامیە -ألاسامیة-، لەبەر ئەم دوو هۆیە داوای قەدەغەکردنی رۆمانەکە دەکەن، بەلام جوداوازی فیکری مانای رووتبازی و رەگەزپەرستی ناگەیەنێ، ئەم رۆمانە نە رۆمانێکی رۆتنامانجەو نە رۆمانێکی رەگەز پەرستیشە، بەڵکو هەوڵدانێکە بۆ تێگەیشتن و پێشکەشکردنی روانینێکی زانستیانەی ئاینێکی مەزنی ئەم جیهانە. ئاشکراشە دەبێت لە پێناو ئەمەشدا لەژێر رۆشنایی (یاسای پاراستنی کەمایەتیەکان) دادگایی بکرێم، بەتۆمەتی -خراپەزمانی- الاساءة- بخرێمە نێو تاوتوێی نەزمی (یاسای ئاسایشی گشتی).

بەلام ئەوەی دەمەوێت جەختی لەسەر بکەم ئەوەیە، کە ئەوەی بە کەڵکی سانسۆرکردن نایەت خراپەزمانیە، گەر وابێت ئەوا سەریەستی رادەربڕین دەبێتە رستەیەکی بێمانا.

دیارە زۆر لە ئێمەش بەئاگرە هەلایساوەکانی برادفۆ بێزار بووین، چونکە هەستمان کردە خراپکاری و خراپەزمانی بە توندوتیژیەوە لە دژی بیروباوەڕەکانمان پراکتیزە کراوە، لانی کەم بەرامبەر بۆتەوە لەگەڵ ئەو خراپەیەی کتێب سووتێنەرەکان پێیان وایە بەرامبەریان کراوە.

بەداخەوە جیهانی ئیسلامی ئیمڕۆ پڕێتی لە رەقیی جۆراو جۆر، زۆر لە نوسەرە باشەکانی ئەم جیهانە، یان بە تۆبزی قڕوقەپیان پێکردون یاوەکو ناچاریان کردون بە ملدان و هەڵبژادنی تاراوگە، -دیارە چیدی شێوە هونەرە پێچاوپێچەکانی جوێسیش[6] لەم رۆژگارەدا بێ سوودە-، بەهەمان پێوانەش بوونی چەندەها ئەندامی ناوچەیی و پەرلەمانی حیزبی کرێکارانی بریتانی لە برادفۆرو وستمنسر، بۆ یەکخستن و پشتگیری هێزیان لەگەڵ مەلاکاندا، جێی داخێکی گەورەیە[7]، ئەمە لە کاتێکدایە کەسانی وەکو (بریان سیدجمون) و (ماکس مادن) و (بیرنی گرانت) و ئەندامی لیژنەی ناوچەیی (موحەمەد عەجیب) لە جیاتی داواکردن بۆ لابردنی سانسۆر بە ئاشکرا داوای فراوانکردنی چەمکی دەستڕۆشتوویی -پلاحیات- یاساکانی سانسۆر دەکەن. ئیدی کاتی ئەوە هاتووە پارتی کرێکاران لە بەرامبەر ئەم داواکاریانە بێبەری بوونی خۆی لەم رایانە بە روونی ئاشکراکات.

من پێموایە ئایەتە شەیتانیەکان رۆمانێکی دژە ئاین نییە، بەقەد هێندەی هەوڵدانێکە بۆ نووسین لەسەر تێکچوون و کاریگەریەکانی کۆچکردن لە دیدی کۆچکردووەکانی نیمچە کیشوەری هیندستانەوە تاوەکو ئینگلتەرا. ئەو کارە لای من گەورەترین جوداکاریە، بەوەی دوای پێنج ساڵ خەباتکردن لە پێناو بەخشینی دەنگ بە قەوارەیەکی ئەفراندن بە رۆشنبیریەك، لە ژێر نێونیشانی (رۆشنبیری کۆچکردن) نێوزەد دەکرێت کە خۆم بەشێکم لەو ئەدەب و رۆشنبیریە، کتێبەکەم بێئەوەی بخوێنرێتەوە دەسوتێنرێ، لەلایەن ئەوانەشەوە دەسوتێنرێ کە رۆمانەکە باس لە ئازارو ژیانیان دەکات. بەداخەوە دەکرا ئەوانە لە دووتوێی خوێندنەوەیەکی قوڵدا زۆر لەو ئازارو خودناسینە بوونی خۆیان هەست پێکردبایە، من لەو رۆمانەدا هەوڵمداوە دژی ئەو شێوەخوازیە -نمط- بوەستمەوە کە رۆژئاوا بۆ مرۆی دنیای ئێمەی کێشاوە، بەلام بە کردەی توندڕەوانەر حوکمی کوشتن و کتێب سووتاندن، ئەوان زێدەتر

ئەو شێوە وێنەخوازییەیان لەمەڕ جیهانی ئیسلامیدا چەسپاند.

ئای چەندە شارستانیەتێکی پوچەڵە ! ! چەند بەسووکایەتیەوە کتێب دەسوتێنرێت.

کەسایەتی ڕۆمانەکەم لە زۆرانبازیەکی سەختی مەرجی مرۆبوونی خۆیانن، بە هەموو توانایانەوە هەوڵدەدەن لە بەرامبەر راستیە مەزنەکانی مردن و ژیان و خۆشەویستی و ژیانی رۆحیاندا بەیارمەتی و بێ یارمەتی خواوەند شێوەی مرۆیی خۆیان وون نەکەن، لە هەوڵداندان بۆ تەواوکردنی ئەو شێوازە مرۆییە بە سورمانەوە لە دەرەوەی ڕۆمانەکەم هێزە نامرۆییەکان لە زێدەبوونان و بەرەو داگیرکردنی نوێ بەرەو پێشێ مارشدەکەن.

یەکێك لە کەسێتی ڕۆمانەکەم دەڵێت (بەرەکانی شەڕی روناکی و تاریکی، زانست و ئاین لە هیندستانەوە تخویبەکانی خۆی دیاریدەکات، چاتر وایە بڕیاری شەڕکردن لە بەرەیەکیاندا بدەیت) جا لەبەر ئەوەی ئەم شەڕە بەرەو ئینگلستان کشا، بۆیە هیوادارم ئامادە نەبوونی ئێمە لە گۆڕەپانەکەدا نەبێتە مەرجی دۆڕاندنمان، ئیدی کاتی هەڵبژاردن هاتووە.

*ئەم ووتارەی سەلمان روشدی پێش دەرکردنی فەتوای ئیمام خومەینی لە رۆژنامەی -ئۆبێرڤەر-ی بریتانی لە یانواری *1989* بڵاوبۆوە، دوای مانگرتنەکانی دژ بە رۆمانی ئایەتە شەیتانیەکان، لە براتفۆرد لەندەن، سەلماند روشدی ئەم بەرگریکردنەی بڵاو کردەوە.*

*ئەم ووتارە لەوەرگێڕانی (ممدوح عدوان) و پێداچوونەوەی جەلال سادیق عەزم و لوزتۆقان و مەمدوح عدوان خۆیەتی، ئەز لە کتێبی (-مابعد ذهنیة التحریم- صادق جلال العظم- ل 309)م وەرگرتووە بەڵام بۆ پەراوێزەکان گەڕاومەتەوە بۆ ووتارێکی دیکەی سەلمان روشدیو دەقی وەرگێڕداری ئایەتە شەیتانیەکان و منداڵانی نیوەشەو بە زمانی ئەڵەمانی کە لەلایەن دەزگای بڵاوکردنەوەی کناوەر پیپێرەوە بڵاوکراوەتەوە.*

## پەراوێزەکان:

1-روشدی ئەم بەشە بچوکە لە (ڕۆمانی منداڵانی نیوەشەو) وەرگرتووە کە کاتی خۆی لە ئێراندا خەڵاتی باشترین ڕۆمانی وەرگێڕدراو بۆ سەر زمانی فارسی وەرگرت، ئەم ڕۆمانە دەروازەی ناسینی ئەدەبی روشدی بوو بەدونیا، بۆ زێدە روونکردنەوە، حەزدەکەم جارێکی دیکە لە وەرگێڕانە ئەڵەمانییەکەی ڕۆمانەکە، ئەم بەشە دووبارە بکەمەوە:

*(لە ژێر ئاسمانی بەیانیەکی کشمیری سەرەتای بەهاری 1915، باپیرم ئادەم عەزیز لەکاتی نوێژ کردنیدا لوتی بەرگلکە بەردێکی رەق کەوت. سێ دڵۆپە خوێن لە کونی چەپی لوتیەوە گلۆر بوونەوەو لەبەریەك کەوتنیاندا لەگەڵ هەوای دارستاندا، رەقبوون، لەبەرچاوی باپیرم و لە پێشی بەرماڵەکە بوون بە یاقوتی سوور.*

*لەکاتی سەرهەڵبڕینیدا هەستی کرد فرمێسکەکانی بە برۆیەوە رەقبوون، لەو چرکەساتەی ئەو بەقێزەوەریەوە مرواریەکانی لە برۆکانی دەکردەوەو بڕیاریدا لە ژیانیدا نە بۆ مرۆڤ و نەبۆ خودا دانەوێتو زەوی ماچ نەکات ئەم بڕیارە کونێکی گەورەی لە ئادەم عەزیزدا دروستکرد، کەلێنێك لەنێو گرنگترین ئۆرگانی ژیانیدا درزی تێکەوت..) سەلمان روشدی- منداڵانی نیوەشەو- وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی ئەڵەمانی لەلایەن خانەی بڵاوکردنەوەی پیپێروکۆ 1981- ل 12.*

*Salman Ruschdie- Mittemachtskinder- R. Pieper & Co Verlag- Munchen Zurich 1981- seite 12.*

2-تۆریز (*Tories*) ناتۆرەیەکە لە سەدەی حەڤدە لە ئینگلاند بەوانە لکێنرا دژی هاتنە سەر تەختی پاشا جیمسی دووەم بوون، هۆیەکەی ئەوە بوو جیمسی دووەم کاسیولیك بوو ئەم ناوە لە ووشەیەکی ئێرلەندی رەچەڵەکەوە چەکەرەی کردووەو لە دوایشدا بۆتە ناوی سەرزارەکی حزبی پارێزگارانی ئینگلترا، هەروەها ویگز (*Whigs*) ناتۆرەیەکی دیکەی سەدەی حەڤدە بەسەر تایەفەیەکی بەرهەڵستکاری سکۆتلەندیەوە لکێنراو لە دوایشدا بووە نازناوی حزبی لیبراڵی ئینگلیزی.

3-بەگشتی سەلمان روشدی مەبەستی ئەوەیە کە زۆر ناو و لەقەب هەیە لەلایەن ناحەزانەوە بە میللەتان دەلکێنرێ، بەڵام لە چەند

بنچینەیەکی مێژوویدا ئەو ناوناتۆرانە دەبن بە شانازی بۆ ئەو کەسە یاخود گروپە کۆمەڵایەتییە، نمونەی ڕەشەکان نمونەیەکی دیارە سەلمان روشدی پشتی پێدەبەستێ: گەر لە سەردەمی کۆیلایەتی یاخود لە ئەمەریکای جاراندا بە پێست ڕەشێکت بگوتبایە تۆ ئەی ڕەش، ئەوا لە ناخیدا هەستی بە برینداری دەکرد، چونکە سپی پێستەکان ئەو ناوەیان بە مەبەستی ناوناتۆرە بەکاردێنا، ئێستا گەر لە هەر شوێنێك لە ڕەشێك بپرسی تۆ چیت، کێیت، لە چ وڵاتێکەوە هاتوویت؟ لە یەکەم ڕستەدا بە شانازیەوە دەڵێت من ڕەشم، پاشان لە ڕەشێتی خۆیەوە خۆی پێناسە دەکات، قسەیەکی بەناوبانگ هەیە کە دەڵێت من ڕەش و جوانکیلەم، دیارە ئەم گۆڕینەی جنێو و ناتۆرە بۆ شانازی خاڵێکی گۆڕانکاری جوانی سروشتی مرۆڤە لە مامەڵەیدا لەگەڵ نەیارو دژەکانی، بەکارهێنانی ناوی ماهوندیش لە ڕۆمانی ئایەتە شەیتانیەکان لەو گۆڕانە ئیستاتیکیەی نێوان ناتۆرەو شانازیەوە سەرچاوەی هەڵگرتووە کە ئەقلیەتی ئسولی لەبەر تێنەگەیشتنی لە جەوهەری ئاین و ڕەوشی خودایی بە کوفرو خراپەکاری تێدەگات. من لێرەدا حەز دەکەم ئەو بەشەی کە لە عەرەبیەوە وەك ئەمانەتی نوسینەکە وەرمگێڕاوە، لە بەرابەریدا وەرگێڕانێکی هەمان بەش دانێم، بۆیێ بە جوانترم زانی ئەو بەشە جارێکی دیکە لە وەرگێڕانی ڕۆمانەکە بۆ سەر زمانی ئەڵەمانی، لە ئەڵەمانیەکەیەوە بیکەمەوە بە کوردی بۆ ئەوەی خوێنەر لە بەردەم هەڵبژاردنی دوو وەرگێڕاندا بێت، کە زێدەتر مەبەستی نووسینەکە ڕوونتر دەکاتەوە، ئەم بەشە بەمجۆرەش وەردەگێڕدرێت:

(ئەو نە موحەمەدە نە مۆهەمێد، نەخێر لە جیاتی وی ناسنامەی شەیتانیان پێبەخشیوە، ئەو ناتۆرەیەی کە فەرەنگەکان لە ملیان ئاڵاندووە دەبێت بە مێزێکی لە بن نەهاتوو بۆی، وەکی چۆن ویگز و تۆریس و ڕەشەکان بڕیاریاندا ئەو ناوانە بە شانازیەوە لە خۆ بنێن، بۆ قێزەوەرکردنیان پێوەیان لکێنرابوو؛ لەسەر هەمان ئاست و شێوە، شاخەوانمان، پەیامبەرمان، تاکە جەنگاوەرمان، ئەو گۆشەگیرەی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا منداڵانیان پێدەتۆقاند، بووە بە ڕەمزێك بۆ شەیتان، ماهوند..) ئایەتە شەیتانیەکان– وەرگێڕانی بۆ زمانی ئەڵمانی لەلایەن دەزگای بڵاوکردنەوەی کناوەر، چاپی *1997*– ل *128*.

*Salman Ruschdie- Die satanischen Verse- Knauer Verlag- Munchen 1998- Seite 128.*

*4*–لەبەر ئەوەی ئیسلام وەك دۆزێکی سیاسی و ناسیونالیش تەماشا دەکرێت، چ لەلایەن ئەوەی بنەماکانی کردنی عەرەبە بە دەوڵەت و هاوکۆیی نەتەوەیی ئەوان لە ئیسلامەوە خۆی تیۆرەڕێز دەکات، چ لە ڕووی ئەوەی بزوتنەوەی ئیسلامی لە سەردەمی پێغەمبەردا بۆ نزیکبوونەوەو هاوتەرازیی هێزەکانی پێویستی بەو جۆرە تاکتیکانە هەبووە، هەر لە پەنابردنە بەر مەلیکی حەبەشە کە کریست بووە تاوەکو ڕێکەوتنامەی حودەیبیەو ژن و ژنخوازییەکانی موحەمەد لە عەشیرەتەکان بە مەبەستی ڕاکێشانی هێزەکان بۆ لای خۆی وەك هێزێکی سیاسی و عەسکەری، ئەمانە و زۆر شتی دیکە ئەو ڕاستیە دەسەلمێنن پێغەمبەر هەر لە زەمەنی بتەکانەوە بە ژیریی و دبلۆماسیەتێکی کەسی ناسراوە: بۆ نمونە هەڵبژاردنی زەمەنی حەجی ئەوساکەی عەرەب بۆ مەکەی بتەکان، بۆ ئەوەی باسی ئاینی تازەیان بۆ بکات، هەڵبژاردنی کاتێکە موحەمەد دەیویست سوود لەو هەلە وەرگرێ کە هەموو هۆزە دوورو نێزیکەکان بە مەبەستی حەج دێن بۆ مەکە، چ نەبێت دەتوانێت خۆی وەك پەیامنێرێك و نامەکەشی وەك سەرەتایەك لەنێو خەڵکدا بڵاوبکاتەوە، نمونەیەکی دیکە هەوڵدانێتی بۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلام لە تایف کە شارێکی گرنگی کشتوکاڵی ناوچەکە بووە، جگە لەوەی ئەم شارە بە شارێکی جوان و قەشەنگ ناسراوە، هەرچەندە لەوێ بەردەباران کرا بەڵام هەوڵدانێکی ئازایانە بوو بۆ خۆکردن بە ئەفسانەو بە چیرۆك کردنی ئاینی تازە لە نێو خەڵکانێکدا حەزیان لە شیعرو گێڕانەوەی حکایەتی ئازایەتی و حیکمەتە. دۆزینەوەی خاڵی هێزو لاوازی لە شتەکاندا سیفەتێکی پەیامنێر بوو، خاوەنی ڕۆحێکی نەرم لەکاتی خۆیدلو پیاوی بەزەبر لە زەمەنی دەسەڵاتدا، دیارە تەبەریش باسی بەشێك لەو حیکمەتە پێویستەی پیاوێك دەکا گەر خاوەنی ئەو ژیریە نەبوایە نەیدەتوانی لەنێو

مەکەی نقوومبوو لە ژیانی بت و فرەخودایی و مۆزگەراییدا خۆی وەك ئەمین و ئاینەکەشی لە ڕێگەی بانگەشەی پەیامبەرێتییەوە بڵاویکاتەوە، بوونی چەندەها کەسی غەیرە عەرەبیش وەك هاوەڵی خۆی هەمان ئاسۆی دووری، روانینی ئەوی بۆ ئیسلام پێکاوە، چەندەها سەحابەی پیرۆزی وەك جابانی کوردی و بیلال حەبەشی و سەلمانی فارسی رۆڵی مێژووییان لە بڵاوکردنەوەی ئیسلامدا بینیوە، سەلمانی فارسی فیگورێکی گرنگی رۆمانەکەی روشدیە، رۆڵێکی سەنتراڵی هەیە لە زۆرانبازیەکاندا.

5-لێرەدا سەلمان روشدی باس لە بەشێکی رۆمانەکە دەکات، کە ماهوند لەسەر رۆشنایی راوێژکاری جوبرائیلی فریشتەی خودا لە کەعبەدان دەنێت بە خوداکانی مەکە لات و عوزەو مەنات، بۆ هیچ نا لەبەر ئەوەی بەشێوەیەکی تەکتیکی خەڵك لەخۆی نێزیك بخاتەوە، ئاسان نەبووە دوای ئەم هەموو ساڵەی پەرستنی بتەکان و بڕوایی فرەخودایی، خەڵکی لەپڕ بڕوا بەیەك خودا بێنن لەلایەن تاکەکەسێکەوە بانگەشەی بۆ بکرێت بە هەتیوی گەورە بووەو بە پارەی خێزانەکەی توانیویەتی بازرگانی بکات، خودایەك لەلایەن ئەوەوە بانگەشە بکرێت وەك خۆی هەتیو و تەنیا، نەك لەلایەن دەزگایەکی دینیەوە کە هیندو ئەبوسفیانی دەوڵەمەند سەرپەرشتی دەکەن، من لێرەدا دیسانەوە سەرنجی خوێنەر بۆ ئەم گفتوگۆیەی نێوان ماهوند و هیند رادەکێشم، کە خاڵی قورسی رۆمانەکە لەنێو خۆیدا گرێچن دەکات: / (پێمان بڵێ لە ئایەتەکانتدا باسی لات و عوزەو سێهەمین خودا مەنات کراوە). هیند ئەمەی گووت و لە گەڵیشیدا هەموو وەجاخزادەکانی یاهیلیا هەستانە سەرپێ، ماهوند بەردەوام بوو لەسەر خوێندنەوەکانی و بەچاوێکی بێدەنگەوە گوتی: ئەوانە خودای جەلیل و بەهرەمەندن و پاڕانەوە لێیان کارێکی داواکراوە.)

ئایەتەکان- ل 156

*Salman Ruschie- Die satanischen Verse- Knauer Verlag- Munchen 1998- Seite 156.*

روشدی لێرەدا جارێکی دیکە جەخت لە سروشتی مرۆیی پێغەمبەران دەکات، کە ئیسلام بە قوولیەوە بڕوایی پێیەتی.

6-مەبەستی لە رۆماننووسی ئێرلەندی بەناوبانگ جێمس جوێسە.

7-مەڵەیەکی گەورەیە لەو بڕوایەدا بین رۆمانەکەی روشدی تەنها لەلایەن رۆژهەلاتی و موسڵمانەکانەوە بە لەعنەتکراوەو دژەکاری کراوە، ئەم رۆمانە لەهەمان کاتدا رۆمانێکی جوانی کێشەی ئەو بیانیانەیە لە رۆژئاوا دەژین و لەبەردەم چەندەها گرفتن: هەر سەیرکردنیان لەسەر بنچینەی راستیی و بەرچاوی رۆژهەلاتناسەکانی سەدەی نێوەڕاستەوە تاوەکو پێوەلکاندنی چەندەها ناوروناتۆرەو گرفتی بیرۆکراتی زەقکردنەوە لە بەردەم بە ئاسایی تێپەڕبوونی رۆژەکانیان وەك مرۆیەکی ئاسایی ئەو کۆمەڵگەیە، ئەمانەو چەندەها مێڵی دیکە لەمەڕ کۆچکردن و کۆچشوێندا، تەوەرەیەکی دیکەی رۆمانەکەیە لە تەوەرە جودا رەنگ و ئاڵۆزەکانی، لەم بارەیەوە روشدی لە وتارێکی بەرگریکردن لەخۆی و رۆمانەکەیدا کە بەنێوی -بەنیەتێکی پاکەوە- یە دەڵێت:

(دوای تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر کێشە هەلایساوەکان، مۆکۆیونگی رۆژنامەنووسی گاردیان لاونیو لەسەر لێوارەکانی رەگەزپەرستی کەوتە جوڵەو گوتی گەر موسوڵمانانی ئینگلتەرا نێوەیان بەدڵ نییە دەتوانن بڕۆن، ئەو بێپەردە گوتی (گەر -دانگام- تان بەدڵ نییە، فەرموون بڕۆن بۆ تاران؟).

لە هەمان گوتاردا روشدی ئاماژە بۆ مێژوونووسێکی لۆردی ئینگلیز دەکات کە ناوی لۆرد -دیکر-ە، روشدی دەڵێت (ئەو بەکارێکی باشی زانیوە لە کۆلانێکی تاریکدا تێلاترین بکرێم).

*سەرچاوە:*

1-العظم، صادق جلال= مابعد ذهنية التحريم- دار المدي للثقافة و النشر- دمشق- الطبعة الأولى سنة 1997.

2- *Salman Ruschdie- Die satnischen Verse- Knauer Verlag- Munchen 1998*

3- *Salman Ruschdie- Mitternachkskinder- R. Pieper & Co Verlag Munchen Zurich 1981*

# پاش نوێگەری.. پاش رەخنە

■ نووسینی: دایڤید لۆج

● و. لە ئینگلیزییەوە: عەتا

پاش نوێگەری لەم دواییانەدا بووە بە زاراوەیەکی بیستراو لە توێژینەوەی رۆشنبیریداو لە دوو باردا بەکاردێت، وەکو رێگایەکی شیکردنەوەی وەسفیانەی ریبازی رێکسختنی حەقیقەتی هاوچەرخ و دیسان وەکو تیۆرێك لە بارەی ئەو حەقیقەتەوە. ئەم زاراوەیە لە توێژینەوە ئەدەبییەکاندا نوێ نیەو لەمێژە بەکارهێنراوە ئەویش بە مەبەستی ئاماژەکردن بۆ شێوە رۆمانێکی نوێ و سەرنج راکێش (کە بە ئەڤۆنت گاد) ناودەبرێت کە بە شێوەیەکی سەرەتایی لە سالآنی شەستەکاندا لە ئەمەریکا دەرکەوتووە (بڕوانە لۆج 1977) ئەم ئەدەبە بە خود- پێچەوانەکردنەوە جیاکراوەتەو کە شانۆییەکە بە رواڵەتەکانی رۆمانەوە، شان بە شانی گومانگەرایی سەبارەت بە ئیدعاکانی ریالیزم و نوێگەری بۆ پێشکەش کردنی حەقیقەت لە دەقە ئەدەبییەکاندا. لەگەڵ ئەوەشدا کە خاسیێتە بالآدەستەکانی ئەم رۆمانە هەندێ هاوشێوە بوون بۆ تیۆری رەخنەیی پاش نوێگەری هەڵدەگرێت، بەڵام ئەم خاسیێتانە گۆڕانکارییەکی جیاوازو زۆر فراوانی تێدا دەکرێت، ئەویش لە رێگای پیادەکردنی بەکارهێنانیەوە بۆ پێکهاتنی گشتی رۆشنبیری.

رابەرە دیارەکانی پاش نوێگەری جان بۆدریلارد و لیوتاردو فریدریك جامسۆن دەربارەی ئەو خاسیێتانەی رۆشنبیری هاوچەرخ دەنووسن کە بە ئاشکرا ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن ئەو گۆڕانکارییەی کە لە چۆنێتی رێگای حەقیقەتدا پێکدێت رویداوە. هەریەکە ئارەزوو دەکات بۆ جەخت کردن لەسەر دیاردە جیاوازەکان کاتێ کە باسی سنووردانان بۆ ئەم گۆڕانکارییە بکرێت، بەڵام لە بنەمای تیۆری پاش نوێگەریدا ئەو دان پێدانانە جێگیر دەکرێت کە ئێمە لە رۆشنبیرییەکی فرە (دەنگی‌دا) دەژین. ئێمە چوار دەورمان دراوە

بە شێوازو شێوەو گوتارو گێڕانەوەی جۆراوجۆر و ئێمە ئەمانە بەکاردێنین وەکو شێوازی جۆراوجۆری ژیان و مەعریفەو ئەو چیرۆکانەی دەربارەی جیهان و ئەو مۆدیلانەی کە خۆمان لە بارەی حەقیقەتەوە پیشنیاریان دەکەین بۆ خۆمانی دەگێڕینەوە. جامسۆن سالی **1984** جەخت دەکات کە نابێت پاش نوێگەری وەکو تاکە شێوازێکی تایبەتی سەیر بکرێت لەنێو زۆر شێوازی تردا (هەروەك زەمانی پاش نوێگەری هەبوو) ئەوەش زیاتر تێکڕای سیمای شێوازەکانە کە لە بواری ڕۆشنبیریدا ناوەندێکی زیندووە. لیوتارد لە سالی **1984**دا هەستکردن کۆنترۆڵ دەکات، ئەگەر ئەزموونی زیندوی ڕاستەقینەی ئەم فرە دەنگی‌یە لە ئارادا نەبێت.

جۆراو جۆرێتی پلەی سفری ڕۆشنبیری گشتی هاوچەرخ. کەسێ گوێ دەگرێ لە مۆسیقای هیندە ڕۆژئاواییەکان، سەیری ڕۆژئاواییەك دەکات، خواردنی ماکدۆنیالد لە ژەمی نیوەڕۆدا دەخوات، بۆ ئێوارەش کۆیزنی ناوخۆیی دەخوات، جل و بەرگی عەتراوی پاریسی لە تۆکیۆ و ریترۆ و لە هۆنك کۆنك لەبەر دەکات، بۆ ئەو زانیاری بابەتێکە بۆ یارییەکانی تەلەفزیۆن.

جیاوازی و فرە جۆری شێوازەکان لە شانۆیدا، لە ڕۆشنبیری هاوچەرخدا دەبێت حالەتێك دروست بکا کە دەناسرێتەوە بە بوونی بەشی بچووك بچووك و هەروەها بەهۆی قورسی دانانەوە لەسەر ڕووکەشی دەرەوە. کاریگەری ئەو جۆرە جیاوازی‌یە لە شوێنێکدا کە هیچ شێوازێك باڵادەست نیە بەمەبەستی جوڵاندنێکی توندە بەرەو گومانێك کە ئیدیعاکانی هەر گوتارێك یان هەر چیرۆکێك هەقیقەت دەربارەی دنیا یان دەربارەی ڕوانینی دەسەڵاتیانە بۆ ڕاستی پێشکەشی دەکات.

هەندی پەیوەندی ئاشکرا لە نێوان تیۆرەکانی پاش نوێگەری و پاش بنیادگەری‌دا هەیە. بۆ نموونە جەخت دەکرێت لەسەر دال و پرسیارکردن و بە ڕێژەیی کردنی حەقیقەت و بەش بەشێتی بابەت، سەرباری ئەوەش جیاوازی گرنگ هەیە لە نێوانیاندا. پاش نوێگەری دەسەڵاتی (دال) فراوان دەکات بۆ ڕۆشنبیری بە گشتی و ڕێگا لە لەدەست چوونی زۆر ڕادیکاڵانەی مەدلول دەگرێو گومان دەخاتە سەر وەزیفەو توانای زمان بۆ ڕێکخستن و کۆنترۆلکردنی ماناکان لە دەسەلاتی سیۆسیۆ ڕۆشنبیریدا، پاش نوێگەری ڕۆڵی هێزە کۆمەلایەتیەکان ڕێك دەخاتەوەو هەمان شێوەی عەقلی ئایدیۆلۆژی قورسی دەخاتە سەر بەکارهێنان و وەکو شاتۆییەك دەیبینێ کە بە بەردەوامی ڕاڤەکردنی عەقلانیانەی تیۆری دوور دەخاتەوە.

لە گرنگی‌دانی سەرەتایی‌دا بە بواری ڕۆشنبیری، تیۆری پاش نوێگەری هێشتا پێویستی بەوەیە کە کاریگەرییەکی گرنگ لەسەر توێژینەوە ئەدەبییەکان دروست بکات. ئێمە ئەوەمان وەکو بەشی کۆتایی وەرگرتووە چونکە دەرکەوتنی ڕەخنەی ڕادیکاڵانەی ماوە تیۆرییەکان نیشان دەدات کە شایەتە بەسەر بیست سالی ڕابردوو یان زیاتریشەوە. ئەو ڕەخنەیەی ڕێگا لە تیۆری ڕەخنەیی بگرێت وەکو ئەو خەونە وایە کە شێوازی تێگەیشتن لە دنیا بە پێویست نازانێت.

***سەرچاوە:***

*David Lodge. Modern Literary Theory*

# فرانكشتاين..

## ئەفسانەو فەلسەفە

■نوسینی: عوسام زەکەریا

● و. لە عەرەبییەوە: باران

زانای ئەنترۆپۆلۆژی (کلود لیڤی شتراوس) لە شیکردنەوەکەیدا بۆ گرێی ئۆدیب دەڵێت: "بابەتی ئەفسانە بریتیە لە پێشکەشکردنی نمونەیەکی لۆژیکی بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیەك. بەڵام ئەگەر ناکۆکیەکە کردەگی بێت، ئەوا ئەم کارە جێبەجێ نابێت". رەخنەگری مارکسی- ئەمریکایی (فردریك جیمس)یش دەڵێت: "هەمیشە لایەنی مێژوویی بەرجەستە بکەن!" لەبەر رۆشنایی ئەم دوو پرەنسیپەشدا بیریاری فەرەنسی (جان جاك لوسێرکل) لە کتێبەکەیدا (فرانکشتاین.. ئەفسانەو فەلسەفە) لێکۆڵینەوە قوڵ و بەپێزەکەی لەسەر ئەفسانە یاخود رۆمانی (فرانکشتاین) و کۆپیە هونەریەکانی دیکەی لە سینەماو شانۆدا پێشکەشدەکات.

خاسیەتێکی تایبەتی ئەفسانەی (فرانکشتاین) لەوەدایە کە بە پێچەوانەی زۆربەی ئەفسانەکانمانەوە ئەفسانەیەکی میللی نیە، بەڵکو نوسەرو مێژوو، تەنانەت شوێن و جێگەی رووداوەکانیشی هەیە. لوسێرکل وایدەبینێ کە ئەمە هەڵێکی دەگمەن و دانسقەیە بۆ زانای میتۆلۆژیا کە ئەمجارەیان دەتوانێ بە تەواوەتی بەسەر بابەتەکەیدا زاڵ بێت و ئاگای لە پەرەسەندنی بێت.

فرانکشتاین کێیە؟ ئەگەر ئەم پرسیارەیان لێکردین راستەوخۆ ئەم وێنانەمان دێتە پێش چاو: مەسخێکە زۆر بە گران هەنگاو هەڵدەهێنێتەوە، کەم قسە دەکات و قسەکانی روون و ئاشکرا نین (لە جیاتی بەکارهێنانی وشەی ئاشکرا پرتەوبۆڵەی دێت).

نێوچاوانی زێدەکراوەو بەرینەو وەختە کرکراگەکانی قورگی بێنە دەرێ. بە کورتی: ئەو وێنەیەی کاریکاتێرو چیرۆکە وێنەدارەکان سەپاندویانە بەسەر زەینماندا: وێنەی (بۆریس کارلۆف) لە فیلمەکەی (جیمس وایل)دا کە رۆڵی مەسخەکە دەبینێ و لە ساڵی (*1931*)دا دەرهێنراوە. بەڵام کێ ئەوە دەزانێ کە فرانکشتاین ناوی مەسخەکە نیە بەڵکو ناوی خولقێنەرەکەیەتی کە (ڤیکتۆر فرانکشتاین)ە؟ کێ ئەوە دەزانێ کە مەسخەکە لە حیکایەتە راستەقینەکەدا لاڵ نیەو بە باشی قسە دەکات؟ ئەی کێ دەزانێ رووەك و گژوگیا دەخوات و شانازیش بەمەوە دەکات؟ ئەگەر ئەمانەمان لە یادچووبێتەوە لەبەر ئەوەیە کە ئێمە جگە لە (مەسخی ناو فیلمەکە، بکوژی منالاَن، ئەو درندە شەڕانگێزەی دەبێ لە فۆرمی سروتێکدا لە ئاشەکەدا بکوژرێ) هیچی دیکەمان نەبینیوە. هەروەها ئەوەشی کە بیرمان دەچێتەوە تەنها تێکستە سەرەکیەکە (یەکەم کۆپی تێکستەکە) نیە بەڵکو نوسەرو سەردەمەکەشە: کەم کەس دەزانن نوسەری ئەم تێکستە (ماری شیلی)یەو رۆمانەکە لە ساڵی (*1816*)دا نووسراوە. ئێمە بە راستی لە بەردەم ئەفسانەیەکداین: لە بەردەم چیرۆکێکداین کە بەردەوام تازە دەبێتەوەو هەندێ لە پاڵەوانەکانی (مەسخەکە، زانا شەڕانگێزەکە، دەزگیرانە شۆخەکە) و چەند دیمەنێکی فیلمەکە (تاوانی کوشتنی منالەکە) بوون بە کۆمەڵێ رەگەزی حەتمی. چیرۆکێك کە نە ئەسڵی هەیەو نە تێکستێکی تەواو، دەتوانی لە ئیتالیاوە بیبەیت بۆ ژاپۆن. چیرۆکێکی بێ چیرۆك کە رەگوڕیشەی لە هیچ باروێزخێکی مێژوویدا نیە. ئەمەش بە ئاشکرا لە فیلمەکەی (وایل)دا دەردەکەوێ کە کۆن و تازە بەیەکەوە گرێدەدات (کۆن کە گەڕانەوەیە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست و تازەش کە مۆرکی زانستی لەخۆ گرتووە).

**فرانکشتاین:** ئەو کەسە خورافیە گەورە و تازەیەی ناو قوڵایی سروشتی مرۆییانەی هەموومان، هەرزوو کەوتە دەرەوەی زەمەن و لە هەموو ئەو رووداوە مێژووییە شیاوانە رزگاری بوو کە پەیوەندییان بە لەدایکبوونیەوە هەیە. لە سەرەتادا (لوسیرکل) ئەو ژینگەیە شیدەکاتەوە کە ماری شیلی تێدا ژیاوە. ئەو سەر بە خێزانێکی بەریتانی بوو کە رۆشنبیرو نوسەرو خاوەن حەزو ئارەزووی سیاسی پێکیان هێنابوو، هەروەها پاشتر شوی کرد بە (بیرس شیلی) شاعیرو ئەمیش خۆی خەریکی سیاسەت بوو، بەر لەوەشی سۆشیالیزم سەرهەڵبدات کەسێکی بێئیمان و سۆشیالیستی بوو. رۆمانەکەی ماری شیلی (کە هێشتا لە تەمەنی نۆزدە ساڵیدا بوو نوسی) گوزارشت لەو بیروڕا سیاسیانەی ژینگەکەی دەکات، وەك چۆن گوزارشتە لە هەڵوێستی خێزانیی خۆی بەرامبەر باوك و مێردەکەی. بە رای لوسیرکل ئەوەی لە پشت هێزو تواناو نهێنی مانەوەی تێکستەکەوەیە ناکۆکیەکانی ناو تێکستەکە خۆیەتی. هەڵوێست بەرامبەر هەریەك لە زاناو مەسخەکەش لە سەروەی ئەو ناکۆکیانەیە. ئەم تێکستە دووبارەکردنەوەی ئەفسانەی فاوستە، ئەو زانا

شەڕانگێزەی ڕۆحی خۆی بە شەیتان دەفرۆشێ، لە لایەکی دیکەشەوە دووبارەکردنەوەی ئەفسانەی برۆمسیۆسە کە بە دوای مەقیقەتدا دەگەڕێت و ئاگری مەعریفە لە خواوەندەکان دەدزێت تا بیداتە مرۆڤ و لە بەرامبەر ئەم کارەشیدا سەختترین سزا وەردەگرێت و قبوڵی دەکات. لایەنی سێهەمیشی ئەوەیە کە ئەم تێکستە ئەفسانەی خولقانێکی ئایینیە وە بە شێوەیەك لە شێوەکان پەیوەندییە سێکسیەکانی ناو خێزانێك و ململانێی نێوان باوکان و کوڕان (بە پێی تیۆرەکانی فرۆید) دەگێڕێتەوە.

لوسیرکل لە سێ لایەنەوە لەم ناکۆکیانە دەکۆڵێتەوەو شیان دەکاتەوە:

1-ناکۆکیە سەردیەکە، چونکە تێکستەکە لە کۆمەڵێ گوتاری فەلسەفی و ئایینی دروستکراوە کە ئاوێتەی یەکدەبن و یەکدەگرن و لێکجیادەبنەوە.

2-ناکۆکیە مێژووییەکە، چونکە حیکایەتەکە بریتیە لە تۆمارکردنی هەڵوێستی نوسەرەکەی -هەروەها ئەو ژینگەیەی لێوەی هاتووە- بەرامبەر ئەو بارودۆخە مێژووییەی لە شۆڕشی فەرەنسیدا بەرجەستە دەبێ.

3-ناکۆکیە زاتیەکان یا خەیاڵە زاتیەکان لە عەقڵی ماری شیلیدا بەرامبەر خێزانەکەی.

لە (فرانکشتاین)دا ناکۆکیەکان تەواو لەوێنەی مەسخەکەدا دەردەکەون. ئەو لەیەك کاتدا هەم کەسێکی چاکەو هەم شەڕانگێزە، تووڕەو قین لەدڵ و توندڕەوە، بەلام عاقڵ و حەکیم و نەرمونیانیشە.

بە شێوەیەك لە شێوەکان فرانکشتاین لەو وێنە زەینیە دەچێ کە فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری دەربارەی مرۆڤی سەرەتایی هەیانبوو -وەك (ئامێل)ی جان جاك ڕۆسۆ- کە ئاگای لە ژیارو شارستانیەت نیە. ئەو وەهمێکی فەلسەفیەو لە خۆیدا هەموو سەرەتاکانی کۆکردۆتەوە. سەرەتاکانی مەعریفەو کۆمەڵگەو زمان و زەوق. بەلام لە هەمان کاتدا دژە گوتاریشە: مەسخێکی بێخێزان و نیشتمان و منداڵی، دوورخراوەو دەرکراو کە هەموو وازیان لێهێناوە. ئەمە بەرەو ئەو گوتارە سیاسیە ناکۆکانەمان دەبات کە لەو ماوەیەدا زۆر کەسی سەرقاڵ کردبوو دەربارەی خێزان و دەزگای هاوسەرێتی و پەیمانی کۆمەلایەتی نێوان تاك و کۆمەڵگە، کە باوکی ماری شیلی (ویلیەم جودوین) خۆی یەکێك بوو لەو کەسانە. مەسخەکە لە یەکەم وێنەی بێگوناهیدا ئادەمە، بەلام شەیتانە ئەو کاتەی لە دروستکەرەکەی یاخی دەبێت و هەڵدێت. لەگەڵ ئەوەشدا کە تێکستەکە بە ئاشکرا باسی ناکات، ناکۆکیەك لە نێوان زانست و ئاییندا دەبینرێو هەیە.

لە ڕۆمانەکەدا ناکۆکیەکە دەچێتە ناو ئەو شێوازە ئەدەبییەی کە بەلاغەتی زەخرەفی ئینشائیانەی ڕۆمانی قوتیزم (القوطیة) دەبەستێتەوە بە ڕەخنەکردنی ئەم جۆرە بەلاغەتە زەخرەفیە کە لەگەڵ سەرهەڵدانی ڕۆمانتیکیەتدا هات و (شیلی) مێردیشی یەکێك بوو لە دیارترین شاعیرەکانی. ئەم ناکۆکیانە بەتەنها لە زەینی (ماری شیلی)دا نەبوون، بەلکو لە واقیعە مێژووییەکەشدا بوون. لەم

خاڵەوەیە کە (لوسیرکل) دەیەوێ ناکۆکیە مێژووییەکان -یا ناکۆکی هەڵوێستەکان بەرامبەر رووداوە مێژووییەکان- لە رۆمانی (فرانکشتاین)دا لێکبداتەوەو تاوتوێیان بکات. هەڵوێستی دەوروبەریش بەرامبەر مەسخەکە -بەشێوەیەك لە شێوەکان- هەڵوێستی رۆشنبیرە لیبراڵە ئینگلیزەکانە -کە ماری شیلی لە نێوانیاندا دەژیا- بەرامبەر شۆڕشی فەرەنسی. لەنێو ئەوانەشدا دایکی خۆی (ماری وولستونکرافت) کە بەرەو فەرەنسا کۆچی کرد تا پشتگیری لە شۆڕشەکە بکات، بەڵام بە دوودڵیی گەڕایەوەو ناڕەحەت بوو بەرامبەر ئەو سنووربەزاندن و قەسابخانەو ئازاوانەی بەدوای شۆڕشەکەدا هاتن. زۆر لە نوسەرانیش هەڵوێستی لایەنگیری یاخود دژ بە شۆڕشەکەیان راگەیاند، ئەگەرچی بەهۆی ئەو مۆرکە وێرانکەرو توندڕەوییەوە کە هەڵیگرت زۆرینەی لایەنگرانی توشی نائومێدی و شکست بوون.

مەسخەکە -بەشێوەیەك لە شێوەکان- گوزارشتی لەو جەماوەرە شۆڕشگێڕو راپەڕیوە دەکرد. ئەو ئاماژەیە بەو دەبەنگ و ئاستنزمانەی فەرەنسایان سەروبن کردو خەریکن بێنە شەقامەکانی لەندەنیش تاوەکو تێکی بدەن. ئەو تۆقاندنەی مەسخەکە دروستیکردووە یەکێکە لە ئەنجامەکانی فەرمانڕەوایی تیرۆرو توندڕەوی لە فەرەنسا. ئەو هەستکردن بە گوناهەی ڤیکتۆریش هەمان هەستکردنە بە بەردان و ئازادکردنی شێتەکان، کە لەکاتی شۆڕشەکاندا هەموو حیزبەکان ئەنجامیان داوە. فرانکشتاین پێکهاتەی بارودۆخی مێژوویی بەرجەستە ناکات، چونکە هیچ ئاماژەیەکی روون و ئاشکرا بۆ ئەمە نیە. بەڵام بەرجەستەی فۆرمەلەکەی دەکات: تێکەڵەیەك لە توندوتیژی و هەڵاتن و راکردن بەرەو پێشەوە. ماری شیلی کە کچ و ژنی دوو چەپڕەوە، بەڵکو ئەوپەڕی چەپڕەوانی ئەو ماوەیە، نکوڵی لەو ژینگەیە ناکات.. بەڵام حەزیشی بە بیروڕا سیاسیەکانی نیە. لە پاش مەرگی شیلیەوە بە ئاشکرا دەڵێت: من رێزی هەموو ئەوانە دەگرم کە دەیانەوێ جیهان بگۆڕن، بەڵام رام وەکو ئەوان نیە، چونکە میزاجم واملێناکات توندڕەو بم. جگە لە نزیکەکانی خۆیشم. هەرگیز لیبرالیەکانم خۆشنەویستووە. بەلای کۆنزەرڤاتیڤەکانیشەوە مەسخەکە بە ئاشکرا نمایشی پرۆلیتاریاو ئەو جەماوەرو کۆبوونەوە شۆڕشگێڕانەیە دەکات کە هیچ خواوەندو یەزدانێکیان نیە. ئەو وەکو (دراکۆلا) وایە، تەواو توندوتیژو شەڕانگێزەو دەبێت لەناوببرێت. ئەمە ئەو مەسخەیە کە نەوەکانی پاشتری سینەما هەڵیان بژاردووە. بەڵام ئەمە بەلای ماری شیلی و (ئەو لیبرالیانەی جەسارەتیان کرد شۆڕشەکە بە مەسخەکە بشوبهێنن) تەواو ناکۆکە. راستە ئەو نمایشی شۆڕشەکە دەکات. بە تایبەتی پێش هەموویان شۆڕشی فەرەنسی، بەڵام بەهەموو پۆزەتیڤی و نێگەتیڤیەکانیشەوە. هەم وەکو رووداوێکی گرنگ و پێشوازیلێکراو چونکە رزگارکەرە، لەهەمان کاتیشدا وەك رووداوێکی خوێناوی. لەبەر ئەمەیە دەبینین کە بۆچی کۆپیە کۆنزەرڤاتیڤەکانی ئەفسانەکە زاڵ بوو: سەرەڕای ئەوەی کە ئەم

کۆپیە سادەترەو کەمتر پەیوەندی بە ئاڵۆزکردنی بارودۆخەکەوە هەیە، لەبەر ئەوەشی زیاتر لەگەڵ وەهم و کاریکاتێردا دەگونجێت. کەواتە حیکایەتەکە چارەسەرێکی خەیاڵیە بۆ ئەو ناکۆکیە مێژووییەی ماری شیلی و ژینگەکەیی تێدا بوو. پاش ئەوە لوسێرکل دەچێتە سەر شیکردنەوەی رۆمانەکە لە گۆشەیەکی زانیەوە وەك گوزارشتێك لە کەسایەتی نوسەرەکەی، هەروەها ئەو ناکۆکیانە کەشفدەکات کە ئەم لایەنەی رۆمانەکە هەڵیگرتووە.

لێرەدا ئەفسانە تەنها چارەسەرێکی خەیاڵی نیە بۆ ناکۆکیەکی کردەگیی کە چارەسەری نیە (وەك شتراوس پێی وایە)، بەڵکو وەك لوسێرکل دەڵێت بریتیە لە بەخێزانکردن (عوألة). واتە سەپاندنی مۆرکی سێکسی بەسەر بارودۆخێکی مێژوویدا، وەك چۆن مانای تێڕوانین لە بارودۆخی خێزان لە روانگەیەکی مێژووییەوە. ئەگەر چەمکی سەرەکی بۆ وەسفکردنی چالاکی مێژوونوس گرێچن (حبکة) بێت بە پێی پێناسەکەی (پول ڤاین)، کاتێ نوسەر هەڵدەستێ بە ئامادەکردن و نوسینی رووداوەکان و چنینیان لە حیبکەیەکدا -وەك چۆن رۆماننووسیش وا دەکات- ئەوا فرانکشتاین و دراکۆلا کتێبی مێژوون؛ بەڵکو مێژوویترین کتێبی ناو کتێبەکانی مێژوون. خۆیان وەکو رۆمان ناشارنەوە. بەڵام بەتەنها دوو رۆمانی مێژوویی نین، بەڵکو دوو نموونەی رۆمانی خێزانیین (بە مانا فرۆیدیەکەی). یەکێك لە شوناسەکانی مەسخەکەش ئەوەیە کە باوکی ماری شیلیە. لە رۆمانەکەدا زۆر کەس هەن بە دەستی مەسخەکە دەمرن، بەڵام هەموویان بەشێوەیەکی هاوشێوەو لێکچوو دەمرن، لەم دووبارەبوونەوە قەمریەشدا مانایەکی فرۆیدی ئاشکرا هەیە.

زنجیرەی هەرسێ مردووەکە (باوکەکە، ڤیکتۆر، مەسخەکە) مۆرکێکی ئۆدیبی بەحیکایەتەکە دەبەخشێ: تیایدا کوڕ دووجار دەبێتە هۆی مردنی باوك و لە جاری سێهەمیشدا کە لە هەموویان سەرسوڕهێنەرترە: هەر کوڕەکە بەر لە کەسانی دیکە بەر لەوەی کاتی هاتبێت دەبێتە مایەی مردنی دایکی. بە دڵنیاییەوە لە نێوان ئەم مردنەو لەدایکبوونی مەسخەکەدا (کە یەکسەر بەدوای ئەودا دێت) پەیوەندیەکی راستەوخۆ هەیە.

وەك (لوسێرکل) بە دوورو درێژی باسی کردووە پرۆسەی دروستکردن و خولقاندنی مەسخەکە لە رۆمانەکەدا مۆرکێکی نیمچە سێکسی وەردەگرێت. لوسێرکل دەگاتە ئەوەی مەسخەکە ئەو کوڕە ناشەرعیەیە کە بۆ ڤیکتۆر لەدایکبووە (لەدایکە مردووەکەی ڤیکتۆر خۆی)، هەر بۆیە بەدوای ئەمەدا تۆقین و هەستکردن بە گوناهو سزادانی باوك دایدەگرێو پاشتریش هەمان حاڵەت بەسەر مەسخەکەدا دێت.

مەسخەکە هەم کوڕەو هەم باوکیشە. باوکێکی تایبەتیەو کوشتن پراکتیزەدەکات تاوەکو (بەهۆی ئەو کارەوە کە کوڕەکەی کردوویەتی) تۆڵە لە هەموان بسەنێتەوەو یەکەم کەسیش لە هاوسەری ئەو کوڕەوە دەستپێدەکات. هەموو بە دەستی مەسخەکە دەمرن.. تەنها باوکەکە نەبێت کە لە خەم و مەراقدا

دەمرێ و ناکوژرێت. ئەم چارەنوسەش لە چارەنوسی مەسخەکە دەچێت کە لە کۆتاییدا خۆی دەکوژێت. ئەوەشمان لەبیر ناچێت کە ماری شیلی وای هەستکردوە کە بە راستی دایکی خۆی کوشتووە، چونکە دایکی بەسەر لە دایکبوونی ئەمەوە مردووەو هەست بە گوناه دەکات. پاشتر باوکی ژنێکی دیکە دەمێنێتەوەو کوڕێکی دەبێت (دەبێتە برای ماری شیلی) ناوی (ولیام)ە. لە ڕۆمانەکەشدا ولیام – برا بچکۆلەکەی ڤیکتۆر– یەکەم کەسە کە مەسخەکە دەیکوژێت.

بەو شێوەیە ئەو پرۆسەی کوشتنەی ماری شیلی پێی هەستاوە جۆرێکە لە ڕزگاربوون لە باوکی کە ناوی (ویلیام)ە و برا بچکۆلەکەیشی کە هەمان ناوی هەیە. پاشتر لوسیرکل بە پێی ڕێبازی فرۆیدیی ڕاڤەیەکی دیکە دەکات: مەسخەکە گوزارشتە بۆ ترس لە سێکس، ئەو چێژەی جگە لە مەرگ هیچی دیکە بەرهەم ناهێنێت: سەرەتا مەرگی دایك و پاشتر مەرگی هەمووان.

دوای قوڵبوونەوەی لە ڕاڤە سایکۆلۆژیو زاتییەکانیدا بۆ ڕۆمانەکە، لوسیرکل دەچێتە سەر فرانکشتاین لە سینەماداو وایدەبینێ فیلمی (فرانکشتاین) کە (جیمس وایل) دەریهێناوەو بەرهەمی "یونیڤرسال"ە لە ساڵی *1931*دا، زۆر سەرکەوتوو بووە لە گوێزانەوەی زۆربەی ناکۆکییەکانی ڕۆمانەکەدا. ئەگەرچی ئەم ڕۆمانە پاشتر لە فیلمی ئاست نزم و بێمانادا نیشاندرایەوە، ئەمەش لەو قسەیەی هیگل دەچێت دەربارەی مێژوو کە دەڵێت: مێژوو دووجار دووبارە دەبێتەوە، یەکەمیان لە فۆرمی تراژیدیادا و دووەمیان لە فۆرمی کۆمیدیادا!.. ئەگەر هەموو ئەو هێزەی لە پشت فیلمەکەی (وایل)ەوە پەنهانە مۆرکی نائارام و سەقامگیرنەبووی ڕستەکان بێت، ئەوا ئەو فیلمەی کە زۆر سەرکەوتوو بوو – "نەفرەتی فرانکشتاین" لە دەرهێنانی (تیرانس فیشەر) کە ستۆدیۆکانی (هامر) لە ساڵی *1957*دا بەرهەمیان هێنا– بریتی بوو لە گێڕانەوەیەکی نەرم و هەموو ناکۆکییەکانی تێدا سڕاوەتەوە، بەرادەیەك کە مەسخەکە گۆڕاوە بۆ ئامرازی ترس و شەڕو تۆقاندن، هەموو پەیوەندییە خێزانیەکانی تێدا سڕاوەتەوە، جەماوەرو دیمەنە دەرەکییەکانیشی تێدا سڕاوەتەوە.

ئەفسانەکە (کە خۆی دەربارەی خێزان و کۆمەڵگەو گەردوونە) گۆڕاوە بۆ ریسکی تاکەکەسیانەی زانایەکی تاوانبار کە لە ئەشکەوتەکەیدا تاوانە تۆقێنەرەکانی ئەنجامدەدات و لەو جیهان و کۆمەڵگەیە دابڕاوە کە رقی لێیانە. ئەو تاوانبارێکی وردە بۆرژوایەو بە هیچ شێوەیەك برۆمسیۆس نییە. ئەمەیە ئەفسانەی کۆتایی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیاو، لوسیرکل مێژووی فیلمەکە -*1957*- دەبەستێتەوە بە دوا هێرشی گونهکارانەی ئەو ئیمپراتۆریەتە لە (*1956*)دا بۆ سەر سوێس.

***سەرچاوە:***

*گۆڤاری (الفن السابع)، ژمارە (32) یولیۆی 2000، ل (70–71) وتاری: التفسير التاريخي لفرانكشتاين.*

# تاهیر بن جەللون

## باسی رەیسیزم بۆ کچەکەی دەکات!

● ئامادەکردنی: سەردەم

*Tahir Ben Jalloun*
*"Le Racisme sxplique a mafille"*
*Paris, Seuil, 1998*

ژمارەیەکی زۆری نوسەرانی خۆرئاوای عەرەبی بە زمانی فەرەنسی دەنووسن و بەرهەمەکانیان بڵاودەکەنەوە. تاهیر بن جەلۆن یەکێکە لە هەرە دیارترین ئەو نووسەرانە، لەگەڵ هەریەك لە محەمەد دیب و ئاسیا جەبارو رەشید بۆجەدرە (جەزائیر)، ئەلبێرمیمی و عەبدولوەهاب موئەدەب (تونس)، ئیدریس شەرایبی و عەبدولکەریم خەتیبی (مەغریب).

ئەوەی بن جەلۆن لە هاوەڵەکانی جیادەکاتەوە ئەوەیە ئەو لە هەموویان زیاتر بڵاودەکاتەوە، لە زیاد لە بوارێکیشدا دەنووسێت.. لە پاڵ ئەوەی رۆمان نووسێکی دیارو ناسراوە، شاعیریشەو رۆژنامەنووس و توێژەرێکی بەتواناشە. ئەو رۆمانانەی بەزمانی فەرەنسی بەچاپی گەیاندوون بریتین لە: (حرّودة– محا المجنون، محا العاقل– صلاة الغائب– ليلة القدر– يوم صمت في طنجة).

لەگەڵ ئەم رۆمانانەدا بن جەلۆن چەند لێکۆڵینەوەیەکی سەرکەوتووشی دەربارەی بارودۆخی پەناهندە مەغریبییەکان لە فەرەنسا پێشکەش کردووە، لەوانە: (دوا ئاستی گۆشەگیری) کە ئەمە بۆخۆی بریتیە لە کارنامەی دکتۆراکەی لە بواری پیسکۆلۆژیای کۆمەلایەتی‌داو، لە مانگی حوزەیرانی **1975**دا گفتوگۆی لەسەر کراوە و بڕوانامەکەی بەسەرکەوتوویی پێ بەخشراوە. دووەم لێکۆڵینەوەی بەناوی (میواندارێتی فەرەنسی)یەو، سێهەمیشیان ئەم کتێبە تازەیەتی بەناوی (راسیزم وەك ئەوەی بۆ کچەکەمم باسکردووە).

ئەم دواین کتێبەی بن جەلۆن لە سەرەتای ساڵی 1998دا لە لایەن دەزگای (Seuil)ەوە لە پاریس بڵاوکرایەوە. کتێبەکە ئەگەرچی بە قەوارە بچووکە، بەڵام بەپێی گۆڤاری (لوبوان) بە پڕفرۆشترین کتێبی فەرەنسا دادەنرێت، تەنانەت دوای نۆزدە هەفتە بەسەر دەرچوونیدا لە پلەی چوارەمدایە. هەروەها بە پێی گۆڤاری (ئێکسپرێس) کتێبەکەی بن جەلۆن لە پلەی سێیەمدایە و دوابەدوای هەردوو کتێبی (حیکمەتی نوێخوازەکان) کە لە نووسینی لوک ڤێری و ئەندرێ کۆنت سپۆنڤیلەو، لەگەڵ (دژی ئاگر)ی بیار بۆردیۆ دێت.

ئەم کتێبە نوێیەی بن جەلۆن بە کتێبەکەی (ئەنیس فریحە) دەچێت (گوێ بگرە رەزا). لەکاتێکدا لەو کتێبەدا (فریحە) سەرگوزشتەی لادێ بۆ کوڕەکەی دەگێڕێتەوە، دەبینین بن جەلۆن چیرۆکی راسیزم بۆ (مەریەم)ی کچی باس دەکات.

دەسپێکی کتێبەکە بە پرسیارێکی (مەریەم) دەست پێ دەکات: بابە راسیزم چییە؟ بن جەلۆنیش بەشێوەیەکی سادەو ساکار دەکەوێتە وەڵامدانەوەو رونکردنەوەی ئەو چەمکەو دەڵێت: راسیزم تێکەڵیەکە لە هەستکردن بە باڵادەستی یاخود بەدتۆنبەت، ئەمەش هەستێکە لای هەردوو کەسی بەرامبەر بەیەك هەیە. مرۆڤ بۆخۆی ترسی لەهەر شتێکە کە پێی ناناشنا بێت و نەیناسێت، لێرەوە ترس دەبێتە سەرچاوەیەکی سەرەکی راسیزم.

ئەم حاڵەتەش تەواو لای ژان-ماری لۆبان بەدی دەکەین کاتێك دەیەوێت ترس لە دڵی فەرەنسیەکاندا بچێنێت بەرامبەر پەنامندەکانی ئەوێ. بن جەلۆن ئەوەش رون دەکاتەوە کە مرۆڤ لەگەڵ لەدایك بوونیدا رەگەزپەرستی لەگەڵ خۆیدا ناهێنێت، بەڵکو لەگەڵ تێپەڕبوونی کاندا دەبێتە راسیزم. مرۆڤ لەو ئان و ساتەدا دەبێتە راسیزم کە درکی کرد سەر بە دەستەو تاقمێکە یان دەچێتەوە سەر رەگەزێك زۆر بەرزو باڵاترە لەکەسانی دیو لەوانی تر.

مەبەستی سەرەکی بن جەلۆن لە نووسینەوەی ئەم کتێبەی ئەوەیە سەرکۆنەیەکی توندی راسیزم بکات، ئەو دیاردەیەی لە دەیەی کۆتایی سەدەی بیستەمدا تەواوی خۆرئاوای گرتۆتەوە، لە ئەڵمانیاوە بۆ نەمساو لە ئینگلتەراوە بۆ فەرەنسا. دەرکەوتنی خێراو بە پەلەی کەسانی وەك یۆرگ هایدەرو ژان-ماری لۆبان و، برەوسەندنی کردەوە دڕندانەکانی راسیزمەکان لە ئەوروپا دژ بە بیانیو پەنامندەکانی ئەوێ، بەڵگەی ئەوەن کە مرۆڤایەتی لە بەردەم هەڕەشەیەکی تازەدایە، هەڕەشەیەکی واش جێی مەترسیەو پێویستە رێی پێ بگیرێت. ئەم هەوڵەی بن جەلۆن دەچێتە ئەو خانەیەوە.

***سەرچاوە:***

*لە رۆژنامەی (الحیاة)ی ژمارە (12888)ەوە ئامادەکراوە.*

***تێبینی:***

*دەقی ئەم کتێبە لە ژێر ناونیشانی (رەگەزپەرستی چییە؟)دا لەم ژمارەیەدا وەکو کتێبی ژمارە بڵاوبۆتەوە.*

***سەرنەم***

# ڕۆمانی "وەك ئاو بۆ شوكولات"

■ خوێندنەوەی: ڕەووف بێگەرد

خوێندنەوەی بەرهەمێكی ئەدەبی گرنگ و پوخت كردنەوەی بۆ چەند پەیڤێك كارێكی ئاسان نیە و بەڵكو دژواریشە. لە كاتێكدا ئەو ڕاستیە بزانیت كە بەرهەمێكی وەك ڕۆمان جەمسەری لێكدانی گەلێك ڕەگەزی جۆراوجۆری هونەری و لێكدانەوەی فیكرییەو، لەو كورت كردنەوەیەی مەبەست و ئاماژانەدا زۆر لەو جەوهەرانە لەدەست دەچن. ئەمەیش، چەندە مەبەستەكە بە بایەخ و كەڵكی تری لەخۆ گرتبێت ڕوانینێكە هەر لە دیدی خوێندنەوەی بەرهەمە فیكری و تیۆری و ڕوناكبیریەكانەوە هاتوە كە ئەمیان ئاسانترو پاساوی قەناعەت پێكەری خۆی هەیە، بەڵام خوێندنەوەی كارێكی هونەری وەك ڕۆمان و وەستاندنی لە چەند وێستگەیەكی گێڕانەوەدا لەدەست دانی گەلێك ڕەگەزی ئیستاتیكی ناوازەیە، چونكە بەشێكی هەرە گرنگی ساختمانی كارەكەیە كە دەشێت نووسەر لەهەر ڕەگەزێكی تری زیاتر ماندوی كردبێت و دامێنانێكیش بێت لەو دنیایەدا. لەبەر ئەوەی كارەكە هونەرەو لەوە دەچێت بە پارچە مۆسیقایەك یان قەسیدەیەك بڵێیت باسی چی دەكات. لە كاتێكدا كارەكان -وەك هونەر- خۆیان ئامانج و مەبەستن، و دەشێت ئەو جوانكاریانە قابیلی گوێزانەوە نەبن لە ڕێگای وشەوە.

لە نێوەندی ڕوناكبیری و ژورنالیستی ئەمڕۆدا خوێندنەوەی كتێب بۆتە كارێكی باو، كەسانی پسپۆڕ لەو بوارانەدا مەبەستەكان پوخت دەكەنەوە بۆ ڕادەربڕین و بۆچوونی خۆیان، بەتایبەت بەرهەمە فیكری و ڕووناكبیریەكان كە زیاتر بۆ گفتوگۆ و چەند و چوون لەسەر كردن دەست دەدەن. دیارە هەندێك ناچاری هەن كە دەستت بۆ كاری هونەری و ئەدەبییش پێ درێژ دەكەن. چونكە یان بەرهەمەكە لە زمانێكەوە وەردەگیرێت و بۆ خوێنەری زمانەكەی خۆت كورت دەكەیتەوە كە زۆربەیان بەو زمانە ئاشنا نین، یان كارەكە زادەی بیرێكی دەگمەن و داهێنەرانەی بوارەكەیەو خودی خۆت كارەكە هێند سەرنجی ڕاكێشاویت كە لە حەزی خۆتەوە دەتەوێت پێناسەیەكی بۆ خوێنەر بكەیت و چەند بتوانیت چێژی بەرهەمەكەی پێ بگەیەنیت، كە بێگومان ناتوانێت وەك خوێندنەوەی خودی دەقەكە هەرگیز ئەو پرۆسەیە بە ئەنجام بگەیەنیت.

ژنە نووسەری مەكسیكی (لورا ئسكوئیل) ڕۆمانێكی بە ناوی وەك ئاو بۆ شوكلات (مثل اب برای شكلات) نووسیوەو خاتوو مریەمی بەیات لە زمانی ئینگلیزییەوە كردوویەتی بە فارسی كە ناونیشانە ئینگلیزیەكەی (*Like Water For choclate*)ە.

ڕۆمانەكە لە دوانزە بەشدایەو هەر بەشەی بەناوی یەكێك لە مانگەكانی ساڵەوەیە. واتا لە مانگی ژانویەوە دەست پێ دەكات و لە دیسامبەردا كۆتایی دێت.

مثل آب برای شکلات



لورا اسکوئیول

مترجم: مریم بیات

سەرەتای هەموو بەشێکیشی بەو کەرەسانە دەست پێ دەکات کە بۆ ئامادەکردنی خۆراکێك (لە چێشتەوە بیگرە تا کێك وسوسیس و شیرینی تر) پێویستن و ژنەکانی ئەوماڵە دروستی دەکەن. بۆ نموونە لە مانگی مەیدا ئەو کەرەسانەی کە پێویستن بۆ دروست کردنی "سوسیس بەشێوەی باکوور" ئەمانەن: 1-هەشت کیلۆ گۆشتی گردە 2-دوو کیلۆ گۆشتی سەر یان مۆخ و پەناگوێ 3-یەك کیلۆ بیبەری سووری وشك 4-شەست گرام زیرە 5-شەست گرام جاترە 6-سی گرام بیبەر 7-شەش گرام مێخەك 8-دوو فنجان سیر 9-دوو لیتر سرکەی سێو 10-یەك چارەکە کیلۆ خوێ. پاشان دێتە سەر شێوەی تێکەڵ کردن و پوختەکردنی ئەو مادانەو ئامادەکردنیان بۆ دروست کردنی سوسیس. هەروەها هەموو ئەوانەی کە لەم کارەدا بەشدارن ژنن و لە چێشتخانەی ماڵی دایکە ئیلناوە دەکرێن، بێجگە لە دۆخی چێشتخانەو کاراکتەری ژن هەموو رووداوی ناو رۆمانەکە بەسەرهاتی ژنن، لە خۆشەویستی، شووکردن، منداڵ بوون، پەیوەندیی سێکس و کۆمەڵایەتی، دایك سالاری، هەڵچوونە دەروونییو سایکۆلۆژیەکانی تایبەت بە ژن. بۆیە دەتوانین بەم بەرهەمە بڵێین "رۆمانی ژن". لەبەر ئەوەیش کە نوسەرەکەی ژنە ئیدی زیاتر هەست بە ئازارو خەم و خۆشی و فرمێسك و پێکەنین و تەنانەت نیاردە هەرە شاراوەکانی فسیۆلۆژی ژن دەکەیت.

شوێنی رووداني کارەساتەکان لە ماڵی (ماما ئیلنا)وەیە کە دوای مردنی مێردەکەی بۆتە خاوەنی مەزرەعەکەو بەتەواوی مانا رژێمی دایك سالاری پیادە دەکات. بەرانبەر بە کچەکانی (تیتاو روسوراو گرترودیس) زۆر دڵڕەقە، رێگا لە خۆشەویستییان دەگرێت و بێجگە لە فەرمانی خۆی گوێ لە هیچ رایەکی تر ناگرێت. بۆیە گوترودیس لە دەستی رادەکات و لە شوێنێکی تر شوو دەکات. روسوراو شوو بە پیدرۆ دەکات کە تیتای خوشکی خۆش دەوێت و تیتایش بە پێی رێ و رەسمی خۆیان نابێت شوو بکات تا دایکی دەمرێت، واتە دەبێت لە ماڵدا دەوری کەنیزەك ببینێت. لە خۆشەویستی نێوان تیتاو پیدرۆ و قایل نەبوونی دایکە ئیلنا بە بەشودانی تیتاو لە باتی ئەو مارەکردنی روسورای خوشکی تیتا بە پیدرۆ ترازیدیای رووداوەکە دەست پێ دەکات. چونکە پیدرۆ هەر بۆ ئەوە روسورا دێنێت کە لە تیتا دوور نەکەوێتەوەو هەمیشە لەبەر چاوی

بێت، لەبەر ئەوەی کە زۆری خۆش دەوێت. بەڵام تیتا لە بەردەم بڕیاری دایکیا ناتوانێت بەرەڵستیەك بکات و سەری بەزۆر قایل بوونی دادەنەوێنێت. تیتا لە ماڵیدا بێجگە لە چێشت لێنان و خزمەت کردنی دایکی چی تر ناکات و بەردەوام دەیەوێت خۆشەویستیەکەی پیدرۆ لەخۆیدا بمرێنێت. کەچی هەموو ڕێکەوتەکان لە نزیك خستنەوەی ئەم دوانەدان. بۆ نموونە کە پیدرۆ کوڕێکی لە ڕوسورا دەبێت دایکەکە شیری نیە بیداتێ، بۆیە منداڵەکە دێتە ژارو زەنگ و هیچ شتێك ناگرێت بێجگە لە مەمکی تیتای پووری کە کچەو بۆی دێتە شیر، هەروەها نەخۆشی زۆرو ناجۆری ڕوسورا وا دەکات کە پیدرۆ تەواو لێی بێزرێت و زیاتر خوویاتەوە تیتا. لە کاتێکدا کە ئیلنای دایك بەردەوام لە سووسەکردن و چاودێری هەردووکیاندایەو ناهێڵێت دەرفەتی ئەوەیان دەست بکەوێت بە یەکتری بگەن. ئەگەرچی لە دوای نەخۆش کەوتنی تیتاو حەزکردنی لە دکتۆر جان باری ڕووداوەکان بەرەو ئارامی و کرژی حاڵەتی دەرونی کەسەکانیش ڕوو لە نیشتنەوەن، بەڵام نووسەر جارێکی تر خوێنەر ئابڵوقە دەدات و سەرەداوی تری بۆ دەهۆنێتەوەو حاڵەتە دەرونیەکەی کرژ دەکاتەوە. بەوەی کە دایکە ئیلنا لە شەڕی یاخیەکاندا خەست برینداردەبێت و لە ماڵدا دەکەوێت و پاشان دەمرێت. بۆیە بە ناچاری پیدرۆ و ژنەکەی دێنەوە سەرماڵ و پیدرۆ دەبێتە تاقە پیاوی خێزانەکەو پەیوەندیەکە لەگەڵ تیتادا زیاتر دەکاتەوە. تا ئەو کاتەی کە ڕوسورایش دەمرێت و پیدرۆ تیتا دەخوازێت و لە پڕا ئەویش دەمرێت. ئەوسا تیتا تەنیا دەکەوێت و دەکەوێتە گەڕان بەناو نهێنییەکانی دایکی‌و ژوورەکانداو ئەم ئەنجامانەی دەست دەکەوێت:

کاتی خۆی دایکی تیتا -ماما ئیلنا- حەزی لە پیاوێکی ڕەش پێست کردوە بەناوی (خۆزێ تیرونیوی) و دایك و باوکی نەیانداوەتێ، کە بە ناچاری شووی بە باوکی تیتا کردوە ئەو پەیوەندیەی هەر ماوەو یەکێك لەم کچانە (گرترودیس) لەو پیاوە ڕەش پێستەیە. دیارە هەر ئەمەیش بۆتە گرێی دەرونی ئیلنا کە لە پێوەندی لەگەڵ کچەکانیدا ڕەنگی داوەتەوەو بە هەموو خۆشەویستیەك دڕدۆنگ و ناجۆر بوە و نەیویستوە کچەکانی بەخۆشەویستی شوو بکەن. (ئەم ڕاستیانە لەو نامانەدا دەردەکەون کە تیتا لەناو شت و مەکی نهێنی دایکیا دەیدۆزێتەوەو دەیەوێت لە ناویان بەرێت و پاشان وەك خۆیان دەیان هێڵێتەوە).

ڕۆمانەکە چەندی واقیعە ئەوەندەیش بەخەیاڵ و فەنتازیایە، بەردەوام گیانی دایکە ئیلنا -دوای مردنی- لەناو ماڵەکەدا دەگەڕێت و چاودێری هەڵس و کەوتی تیتا دەکات و سەرکۆنەو تووشی ئازاری ویژدانی دەکات.

مردنە بەردەوام و کوت و پڕەکانی -ڕوسولا، ئیلنا، ناچا، پیدرۆ، تیتا- تەعبیرن لە ڕۆحی پڕ لە ئەفسونی خەیاڵ ئامێزانەی نووسەرو ئەو شوێنەی ڕۆحیانەتەکان خۆیان تیا حەشار داوە.

تارمایی "ناچا" کە دوای مردنی لەژێر زەمینەکەدایەو لە شەوی زەماوەندی تیتا و پیدرۆدا دوو سەدو پەنجا مۆم دادەگیرسێنێت. هەڵاتنی بەرازو گاو کوڕکوڕو کۆترو مریشکەکانی کێڵگەکەو فرمێسکەکانی تیتا کە دەبنە لافاو و مەرگە ئەفسانەییەکەی. هەموو ئەمانە خەیاڵی ئاوازەی نووسەرن کە وەك سیمایەکی ئەدەبی ئەمریکای لاتین ناواقیعەکان دەگۆڕنە سەر واقیع و قەناعەتی هونەریانە بە خوێنەر دێن. بە تایبەتی مردنی پیدرۆ لە شەوی زاوایەتی و لە باوەشی تیتادا، پاشان هەر لەو شەوەدا مردنی تیتاو گەیشتنی ڕۆحی هەردووکیان لە ڕێگای بەرەو بەهەشت چونیاندا.

ماوەتەوە بڵێین ئەم ڕۆمانە؛ دوو جار لە ئێران چاپ کراوە 1376 و 1378

لە بڵاوکراوەی (انتشارات روشنگران و مطالعات زنان)ە.

### دووەم فێستیڤاڵی

# شانۆی بووکە شووشە

• و. لە سویدییەوە: دانا رەئووف

شانۆی بووکە شووشە جۆرێکە، فۆرمێکە تایبەت بە شانۆی منداڵان و لە زۆر وڵاتانی جیهاندا پەیرەو و پرۆگرامی تایبەت و رێپێرتواری خۆی هەیە. ئەمساڵ لە ستۆکهۆلم دووەم فیستیڤاڵی جیهانی بۆ شانۆی بووکە شووشەو بۆ بینەری گەورە دەستی پێکرد. نمایشەکانی ئەم فیستیڤاڵە وەك فیستیڤاڵی یەکەم کە لە ساڵی **1988** پێشکەشکرا، بەهەموو شێوەیەك بۆ منداڵان قەدەغە بوو(1).

***Non stop Puppets*** ناو و دروشمی ئەم فیستیڤاڵە گرنگە پڕ لە رەنگی جیاواز و فەنتازیاییە. فەنتازیا لایەنێکی گرنگ و دەوڵەمەندی ئەم جیهانە بووکە شووشەییە ترسناکەیە. ئەم جۆرەی شانۆی بووکە شووشە کە تایبەتە بە (بینەری گەورە) لەم دە ساڵەی دواییدا، وەك شێوازێکی نوێی شانۆیی گەشە کردووە. جیاوازیش لە نێوان شانۆی بووکە شووشەی منداڵان و گەورە، دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕۆکی بابەتەکان، سیمای بووکە شووشەکان و چۆنیەتی بەرهەمهێنانی ئەو نمایشە بووکە شووشەییانە. بۆ نموونە ئەو گرفت و کێشە سەرەکیانەی لە نمایشەکانی ئەم فیستیڤاڵەدا خرانە روو ترسناك، فەلسەفی، چارەنووس ساز بوون کە جیهانی ئاڵۆزو پڕ لە خەون، تاوان و ئەندێشەکانی مرۆڤی گەورە بوون. بەڵام بەشێوەیەکی گشتی نمایشەکان، لە رووی فۆرم، دید جۆرەکانی بووکە شووشە، بەکارهێنانی پانتایی، بەشداری کردنی هەندێ ئەکتەری راستەقینە، یان بە واتایەکی تر چۆنیەتی هەڵسووڕان و بەکارهێنانی بووکە شووشەکان زۆر جیاوازن لە یەکترییەوە.

*کۆڕی بەشدارەکانی فیستیڤاڵەکە

ئەمساڵ کۆمەڵێ گرۆی گرنگی شانۆکانی بووکە شووشە بەشداری ئەم فیستیڤاڵەیان کردبوو. فیستیڤاڵەکە، وەك لەلای

سەرەوە ئاماژەمان بۆ کردووە، بەهەموو شێوەیەك بۆ منداڵان قەدەغە بوو. گرۆ بەشدارەکان بریتی بوو لە فەرەنسا، بە دوو پرۆژە- ئینگلستان و هۆڵاند. نەمایشەکان لەسەر شانۆی Sodera teatern و شانۆی لووتی درێژ Longa Nasan کە تایبەتە بە شانۆی بووکە شووشە، وەك لقێکی شانۆی شار لە ستۆکهۆڵم پێشکەشکران.

*گرۆی TAXI2M لە فەرەنساوە

*شانۆیی (بەو شێوەیەی نێوە دەتانەوێت)

ئەم شانۆییە یەکێکە لە کۆمیدیا کلاسیکیەکانی ولیەم شەکسپرو هونەرمەندی ئەمەریکایی رۆمان پاسکا Roman Paska ئامادەی کردووەو هەر خۆشی بەکاری ریژی و لایەنە هونەریەکانی تری هەڵساوە. رۆمان پاسکا(2) ئەم بەرهەمە کلاسیکیەی شەکسپیری بە شێوازێکی نوێ و سەربەستانە خستۆتە روو. نەمایشەکە لەلایەن سێ ئەکتەرەوە، لە کالایەکی وێنسەیی رەنگین و بەهۆی بەکارهێنانی چەندین بووکە شووشەی گەورەو بچوکەوە، ئەو جیهانە داستانیەی شەکسپیر نیشان دەدات.

هونەرمەند رۆمان پاسکا بە نەژاد خەڵکی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایە. بنکەو دامودەزگا هونەریەکانی لە شاری نیۆرکە، بەڵام لە گەشتی هونەری بەردەوامدایە بە هەموو جیهاندا. لە گەشتەکانیدا کاری ریژی، سیمینار و مەشقی تایبەت بە هونەری بووکە شووشە پێشکەش دەکات. لە ساڵی رابردووەوە بۆتە بەڕێوەبەرو بەرپرسیاری یەکەمی Charleville- Mezieres ئەمەش دەزگایەکی گرنگی نێونەتەوەیی شانۆی بووکە شووشەیە لە باکوری فەرەنسا، وەك لەلای سەرەوە ئاماژەمان بۆ کردووە، پرۆژەکەی رۆمان پاسکا

خوێندنەوەیەکی زۆر سەربەستی (بەو شێوەیەی ئێوە دەتانەوێت)ی شەکسپیرە. ئەم ناونیشانە، واتە (بەو شێوەیەی ئێوە دەتانەوێت) لە نمایشەکەدا گۆڕانکاری بەسەردا هاتووەو لەبری ئەوە بۆتە (ئاردن/ ئاردێنە). ئەم گۆڕانکارییەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ڕووداوەکانی شانۆییەکە لە دارستانە چڕەکانی (ئاردێنە)ی فەرەنسادا ڕوودەدات. لەو دارستانەدا دەرەبەگێکی هەڵهاتوو کۆشکێکی شاهانەی کاتی بۆ خۆی بنیات دەنێت. کچی ئەم دەرەبەگە (رۆسە لیندا) و ئامۆزاکەی (گێلیا) دوای گێرمەو کێشەیەکی زۆرو بەمەڵە لەیەکتر حساڵبوون زەماوەند لەگەڵ هەردوو برا (ئۆرلاندۆ) و (ئۆلیفەر) دەکەن.

دەستنیشانکردنی ئەو ناونیشانە نوێیەش، ئاردن/ ئاردێنە، دووپاتکردنەوەیەکی ئەو خوێندنەوە سەربەستەی پیەسەکەیە. رۆمان پاسکا دەیەوێت بەم ناونیشانە نوێیە زیاتر شانۆییەکە ببەستێتەوە بەو پانتاییە جوگرافیەوە کە دارستانی ئاردێنەیە لە وڵاتی فەرەنسا.

هەروەها ئێستە ئەو دەزگا گرنگە نێونەتەوەییەی شانۆی بووکە شووشە کە مەڵبەندەکەی فەرەنسایە و هەر رۆمان پاسکا بەرپرسیارو بەڕێوەبەری یەکەمیەتی دەکەوێتە نزیک دارستانی ئاردێنە کە ڕاستەوخۆ ڕووداوەکانی شانۆنامەکەی تیا ڕوودەدات. هەموو ئەو ئەکتەرە زۆر وریاو بە توانایانەشی کە بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر لەگەڵ ئەو بووکە شووشە جۆراوجۆرانەدا گەمە دەکەن دەرچووی ئەو دەزگا گرنگە شانۆی بووکە شووشەن(3).

رۆمان پاسکا دەڵێت: لە بیر خۆمە لەنێو دارستانەکەی شەکسپیردا دیبەوە، ئەمەش وایلێکردم سەرلەنوێ ئەو شانۆییە بە چاوێکی تر، هزر و دیدێکی ترەوە بخوێنمەوە. دیدی شەکسپیر بۆ شانۆو ستركتۆری ئەو کۆمیدیایە، وەك ئاوێنەو بەکارهێنانی دوو کاراکتەر زەمینەیەکی گەلێ لەباریان پێ بەخشیم تا بە شێوەیەکی قوڵ لەو دیدە بکۆڵمەوە. بۆ ئەو مەبەستەش هەوڵمداوە پانتاییەکی فراوانتر ببەخشمە پیەسەو زیاتر بیان گونجێنم و ئاوێتەی شێوازە تایبەتەکەی ئەو فۆرمەی شانۆی بووکە شووشەی بکەم کە خۆم کاری پێدەکەم. بیرۆکەی من لەوەدا دەسوڕایەوە، بە چ شێوەیەك شانۆی بووکە شووشە لە ڕوانگەو دیدی ئەو پیسەدا بەرەو پێشەوە بەرم. ئەم هونەرمەندە لە تەمەنێکی زۆر مێردمنداڵیدا تێکەڵی کاری شانۆیی بووە. ئەوکاتە لە شاری نیۆرکی ئەمەریکی وەك لاوێکی تازە پێگەیشتو سەرەتای کارەکانی دەست پێدەکات. یەکێك لە میتودە سەرەتاییەکانی ئەو لاوە بەکارهێنانی (دەمامك و بووکە شووشە) بووە. گرنگی پێدانی ئەو جۆرە فۆرم و میتودانەش بە رای پاسکا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ستركتورە وێنەیی و لایەنە پێرفۆرمیەی *Performing arts* بە ماسك و چەمکی شانۆی بووکە شووشەدا بەدیدەکرێت. رۆمان پاسکا سەبارەت بە هاوکێشەیە دەڵێت: بەکارهێنانی بووکە شووشە بە ئاسانی دەتوانێ ببێتە دەربڕی هزرو دیدی هونەری، هەروەها لە هەمانکاتدا کەسایەتی و کاراکتەری جۆراوجۆریش بەرجەستە بکات. بەتایبەتی ئەو وێنەو کاراکتەرانەی کەمتر

دەکرێت لە ڕوانگەی ئەکتەرێکی ڕاستەقینەوە بەرجەستە بکرێت. ئەکتەرو بووکە شووشە بە جۆرێك لە جۆرەکان یەکتری تەواو دەکەن. ڕێژیسۆرو هونەرمەندی ئینگلیزی (گۆین گریك) لە سەدەی ڕابردوودا لە یەکێك لە قۆناغە گرنگەکانی کارو پرۆژەکانیدا گەرەکی بوو بە تەواوەتی ئەکتەر وەلاوە نێت و تەنها بە بووکە شووشەی جۆراو جۆر کار بکات.

ڕۆمان پاسکا لە ڕووی خوێندنەوەی پیەسەکەوە دووپاتی ئەوە دەکاتەوە کە ئەو پیەسەکەی شەکسپیری نەخوێندۆتەوە. یان بە واتایەکی تر خودی ئەو کۆمیدیایەی نەخستۆتە سەر شانۆ. بەڵکو بەشێوەیەکی زۆر سەربەستانە نزیك بۆتەوە لە گەوهەری کۆمیدیاکەوە. نمایشەکە هەر زۆر کەم تێکست و دەیالۆگ لەخۆدە دەگرێت. زمانی وێنەو فۆرمی شانۆی بووکە شووشە (بەتایبەتیش شێوازە ئەفسونیەکەی پاسکا) و جیهانێکی ئەبسوردی پڕ لە فەنتازیا نمایشەکەی پێکهێناوە.

ڕۆمان پاسکا لەم نمایشەدا زۆر بە چڕی جەختی لەسەر مەسەلەی تاراوگە کردووە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ خودی ڕۆمان پاسکا خۆی. پاسکا ئێستە لە تاراوگەدا دەژی. ساڵێکە بە تەواوەتی نیۆرکی بەجێ هێشتووە لە ئاردێنەرنە Ardennerna لە فەرەنسا دەژی،. هەرچەندە ئەو هونەرمەندە وەك میوانێکی ڕێزلێگیراو لە فەرەنسا دەژی، بەڵام ڕاستەوخۆ ئاماژەی ئەوە دەکات کە ژیان لە (تاراوگە) دەباتە سەر. سەنتەرێکی جیهانیش بۆ شانۆی بووکە شووشە دەکەوێتە ناوەڕاستی ئەو دارستانە ئەفسونیە چارەنووس سازەوە لە وڵاتی فەرەنسا.

*گرۆی Green Ginger لە ئینگلستانەوە

ئەم گرۆیە یەکێکە لە گرنگترین گرۆ شانۆییەکانی شانۆی بووکە شووشە لە ئینگلستان و بەزۆری وەك پرنسیپێکی هەمیشەیی بەرجەستەی شاکارە کلاسیکیەکان دەکەن. لەم ڕووەوە ئەم هونەرمەندانە ناوبانگیان بەوە دەرکردووە کە ئەو شاکارە کلاسیکیانە لە دیدو



بۆچوونێکی زۆر تازەو جیاوازەوە پێشکەش دەکەن. بەرهەمە کلاسیکیەکان لە پرۆسەی پرۆژە هونەریەکانیاندا هیچ رێزو بەهایەکی مێژووییان بۆ دانانرێت. هەموو خوێندنەوەو بەرجەستەکردنێك لە دوو تۆی دیدو ئارەزووە هونەریەکانیاندا سەقامگیر دەبێت.

Ginger، Green لە نەژادەوە لە هەرێمی Wales وە هاتووەو زیاتر وەك ئەکتەرێکی شانۆی سەرشەقام و کۆڵانەکان لە لایەك و خولقاندنی شانۆییەکی وێنەیی و ریتواڵی ناسراوە. ئەم هونەرمەندە لە روانگەی کۆمیدیایەکی پڕ لە خەندە، قسەی هەڵەق و مەڵەق، هەندێ جار دیمەنی توندوتیژو رەق، گۆڕینی هەڵوێستەکان بۆ وێنەی بزاوت. بووکە شووشەی گرۆتێسك و ئەکتەری راستەقینەی دەمامك پۆش، شێوازێکی زۆر تایبەتی لە رەوتی شانۆیەکی هاوچەرخی بووکە شووشەی (گەورەکان) خولقاندووە. ئەمە دووەم جارە ئەم گرۆپە سەردانی وڵاتی سوێد دەکەن. ساڵی *1988* بۆ یەکەمجار لە چالاکیەکانی (ستۆکهۆلم پایتەختی کلتوری ئەوروپا) یەکێك لە گرنگترین پرۆژەکانیان لە شاری ستۆکهۆلم پێشکەش دەکەن.

بەشداری ئەم جارەیان چیرۆکێکی پڕ لە ئازار، گرۆتێسك و تراژیدی– کۆمیدی (بەمبی)یەو سەرنجی تێکڕای بینەران و رەخنەگرەکانیان بۆ لای خۆیان راکێشا.

## شانۆیی (بەمبی)(4)

بەمبی کاراکتەری کۆمەڵێ سەرگوزشتەی کلاسیکیەو لای ئەوروپاییەکان بابەتێکی ئاشکرایە. لەم چیرۆکەدا بەمبی بە چاوە پڕ لە ئارتێزاوەکانیەوە لەگەڵ براکەی (گۆبۆ) Gobo و دایکە تەنهاکەیان، خۆیان لەناو زێراب و سەردابە تاریکە پڕ لە توندوتیژی، تاوان و خەڵکانی تاوانباردا لە نێوەڕاستی شارە گەورەکاندا، دەبیننەوە.

ئەم گرۆ ئەفسونیە لە روانگەی ئەکتەری دەمامك پۆش، بووکە شووشەی گرۆتێسك و وێنەی بزاوتی سینەمایی دارشتەیەکی نوێ دەبەخشنە کاراکتەری بەمبی و رووداوەکانی ئەم چیرۆکە کلاسیکیە پڕ لە ئازارە. لەم جیهانەدا یاساکانی جەنگەڵ پەیڕەوی دەکرێت. یەکێك لە گرنگترین ئەو یاسایانەش ئەوەیە: بە هیچ شێوەیەك دزی لە هاورێکەی خۆت مەکە. زۆر جار ئەو یاسایانە چارەنووسی کاراکتەرەکان بەرەو هەڵوێستە دژوارو جیاوازەکان دەبات.

بە رێکەوت ئەم دوو برایە خۆیان لە ناوەڕاستی ئەو دۆزەخەی شاردا دەبیننەوە. بەمبی دوای کۆمەڵێ پێکدادانی توندوتیژو کارەساتی یەك لە دوای یەك دایکی و گۆبۆی برای لەدەست دەدات. دوای ئەوەی بەمبی لەو جیهانە تەنهایەدا ناچار دەبێت بگەڕێت بە دوای باوکیدا. ئەو باوکەی هەرگیز بوونی بۆ نەبووە. گەڕانی بەمبی بەدوای باوکیدا گەڕانێکە بەدوای خودی خۆیدا. گەڕانی دۆزینەوەی ناسنامەو برایە. بەمبی گەرەکیەتی باوکی ژیانی منداڵی بۆ بگەڕێنێتەوە. ئەو ژیانەی کە بە تەواوەتی بێبەش بووە لە هەموو جۆرە هەست و سۆزێکی باوکایەتی.

Ginger Green هونەرمەندێکی بە سەلیقەو

پسپۆڕە لە بوارەکەی خۆیدا. بۆ بەرجەستەکردنی ئەم پرۆژەیەی، کۆمەڵی وێنەی ڤیدیۆ، تەکنیکێکی باڵای بەکارهێنانی دەنگێکی بەهێز، بەبێ ئەوەی کاریگەرییەکی نابەجێی بۆ بینەران هەبێت، توانیویەتی جیهانێکی بچوکی ئەفسونی بخوڵقێنێ. کەرەسە سەرەکییەکانی ئەم جیهانە ئەفسونیە، ئەپسوردە، بەکارهێنانی کۆمەڵێ بووکە شووشەی گرۆتێسک و کۆمدییە. ئەم بووکە شووشانە دەبنە کاراکتەرێکی راستەوخۆ بۆ بەرجەستەکردنی پاڵەوانەکانی ئەو چیرۆکە کلاسیکیە. ئەمە جگە لەو توانا ئەفسونیەی ئەو ئەکتەرە بە توانایانەی زۆر بە هێمنی و بلیمەتانە خۆیان لە پشت بووکە شووشەکانەوە مەڵاس داوە، بەبێ ئەوەی بینەران هەستیان پێبکات. ئەو ئەکتەرانە بوو بوونە کۆمەڵێ سێبەری بەهێز، تارمایی ئاسا بووکە شووشەکانیان دەجوڵان. ئەو ئەکتەرانە هێندە بە سەلیقە ئەو کارەیان بە ئەنجام دەگەیاند، بوو بوونە بەشێك لەو هاوکێشە توندوتیژە.

ئەم چیرۆکە رەشەی بەمبی دۆزەخێکی ئاشکرایە. مرۆڤەکان لەو دۆزەخەدا ژیان و جیهانێکی




پڕ لە کارەسات و توندوتیژیان خوڵقاندووە. هەروەها مرۆڤەکان قوربانیەکی راستەوخۆی ئەو کارەسات و ژیانە دۆزەخ ئاسایەن. بووکە شووشەکان هێندە نزیك دەبنەوە لە بینەرانەوە، هێندە بە سەلیقە هەڵدەسوڕێنرێن، هەروەك ئەوەی کۆمەڵی ئەکتەری راستەقینە، راستەوخۆ ئەو کاراکتەرانە نەمایش دەکەن.

لەنێو ئەو جیهانە ئەبسوردو پڕ لە مەرگەساتەدا ئاوازێکی خەمگین، هێلێکی پڕ لە ژان و ئازار دەبینین. دیمەنی ناشتنی براکەی بەمبی (گۆبۆ) یەکێکە لە دیمەنە پڕ لە هەست و وێنە بەرزەکانی نەمایشەکە، ئەم دیمەنە لە روانگەو دیدێکی هێندە رەش و پڕ لە ئازارەوە بەرجەستە دەبێت، وا دەزانی سەیری یەکێك

لە سیمەنە پڕ لە ئازارە فەلسەفیەکانی (بێکیت) دەکەیت.

*گرۆی Stuffed Puppet Theatre لە هۆڵنداوە

### *شانۆنامەی RE: Frankeinstein

ئەم نەمایشە جیهانێکی ئێجگار سەرسوڕهێنەرە. بە شێوازێکی قووڵ، پڕ لە وێنەو فەنتازیا باس لە دەست دانی پاکیزەیی دەکات. چیرۆکی ئەو خۆشەویستیە دەگێڕێتەوە کە لە ئەنجامدا دەبێتە رق و قین. باسی راوی ئەندێشەو خەیاڵ دەکات. زۆر بە وریایی ئەو نموونانە دەخاتە روو کە لە ناوەوەی خودی خۆماندایە. کار و پرۆژە هونەریەکانی ئەم گرۆیە نامۆ نیە بە رەخنەگرو بینەرانی شانۆی سویدی . هونەرمەند Neville Treter(5) بۆ پێنجەم جارە سەردانی وڵاتی سوێد دەکات.

ئەم هونەرمەندە بەتەنها لەسەر شانۆ لەگەڵ هەموو بووکە شووشەکاندا، یان بە واتایەکی راستر کاراکتەرەکاندا گەمە دەکات. بووکە شووشەکان دەبنە مرۆڤی راستەقینە، دەپەیڤن، پێدەکەنن، دەگرین و شانۆیەکی نموونەیی و بەرزت پێشکەش دەکەن.

Neville Tranter بە نەژاد ئوستورالیە. لە ساڵی 1978ەوە بنکە هونەریەکەی گوێزاوەتەوە بۆ شاری ئەمستردامی پایتەختی وڵاتی هۆڵاندو لەوێوە گەشتە هونەریەکانی بەجیهاندا دەکات. شێوازی ئەم هونەرمەندە زۆر تایبەتە، فۆرمێکە لە شانۆی بووکە شووشە کە خۆی پەرەی پێداوە. گەشەکردنی ئەم فۆرمە، ئەم ئەزموونە، بۆتە سیمایەکی تایبەتی شانۆی بووکە شووشەی گەورەکان. ئەم هونەرمەندە لە روانگەی پێکداچوونێکی زۆر رەنگینی ژیانێکی رۆژانەی پڕ لە خەندە لە لایەك و، هەڵوێستەیەکی گرانی کوشندەو توانایەکی بێ سنووری بەرجەستەکردن لەلایەکی دیکەوە، دنیایەك دەخولقێ پڕ لە وێنەی سەرسوڕهێنەر. وێنەو جەستەی بووکە شووشەکان دەبنە جۆرە پەیکەرێکی داتاشراوی پڕ لە جووڵە لەنێو دەزوولەکانی چاودا. بووکە شووشەی بچوك، ئاوازی مۆسیقایەکی تایبەتمەند، بووکە شووشەی گەورەو جەستەی پڕ لە وزەی ئەو هونەرمەندە خۆی هارمۆنیایەکی پڕ لە خولقاندن بەرجەستە دەکەن.

بابەت و سیماکانی ژیان: خۆشەویستی، قین، شانازی و هەستکردن بە گوناه، گیان دەکات بەو بووکە شووشانەدا و ژیانێکی گەورەیان پێدەبەخشێ، ئەم هونەرمەندە هەر خۆی بووکە شووشەکانی دروست دەکات، لەم رووەوە دەڵێت: من رووبەڕووی پیشەیەك بوومەتەوە پێویستی بە سەلیقەیەکی زۆرە لە ئیشی دەستدا، لە هەردوو بارەکەدا، لە کاتێکدا بووکە شووشەکان دروست دەکەم و لەو کاتانەشدا کە لەسەر شانۆ لەگەڵیان دەژیم و گەمەیان لەگەڵ دەکەم. لەو پرۆسەیەدا رووبەڕووی رەنگەکان، جووڵانەوە، شانۆو مۆسیقا دەبمەوە.

ئەم هونەرمەندە دووپاتی ئەوە دەکاتەوە کە دەیەوێت مرۆڤ رووبەڕووی خەون، خۆزگە، پێداویستیو سۆزەکانی ببێتەوە. هەروەها دووپاتی ئەو پرۆسێسەش دەکاتەوە کە ئەزموونەکەی پیا تێپەڕیووە. ئەزموونێکی سەخت و گران. ئەزموونێك کە کاتێکی زۆری ویستووە تا ئەم فۆرم و بەرئەنجامەی وەرگرتووە. لەو هاوکێشەیەدا زۆر گرانە کاراکتەری خۆت بدۆزیتەوەو لە هەمانکاتدا بەرەو پێشەوەشی بەریت، هاوتەریب لەگەڵ کاراکتەری بووکە شووشەکاندا. بووکە شووشەکان

کاراکتەری زۆر بەهێزن و بوونێکی شکۆدارو پڕ بەهایان لەسەر شانۆ هەیە. ئەم هونەرمەندە گەورەیە بە ژمارەی بووکەشووشەکانی لەسەر شانۆ، هێندە جۆری تۆنەکانی دەنگ، جوڵەی جەستە، سیمای دەم و چاو و کاراکتەری جیاواز پێشکەش دەکات. خۆی دەبێتە یەکێك لەو کاراکتەرە بووکە شووشەییانە. بووکە شووشەکانیش بە مرۆڤ و کاراکتەری راستەقینە.

### *گرۆی Eclats d'Etats لە فەرەنساوە.

*شانۆنامەی (یاداشتە زۆر تایبەت و نزیکەکانی مێشێك).

کێ لە ئێمە رۆژێك لە رۆژان نەی ویستووە، یان بیری نەکردۆتەوە ببێتە تەنها مێشێکی بچووك، بۆ ئەوەی بە نهێنی چاودێری هەڵوێستە نزیك و هاودەمەکانی ژیانی رۆژانەی مرۆڤ بکات؟ ئەگەری ئەو پرسیارە خۆی قوت دەکاتەوە. گەر مرۆڤ بۆ تەنها رۆژێك و بەبێ ئەوەی خۆی هەستی پێبکات ببێتە مێشێك؟ بیر لەوە بکەرەوە مێشێك گیزە گیزی دێت بەلای سەرمانەوەو لە تواناشیدایە جاسوسی بەسەر ژیانی ناوەوەمان، خەونەکانمان و هەموو هەست و سۆزێکیشمانەوە بکات.

ستركتوری ئەم نەمایشە لەسەر کۆمەڵێ پارچەی زۆر بچووك پێکهاتووە. نەمایشەکە جۆرێکە لە Performance و لە نواندن و ریژی کیژە هونەرمەندێکی گرێکی دانیشتوی فەرەنسا Katerini Antonakaki.

ئەم هونەرمەندە لە روانگەی کۆمەڵێ بووکە شووشەو فۆرمی جۆراوجۆری زۆر بچوکەوە کە بارستاییەکانیان تەنها 25 سم دەبێت و لە پانتاییەکی تەسك و بچکۆلەی بە تیشك دیاریکراودا بەرجەستەی کۆمەڵێ فۆرم، وێنەو جوڵانەوەی سەرسوڕهێنەر دەکات. نەمایشەکە وەك شیعری لێدێت و لێوان لێو دەبێت لە وێنەو فەنتازیا. فەنتازیا دەبێتە وێنەو وێنەش دەبێتە هەستێکی پڕ لە دەربڕینی شیعری. ئەو کیژە هونەرمەندە لە دارشتەیەکی وردی جوڵەئامێزو ریالێکی هونەریدا پرۆژەکەی پێشکەش دەکات. ئاوی باران کۆدەکاتەوە بۆ هێنانەدی خەونەکانی. خەونەکانیشی دەبێتە گەمەیەکی ساکاری پڕ لە هەست و دەربڕین.

جانتاکەی شانیشی جامێ ئاوی باران و کۆمەڵێ بووکە شووشەی وردی تیا هەڵگرتووە!

### پەراوێزەکان:

*1—شانۆی بووکە شووشە وەك فۆرمێکی شانۆیی بۆتە چەمکێکی تایبەت بە شانۆو جیهانی منداڵان. شانۆی بووکە شووشە لە نەستی خەڵکی و جیهانی شانۆدا بۆتە ئامرازێکی دەربڕینی جیهانە رەنگاو رەنگەکەی منداڵان. گومان لەوەدا نیە کە ئەو فۆرمە رۆڵێکی گەورەی گێڕاوە بۆ فراوانکردنی ئاسۆی بیرکردنەوەی منداڵان. هەروەها بەهەمان شێوەش بۆ خەڵکی گەورەش بۆتە سیمایەکی تایبەت و راستەوخۆی ئەو جیهانەی کە منداڵان تیایدا دەژین. کە دەوترێت شانۆی بووکە شووشە، واتا شانۆیەکی تایبەت بە منداڵان. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ کلتووری شانۆی ئەورووپی، گەر ئاوڕێکی خێرا بەسەر ئەو کلتەرەدا بدەینەوە دەبینین تا ئێستا شانۆو درامای ئەورووپی بووکە شووشەی تیا بەکارنەهێناوە. ئەو شێوازە نەبۆتە ئامرازێکی دەربڕینی ئەو ستركتورە درامییە. بەڵکو دواتر ئەو هونەرە وەك شانۆیەکی تایبەت بە منداڵان گەشەی کردووە. بەلام ئەم بارە لە کلتوورو شانۆیی رۆژهەلات و ئەفریقادا بە تەواوەتی جیاوازە. فۆرمەکانی شانۆی رۆژهەلات، بۆ نموونە ئۆپێرای*

پەکین، فۆرم و شێوازە سەماتامێزەکانی شانۆی باڵ لە ئەندەنیسیاو شانۆی نوێی یابانی بەکارهێنانی بووکە شووشە لایەنێکی گرنگی ئەو کلتوورو ستەرکتورە زۆر دێرینەیە.

2–ئەم هونەرمەندە بەر لە چەند ساڵێک لەمەوبەر وەک یەکێک لە باشترین ڕێژیسۆرەکانی ئەمریکا ئاماژەی بۆ کراوە. لەم چەند مانگەی رابردوودا پرۆژەیەکی ئۆپێرال بە هاوکاری کۆمپۆسیتۆر Steve Reich بەرهەمهێناوە. رەخنەگرەکان وەک پرۆژەیەکی زۆر جیاواز و تازەی بواری هونەری ئۆپێرا ئاماژەیان بۆ کردووە. ئەم هونەرمەندە هەتا ئێستا چەند جارێک سەردانی سوێدی کردووە. یەکێک لەو پرۆژانەی سوێدی کە رەخنەگرەکان لە ئاستێکی زۆر بەرزدا هەڵیان سەنگاندوە خوێندنەوە ئایبەتە بووکە شووشەییەکەیەتی بۆ شانۆنامەی (سۆناتای تارمایی) نووسەری سوێدی ستریندباری. ئەم ئەمایشەی راستەوخۆ بۆ شانۆی بووکە شووشەی ستۆکهۆڵم بەرهەمهێناوە.

رۆمان پاسکا لە شاری Newport لە وڵاتی ئیسلاند Island لە دایک بووەو هەر لە تەمەنێکی زۆر زووەوە لە نیزیک خۆی تەرخانی شانۆی بووکە شووشە کردووە.

3–ئەو دەزگا نێونەتەوەییەی شانۆی بووکە شووشە -Charleville Mezieres یەکێکە لە ناوەندە دەگمەنەکانی ئەمڕۆی جیهان. دەزگایەکی ئەرشیفی گەورە و گرنگ لەخۆدەگرێت و مەڵبەندێکی گرنگی لێکۆڵینەوەو سیمینارو دروستکردنی بووکە شووشەیە. ئەمە جگە لەوەی پەیمانگایەکی بەرزی هونەری بووکە شووشەش لە خۆدەگرێت و خوێندکاران لە هەموو جیهانەوە رووی تێدەکەن.

4–(بەمبی) جۆرە ئاژەڵێکی زۆر سووک و خۆشەویستە و لەناو کێڵگەو باخ و بێستانەکاندا دەژی، بەڵام لەلای ئەم گرایە ئەم ئاژەڵە بۆتە سمبولی کەسایەتیەکی نوێ، ئەو کەسایەتیە نوێیانەی شەو لە مەیخانە، باوەشی سۆزانیەکان، گەراجە کۆن و کۆڵانە تاریکەکانی ناو شارە گەورەکانی ئەمڕۆی ئەورووپادا بەسەر دەبەن.

5–ئەم هونەرمەندە لە تەمەنێکی گەورەدا دەستیکردووە بە شانۆی بووکە شووشە. سەرەتا لە زانکۆی Toowoomba Collegeti لە ئوسترالیا ئامۆژگای مامۆستایانی خوێندووە، تا ببێتە مامۆستا. لەم زانکۆیەدا بۆ یەکەمجار پەیوەندی کردووە بە بەشی درامادوە. لەوێوە حەزو ئارەزووی بۆ شانۆ دەست پێکردووە. دوای ئەوە لە ساڵی 1976دا دەبێتە قوتابی ڕێژیسۆر و پێداگۆگی ئەمەریکی Robert Gist. هەر لەو کاتەدا لەگەڵ گرۆی شانۆیی Billbar Puppet Theatre دەست بەکار دەکات. دوای ئەوە خۆی گرۆی Stuffed Pappet Theatre دادەمەزرێنێت. گرۆکەی بۆ یەکەمجار لە ئەورووپا لە فیستیڤاڵێکی شانۆییدا Festival of Fools لە ئەمستردام بەشداری دەکات. بەشدارییەکەی دەبێتە رووداوێکی گرنگ و سەرکەوتنێکی گەورەی هونەری بەدەست دەهێنێ. دوای ئەوە خۆی دەپێچێتەوەو بە تەواوەتی ئوسترالیا بەجێ دەهێڵێ و لە شاری ئەمستردامی پایتەختی وڵاتی هۆڵاند نیشتەجێ دەبێت.

### بەشێك لە ژیانی تایبەتیی

# گابریل گارسیا مارکیز

● و. لە فارسییەوە: فەرهاد



***گابریل خۆزە گارسیا مارکیز***

***Marquez Gabriel Jose Garcia***

لە شەشی مارتی ***1928*** لە شاری ئارکاتاکا ***Arcataca*** لە باکوری کۆلۆمبیا لە دایك بوو. باپیرو نەنکی- لە دایکیەوە- لە ناو خێزانێکدا گەورەیان کرد کە پڕ بوو لە پووپو وتەوتەی گیانە ئەفسوناویەکان، بۆ زیاتر تێگەیشتن لە ژیانی مارکیز دەبێت سەرەتا بەشێك لە مێژووی کۆلۆمبیا و پێشینەی خێزانی خۆیەوە دەست پێ بکەین.

## *کۆلۆمبیا*

## *Colombia*

وڵاتی کۆلۆمبیا له ساڵی *1810*دا لەدەست داگیرکاری ئەسپانیا رزگاری بوو، له باری یاساییەوە کۆنترین فەرمانڕەوایەتی دیموکراسی له ئەمریکای لاتیندا له کۆلۆمبیادا سەقامگیر بوە. بەڵام بەداخەوە ئەو دیموکراسیه به دەگمەن تامی عەدالەت و ئاسایشی چێشتوە.

کاتێك که ساڵی *1810* ناپلیۆن شای ئەسپانیای لابرد، ئەم دەوڵەته جاڕی سەربەخۆیی خۆی له ئەسپانیا دلو ماوەیەکی کەم ئەزمونی ئازادی کرد، پاشان له ساڵی *1815*دا جارێکی تر بەهۆی شەڕە خوێناویەکەی ژەنراڵ موریلو *Murillo*وە دەستی بەسەردا گیرایەوە. له ساڵی *1849*دا کۆلۆمبیا پێشڕەویەکی زۆری کرد. بیووە خاوەنی دوو حیزبی جیاواز، حیزبی پارێزگاران و حیزبی ئازادی خوازان. تا ئێستاش ئەم دوو حیزبه له کۆلۆمبیادا دەستبەکارن. ئەم دوو حیزبه بوونەته چوارچێوەی سیاسی گەلێك له بەرهەمی چیرۆکەکانی مارکیز و دەرکی راستەقینەی ئەم حیزبانه رێنمایی بەرهەمەکانی مارکیزن.

له تەواوی سەدەی نۆزدەدا، بەهۆی شۆڕش و شەڕی ناوخۆو راپەڕینەکانەوە کۆلۆمبیا بارێکی نالەباری تووش هات. رەشەکوژی خەڵك لەم سەدەیەدا بوە هۆی هەڵگیرسانی شەڕی هەزار رۆژە (*The War of a thousand days*) باپیری مارکیزیش بەشداری ئەم شەڕە دەکات، گەلێك له کۆنه سەربازانی ئەم شەڕە وەك کەسایەتی خەیاڵی له بەرهەمەکانی مارکیزدا جێگای ئەمری خۆیان دەدۆزنەوە.

کارەساتێکی تر که کاریگەری لەسەر بەرهەمی مارکیز داناوە، برەوی بازرگانی مۆزو رەشه کوژی ساڵی *1928*ە، ئەم رووداوە له رۆمانی سەد ساڵ تەنیاییدا رەنگی داوەتەوە. لەو رووداوە گرنگانەی تر که کاریان لەسەر بەرهەمی مارکیز کردوە، سەردەمی پڕ له ترس و هەراسێکه بەناوی (*Laviolencia* یان *The Violence*) ئەمە پاشان بووە باك گراوندێك بۆ چەندین چیرۆکی کورت و له هەموویان گرنگتر (*In Evil Hour*)ە.

ج گومان لەوەدا نیه که سەرەکی ترین کەسی مارکیز باپیرو نەنکین له دایکیەوەو، باپیری، سەرهەنگ *Nicolls Ricardo miraguez Mejsa* سەربازێکی کۆنەکاری ئازادی خوازی شەڕی هەزار رۆژه بوو، ئەو له "ئاراکاتاکا" دەژیا، گوندێك که خۆی دەستی هەبوو له دروست کردنیدا، ئەم سەرهەنگه نیمچه قارەمانێك بوو، ئەو بەرانبەر رەشه کوژیەکانی شەڕی مۆز *Banana Massacrs* هەروا دەستەوستان دانەنیشت و له ساڵی *1929*دا رەخنەی توندی له کۆنگرەی کۆلۆمبیا گرت. ئەو کەسایەتیکی سەیرو سەرنج راکێش و له حیکایەت خوانیشدا دەستێکی باڵای هەبوو، ژیانێکی سەرسوڕهێنەری بەسەر دەبرد، له تەمەنی لاویدا له شەڕێکی تەن بەتەندا پیاوێکی کوشتبوو، وەك دەڵێن زیاد له شانزه منداڵی بوە. له بارەی شەڕیشەوە وا قسەی دەکرد دەت وت باس له ئەزمونێکی خۆش و بەتام دەکات.

ئەم سەرهەنگه پیره هەندێك له فەرهەنگی زمان فێری گابریلی لاو دەکات. هەموو ساڵێك بۆ سێرکی دەبات و یەکەمین کەسه که نەوەکەی خۆی به کوشتنی خەڵکی تر ئاشنا دەکات. ئەو به مارکیزی لاو دەڵێت که هیچ کات و هیچ بەرپرسیاریەك له کوشتنی مرۆڤێك قورستر نیه. پاشان مارکیزیش له زمانی کەسەکانی ناو رۆمانەکانیەوە ئەم قسانه دەڵێتەوە.

ئەنکیشی لە هاوسەرەکەی کەمتر کاریگەری بەسەر بیری گابریلی لاوەوە نیە. بیری ئەویش وەك خوشکەکانی تری پڕە لە خورافات و بیری خەڵکی رەمەکی. بەردەوام لە ماڵدا باس باسی چیرۆکی تارمابییەکان، پێش بینی کردنی ئایندەو بەخت و بەدیومنیە کە سەرەنگ زۆر گوێیان پێ نادات. باپیری ئاگاداری گابریلی لاو دەکات کە بایەخ بەو جۆرە قسە پڕوپووچانە نەدات. کەچی گابریل گوێ لە قسەکانی دایە گەورەی دەگرێت چونکە لە چنینی ئەم درۆیانەدا دەستی باڵای هەیە. دایە گەورە، بێ گوێدانە ئەوەی کە ئەو شتانە ناواقیعین و دوور لە راستین وایان باس دەکات وەك ئەوەی تەواو راست بن، ئەمە هەمان شێوازی بێ گیان و هەستە کە نزیکەی سی ساڵ دوای ئەوە ئەوەی ئەو ژنە بۆ گەورەترین رۆمانی –سەد ساڵ تەنیایی– هەڵی دەبژێرێت.

گارسیا مارکیز لە ساڵانی بەرایی تەمەنیا؛ کەم و زۆر بە باوك و دایکی بێگانە بووە. بەڵگەکەیشی گرنگە، دایکی Luisa santiago Iguarjin یەکێکە لە دوو منداڵی خێزانەکە. ئەم کچە چالاك و جەربەزەیە حەز لە پیاوێك دەکات بەناوی Gabriel Elogoio Garcsa. بەڵام دایکی کچەکە بە چاوێکی سووك و نەفرەتیەوە لە گارسیا دەڕوانێت، یەکێك لە پاساوەکانی ئەوەیە کە گارسیا پیاوێکی پارێزگارو هەروەها (La hoiarasca)یە. ئەم زاراوە سووکە بەوانە دەوترا کە تازە هاتبوونە شارەوە، واتا (گەلای وشکەڵاتو) وەك هەر شتێك کە لە بەردەم بایەکی توندا سەرنگون بێت و لە گۆشەیەکدا فڕێ بدرێت.

گارسیا وەك مێبازێکیش ناوی دەرکردبوو، باوکێك کە خاوەنی چوار منداڵی ناشەرعیە. بەلای سەرەنگەوە گارسیا ئەو پیاوە نەبوو کچی ئەو بێنێت، گارسیا بە سازی ڤیلۆن، شیعری عاشقانە، نامەی زۆرو تەنانەت پەیامی تەلگراف خۆشەویستی خۆی بۆ کچەکە دەردەخات. خێزانی کچە زۆر هەوڵ ئەدەن کچەکەیان لە شەڕی ئەو پیاوە دووربخەنەوە، بەڵام ئەو دەست بەردار نابێت و، خێزانی گارسیا مارکیزیش لەوە دەگەن کە کچەکەیان بەڵێنی شووکردنی پێ داوە. لە ئەنجامدا هەموو ناچار دەبن لە بەردەم پێداگرتن و سووربوونی کچەکەدا قایل بن و سەرەنگیش بە ناچاری دەستی کچەکەی بخاتە نێودەستی ئەو پیاوەوە. ئەم مێردە تازەیە بۆ چاك بوونی پەیوەندی، لە شوێنی لە دایك بوونی کۆنی سەرەنگ ریو ئاکا Riohachaدا جێگیر دەبێت. رووداوە تاڵ و شیرینەکانی سەردەمی دەزگیرانیەتی ئەو دوانە پاشان لە قاڵبێکی تازەتردا لە رۆمانی –خۆشەویستی لە سەردەمی کولێردا– Love in the time of choleta دا شێوە دەگرێت.

گابریل لەناو خێزانێکدا لە دایك دەبێت کە تەنگژەی ماڵی و گیروگرفتی ژیانیان هەیە. پاشان بە پێی رێورەسمی ئەوسا باپیرو ئەنکی دەی بەنە لای خۆیان و بەخێوی دەکەن.

ساڵی 1928 دوا ساڵی برەوی مۆزە لە ئاراکاتاکادا. مان گرتن و پاشان تۆڵەکاریەکی بێبەزەییانە باری ئاسایشی شار تێك دەدات. تەنیا لە شەوێکدا زیاد لە سەد مان گرتوو لە ئاراکاتاکا دەکەونە بەر رێژنەی گوللەو لەناو دەچن، لاشەیان لەگۆڕی بە کۆمەڵدا دەشارنەوە. ئەم کارەساتە خەماویە لەبەرهەمە ئەدەبیەکانی مارکیزدا دەنگیان داوەتەوە.

گابریای چکۆلە کە بەناوی خۆمانەیی (Gabito) وە بانگ دەکرا، وەك منداڵێکی شەرمن و کەم دوو گەورە بوو. ئەو عاشقی چیرۆکەکانی باپیری و خورافەکانی ئەنکی بوو. بێجگە لە سەرەنگ و خۆی، ئەو ماڵە پڕ بوو لە ژن، لە دواییدا گارسیا مارکیز لە بارەی بیروباوەڕی ئەوانەوە دەڵێت: "هەندێك جار گفتوگۆکانیان ئەوەندەیان دەترساندم کە نەمدەوێرا لەسەر کورسیەکەم

هەستم" کەچی هەر ئەو ماڵە بوە سەرچاوەو جێگای داهێنانی کارەکانی ئایندەی. کارەساتی شەڕی ناوخۆو ڕەشەکوژی خەڵکی، دڵداریی باوك و دایکی، خورافاتی دایك سالار، هات و چۆی پوورەکانی، کچە ناشەرعیەکانی باپیری.. هەموو ئەمانە لەو ماڵەوە سەرچاوەیان گرت. ساڵانێکی دواتر گارسیا مارکیز دەنووسێت: "من وا هەست دەکەم کە هەموو نووسینەکانم لە بارەی ئەزموونێکەوە بوە کە لە کاتی ژیانم لەگەڵ باپیرو نەنکمدا بەدەستم هێناوە"

کە تەمەنی گابریل دەگاتە هەشت ساڵی باپیری دەمرێت، نەنکیشی ڕۆژ بە ڕۆژ چاوی کز دەبێت، بۆیە بە ناچاری گابریل دەگەڕێتەوە لای باوك و دایکی. باوکی گابریل لە دەرمانخانەیەکدا دەرمان دەفرۆشێت، کە گابریل دەگەڕێتەوە لایان یەکسەر بڕیاری ئەوە دەدەن کە بیخەنە خوێندنگایەکی ڕەسمیەوە. بۆیە دەینێرنە قوتابخانەیەکی ئێوارانەوە کە دەکەوێتە بارانکیلا (Baranguilla) وە، شارێکی بەندەری لە ڕێژگەری ڕوباری ماگدالنادا. لەوێ گابریل دەگۆڕێت بە کوڕژیلەیەکی کەم ڕو کە شیعری تەنز دەڵێت و وێنەی کاریکاتێری دەکێشێت، ئەوەندەیش جیدیە کە لەگەڵ لەشی بچووك و لاوازیشیدا هاوپۆلەکانی پێی دەڵێن "پیرەمێرد".

ساڵی 1940 کە تەمەنی دوانزە ساڵە، بە یارمەتی ئەو خەرجی خوێندنەی کە دەیدەنێ دەڕواتە ناوەندی قوتابیانی زۆر زیرەکەوە. قوتابخانەی ناوەندی The Liceo Nacional لەلایەن ڕاهیبانی یەسوعیەوە بەڕێوە دەچوو، (یەسوعیەکان ئەو ڕاهیبانەن کە ساڵی 1953 ئیگناتیوس لویولا دای مەزراند). ناوەندیەکە دەکەوتە زیپاکوییر Zipagulr وە. ئەم شارە دەکەوێتە سێ کیلۆمەتری باکوری بوگوتا Bogota وە، گابریلی لاو بە سەفەر دەڕواتە بۆگوتا، سەفەرەکەی هەفتەیەك دەخایەنێت. ئەو کە یەکەمجاریەتی بڕواتە پایەتەخت، ئەو شارە وا دەبینێت کە خەمهێن و دڵتەنگ کەرە. ئەم ئەزموونەهانی گابریلی لاو دەدات کە شناسی خۆی بە ناونیشانی (costeo)دا بنێت.

وانەکانی قوتابخانەی ناوەندی خۆشیەك بە گابریل دەبەخشن و هەموو دوا نیوەڕوانێك بۆ هاوڕێکانی ناوخۆیی بە دەنگی بەرز کتێب دەخوێنێتەوەو، عەشقی بۆ ئەدەبیات و چیرۆك و کاریکاتۆر ڕێگای ئایندەی بۆ ساز دەکات. هەر ئەو هۆیانەن کە دەبنە ئەستێرەی ڕێنماییکەری تا بتوانێت کەشتیی خەیاڵی بەرەو ڕاستەڕێ ببات.

گابریل دوای تەواو کردنی قوتابخانەی لە ساڵی 1946دا لەسەر حەزی باوك و دایکی و بە پێچەوانەی ئارەزووی خۆی کە ڕۆژنامەنووسیە لە بەشی حقوقی زانکۆی شاری بوگوتا ناونووسی خۆی دەکات. هەر لەو کاتەیشدایە کە هاوسەری ئایندەی هەڵدەبژێرێت، ئەو کە بۆ دیدەنی باوك و دایکی دەچێت لەگەڵ کچێکی سیانزە ساڵیدا بەناوی میرسیدس بارکا پاردو Mercedes Barcha Pardo دۆستایەتی پەیدا دەکات. ئەو کچە گەنم ڕەنگ و کەمدوو بنەچە میسریە، دلگیرترین کچێکە کە تا ئەوسا دیبوی، ئەو پێش ڕۆیشتنە زانکۆی، پشوو کورتەکانی لای دایك و باوکی بەسەر دەبردو هەر ئەوکاتەیش خوازبێنی کچەکە دەکات. میرسیدس بەو مەرجە قایل دەبێت کە دوای تەواوکردنی قۆناغی ناوەندی خۆی ببنە دەزگیران. ئەگەرچی ئەوان تا چواردە ساڵی دوایی نابنە ژن و مێرد، بەلام میرسیدس هەموو ئەو ماوەیە هەر بە وەفاداری دەمێنێتەوە.

*سەرچاوە:*

*گۆڤاری گولستانە، ژمارە 21 ساڵی 1379*

# ئالیس مۆنرۆ

## 30 ساڵ لەگەڵ غەم و بزەی ژنانی کەنەدا دا

● و. لە فارسییەوە: محەمەد کەریم

### ساڵژمێری ژیانی ئالیس مۆنرۆ

*رۆژی 1931/7/10 لە وینگهم ی ئەنتاریو لەدایك بووە.

*ساڵی 1949 زانکۆی وینگهمی تەواو کردووە.

*ساڵانی 1949- 1951 لە زانکۆی ئەنتاریوی خۆراوا بووە.

*ساڵی 1950 یەکەم کورتە چیرۆکی بڵاوکردۆتەوە بە ناونیشانی لایەنەکانی شەبەنگێك.

*ساڵی 1951 شووی کردووە بە جیمز مونرۆ و چۆتە ڤنکووری ویلایەتی بریتش کولومبیا.

*ساڵی 1953 یەکەم کچی بەناوی شیلا لەدایك بووە.

*ساڵی 1957 دووەم کچی بەناوی جینی لە دایك بووە.

*ساڵی 1963 چۆتە ڤیکتوریا و دوکانی کتێب فرۆشی بەڕێوە بردووە.

*ساڵی 1966 سێیەم کچی بەناوی سارا لە دایك بووە.

*ساڵی 1968 یەکەم کۆمەڵە چیرۆکی بەناوی (سەمای تارماییە شادومانەکان) بڵاوبۆوە و گرنگترین خەڵاتی ئەدەبی



کەنەدای بەدەست هێنا.

*ساڵی 1971 کتێبی (ژیانی کچان و ژنان)ی بڵاوکردەوە.

*ساڵی 1972 لە جیمز مونرو جیابۆتەوە.

*ساڵی 1973 کتێبی (ئەوەی کە دەمەوێ بە تۆی بڵێم)ی بڵاوکردەوە.

*ساڵی 1976 شووی کردۆتەوە بە جراڵد فرملین و لە کێڵگەیەك لە ئەنتاریو نیشتەجێ بووە.

*ساڵی 1978 کتێبی (پێت وایە کێیت)ی بڵاوکردۆتەوەو گرنگترین خەڵاتی ئەدەبی کەنەدای بەدەست هێناوە.

*ساڵانی 1979–1982 سەردانی ئوستralیاو چین و وڵاتانی ئەسکەندەناڤیای کردووە.

*ساڵی 1982 کتێبی (مانگەشەوەکانی بەرجیس)ی بڵاوکردۆتەوە.

*ساڵی 1986 کتێبی (رەوتی عەشق)ی بڵاوکردۆتەوەو گرنگترین خەڵاتی ئەدەبی کەنەدای بەدەست هێناوەتەوە.

*ساڵی 1990 کتێبی (دۆستی گەنجیم)ی بڵاوکردۆتەوەو خەڵاتی ئەنجومەنی مولسنی کەنەدای وەرگرتووە.

1994* کتێبی (رازە ئاشکراکراوەکان)ی بڵاوکردۆتەوە.

1996* کتێبی (هەڵبژاردەی چیرۆك)ی بڵاوکردۆتەوە.

### *غەم و شادی ژنی خۆرئاوایی لە چیرۆکەکانی ئالیس مۆنرۆدا:*

ئەگەر بڕیار بێ خەڵات بە نووسەرانی کورتە چیرۆك بدەن بێگومان ئالیس مۆنرۆ یەکەم چیرۆك نووس دەبێ کە ئەو خەڵاتە دەباتەوە. خاڵی دیارو بەرجەستە لە ئیشی مۆنرۆدا بریتییە لە چیرۆك نووسین لە قاڵبێکی دژواری رەمز کراوە Open Secretداو ئالیس چەند نموونەیەکی جوانی هەیە لەم ژانرەدا. کۆمەڵێ چیرۆکی کە هەشت چیرۆکی لەخۆگرتووە بەهەمان شێواز نووسراون.

ئەم چیرۆکانە دەربارەی ئەو ژنانەن کە بەنیگەرانیو دڵەراوکێوە لە نێوان رابردووی کۆن و ئێستایاندا گیرۆدەن کە بە ناراستەی سەیرو سەمەرەدا دەیانبات.

مەعنای ناوەرۆك لەم بەرهەمانەدا شاراوە نین و لایەنە رەگەزییەکان لە هونەری جوانی مۆنرۆدا بە ئاشکرا بەرچاو دەکەوێ. لە یەکێك لە چیرۆکەکاندا ژنێکی گەشتیاری کەنەدایی کە بەرنامەی سەفەرەکەی گۆڕیوە بۆ شاخەکانی باشووری خۆرهەڵاتی ئەورووپا، کەوتۆتە داوی تیرەیەکی گیگەکانەوە (تیرەیەکی ئەلبانیایین) و بە زۆر کاری پێ دەکرێ. باری ژیان لەم گوندەدا بە شێوەیەکە کە کارەکتەری چیرۆکەکە تووشی بێ ئاگایی و خەواڵویی دەکات، تا ئەو شوێنەی کە "خود"ی پێشووی فەرامۆش دەکات. شێوەی مامەڵەو رەفتاری خەڵکی دابڕاوی ئەو گوندە مەسیحی نشینە، لەگەڵ ژنە گەشتیارە گیرۆدەکەدا زۆر بە توندی و ناخۆشی نیشان دەدرێ. بە جۆرێك کە کارەکتەری چیرۆکەکە کە ژنەکەیە بۆ خۆبەدوورگرتن لە ئازاری خێڵەکە ناچار دەبێ لە ئارەزووە سێکسیەکانی دووربکەوێتەوە. ژیانی تەنهایی هەڵبژێرێ و جلی پیاوانە لەبەر بکات. ئەوەی لێرەوە مۆنرۆ هەوڵ دەدا بە خوێنەری بڵێ ئەوەیە کە نابێ بە ئاسانی باوەڕ بە ئەرمی کارەکتەرەکان بکرێ.

چیرۆکەکەی مۆنرۆ فۆرمێکی ئەدەبی و نووسینەوەی رووداوێکە کە لە بیستەکانی سەدەی بیستدا لەناو خێڵی گیگەکاندا لە ئەلبانیا رووی داوە. ئەم بەسەرهاتە لە

لایەن ژنێکەوە بۆ راوی چیرۆکەکە گێڕراوەتەوە. ئەگەرچی متمانەی راوی بەشێوەیەك لای خوێنەر دەکەوێتە بەر پرسیارەوە، بەڵام مۆنرۆ بە هونەرمەندیی تەواوەوە حەقیقەت و خەیاڵی لەم بەسەرهاتە سەیرەدا پێکەوە چنیووە.

ئەو ژنەی کە گیرۆدەی گیگەکان بووە خاوەنی کتێب فرۆشیەکە لە بریتش کۆڵۆمبیا کە لە کاتی گیرۆدەییەکەی خۆیدا گۆڕانی بەسەردا دێت.

لە چیرۆکێکی دیکەی مۆنرۆدا (کاتیبە)ی شارۆچکەیەکی سەر بە ئەنتاریو لەکاتی جەنگی جیهانی یەکەمدا، لەگەڵ سەربازێکدا نامە ئاڵوگۆڕ دەکات. سەربازەکە لە دوای تەواوبوونی جەنگ دەگەڕێتەوە بۆ وڵاتەکەی و لەگەڵ ژنێکی تردا زەماوەند دەکات. (کاتیبەکە) ئەم زەماوەندکردنە وەکو خیانەتێك لە بەرامبەر خۆیدا لێك دەداتەوەو بە هەستێکی پەرێشانەوە کە لە جۆرێ هەستی بێ دەسەڵاتیەوە سەرچاوەی گرتووە گیرۆدە دەبێ. چیرۆکی ئەم ژنە نیمەنێکە لە پەرێشانی ژنی خۆرئاوا، نزەکردنی هەستی چاوەڕوان نەکراو، جادوو دڵدانەوەی رۆشن و خێرا بەشێوەیەکی تەواو نیشان دەدرێ.

ساڵانێکی زۆر درێژەی کێشاوە تا مۆنرۆ لە رێگەی چیرۆك نووسینەوە گەیشتۆتە دەرك و تێڕوانینێکی وا، مۆنرۆ روانگەیەکی وردو دەربڕینێکی پێگەیشتووی سەبارەت بە چارەنووسی نادیاری ژنی خۆرئاوا بنیات ناوە. بەڵام فەزای چیرۆکەکانی مۆنرۆ هەمیشە رەش و لێڵ نییە. مۆنرۆ لە چیرۆکی *The Jack Randa Hotel*دا وێنەی ژیانی کۆمیدی چەند کەسێك لە چینی خواپێداوی کۆمەڵ دەکێشێ. لەم چیرۆکەدا ژنێك هەتا نیوزیلەندە تاقیبی مێردە هەڵاتووەکەی دەکات و لەوێ دەبێتە کۆسپ لە رێگەی ناردنی نامەی عاشقانەی مێردەکەیدا بۆ ژنێکی دیکە. ئەم نامەکانی مێردەکەی وەردەگرێ و خۆی لە جیاتی ژنە نەناسراوەکە وەڵامی بێ باکانەو پڕ لە گاڵتەو خۆشی بۆ مێردەکەی دەنێرێ و بەم شێوەیە تۆڵە لە مێردە خیانەتکارەکەی دەکاتەوە.

سەرچاوەی هەموو چیرۆکەکانی مۆنرۆ بریتییە لە ژیانی لادێ لە ئەنتاریوی کەنەدا؛ واتە ئەو شوێنەی کە نووسەری لێ گەورە بووە. ئەم ناوچەیە وەکو خۆرئاوای ناوەند (لە ویلایەتە یەککگرتووەکان) وەکو جێگایەکی ئاشنا دێتە بەرچاو. بیابانێکی بێزاری هێنەرە کە تیایدا هەتا شتە سەیرو سەمەرەکان ئاسایی نیشان دەدرێن.

لە چیرۆکێکی دیکەدا کچێك پەیدا دەبێت کە لە رووبەڕووبوونەوەی کەشتیەکی ئاسمانیدا چەند داوایەکی سەیر دەردەبڕێ. ئەو کچە دەڵێت ئەو بوونەوەرانەی لە دەرەوەی زەوی بینیوونی بەهیچ جۆرێ ئەندامی سەیرو سەمەرەیان نییە بە رەنگی سەوزو.. بەڵکو هەموو ئەوانە منداڵی کەنەداین بە پانتۆڵی خەت خەتەوە. ئەم چیرۆکە خەیاڵییە بەشێوەیەك گوزارشتی لێ دەکرێ کە لە مێشکی خوێنەردا بە شێوەی چیرۆکێکی تەواو باوەڕپێکراو جێگیر دەبێ.

مۆنرۆ بالادەستی خۆی لەم جۆرە پەیوەندییەدا لەگەڵ خوێنەر وەها نیشان دەدات کە هەریەکە لە کورتە چیرۆکەکانی دەوڵەمەندترو بەچێژتر لە زۆر رۆمان دەنوێنێ.

**سەرچاوە:**

*گۆڤاری گلستانە، ژمارە 24*

# شەڕ لەگەڵ فۆکۆ

● و. لە عەرەبییەوە: ئاژان



*ئێستا تەمەنت (38)ساڵەو بە بچوکترین فەیلەسوفی ئەم نەوەیە دادەنرێیت. ئەم کتێبەی دواییت (وشەکان و شتەکان) هەوڵ دەدات ئەو شتانە بپشکنێ کە لەم بیست ساڵەی دواییدا لە مەیدانی فیکردا گۆڕاون و پێشت وایە بوونگەرایی و فیکری سارتەر (بۆ نموونە) بەرەو ئەوە دەچن ببنە شتی کەلەپووری و لەمۆزەخانە دابنرێن. هەروەها تۆ لە فەزایەکی فیکریدا دەژیت کە سەرتاپای تازە بۆتەوە.. دیارە ئێمەش بێنەوەی تێبینی بکەین تیایدا دەژین. کتێبی (وشەکان و شتەکان)یش کە تا رادەیەك پەردە لەسەر ئەم تازەبوونەوەیە لادەبات، کتێبێکی قورسە. ئایا دەتوانیت بە رێگەیەکی ئاسانتر

وەلامی ئەم پرسیارە بدەیتەوە (ئەگەرچی ئەمە لەسەر حسابی وردبینی بێت): گەیشتیتە کوێ؟ گەیشتینە کوێ؟

فۆکۆ: ئەوە بۆ پانزە ساڵ دەچێت بێ هیچ هۆیەکی ئاشکراو لە ناکاو بۆمان دەرکەوت تەواو لەو نەوەیەی پێش خۆمانەوە دووریـن، ئەوەی سارتەرو میرلۆپۆنتی، ئەوەی گۆڤاری (زەمەنە تازەکان) کە یاسای بیرکردنەوەو بوونی ئێمەیان پێکهێنابوو.

*مەبەستت لە بەکارهێنانی راناوی (ئێمە) لە (بۆمان دەرکەوت)دا کێیە؟*

فۆکۆ: مەبەستم لەو نەوەیەیە کە لەکاتی شەڕدا تەمەنیان نەگەیشتبووە بیست ساڵ، بە دڵنیاییەوە ئێمە ئەوەی سارتەرمان وەکو نەوەیەکی ئازاو پیرۆز دەناسی، نەوەیەک کە سەرگەرمی بوون و ژیان و سیاسەت بوون.. بەڵام ئێمە بۆخۆمان شتێکی دی، سەرگەرمیەکی دیکەمان دۆزیەوە: ئەویش سەرگەرمیە بە وێناکردن و ئەو شتەی ناوی دەنێم (سیستەم)..

*سارتەر وەک فەیلەسوفێک بایەخی بەچی ئەدا؟*

فۆکۆ: بە گشتی دەکرێ بڵێین جیهانی بۆرژوازیو نەریتەکانی کە سارتەر هەمیشە لە ڕوویەڕووبوونەوەدا بوو لەگەڵیان و خۆی تیا نەدەبینیەوە، سارتەریان وەک بێهودەیەک نیشان دەدا. بە پێچەوانەی ئەوەشەوە سارتەر ویستی نیشانی بدات کە لە هەموو شوێنێکدا مانا هەیە، بەلام ئەم دەربڕینە لای خۆشی بە ئالۆزی مایەوە. چونکە کاتێ دەڵێیت مانا هەیە (هەر مانایەک بێت) لە هەمان کاتدا فەرمان دەکەیت و شتێك دەسەلمێنێت و ئاراستە دەکەیت.. ئەگەر مانا هەبێت، واتا دەبێ مانا ببەخشینە هەموو شتێك. ئەوەش مانایەك بوو بەدەست ئالۆزییەکی سەختەوە دەیناڵاند: بەرئەنجامی پرۆسەی کردنەوەی هێماکانی خوێندنەوەیەك بوو لە خوێندنەوەکان، وەك ئەو پێکهاتە تەمومژاویەی بێ ویستی خۆمان لە کردەوەکانماندا دەردەکەوێ و دەبینرێ.

*ئەی کەی باوەڕت بە مانا نەما؟*

فۆکۆ: ئەو ڕۆژەی شتراوس بۆ کۆمەڵگەکان و لاکان بۆ ناهۆشیاری دەریانخست مانا لە ئەنجامێکی روکەش زیاتر نەبووەو، ئەوەی لە ناوەوە بەرماندەکەوێ، ئەوەی لە پێشمانەوەیە و لە کات و شوێندا پاڵی پێوە داوین (سیستم) بووە.

*مەبەستت لە (سیستەم) چیە؟*

فۆکۆ: مەبەستم لە وشەی (سیستم) کۆی ئەو پەیوەندیانەیە کە (لە دەرەوەی ئەو شتانەی دەیانبەستێت بەیەکەوە) بە شێوەیەکی سەربەخۆ جێگیر دەبن و دەگۆڕێن. بۆ نمونە، لێکۆڵینەوە دەری خستووە کە ئەفسانە رۆمانی و ئەسکەندنافی و سلتیەکان چەندەها خواوەندو پاڵەوانی لەیەك جیاوازیان هەیە (تێدایە)، بەلام ئەو ڕێکخستنەی بە یەکتریانەوە دەبەستێ (سەرەڕای پێکهاتەکانی ئەو کولتورانە لە یەکتری)، وە کۆی پلەبەندی و ململانێ و خیانەت و هاوپەیمانێتی و ریسکەکانیان.. هەموو ملکەچی یەك سیستەمن. هەندێ کەشفی دیکەش کە تازە لە بواری (قۆناغەکانی بەر لە مێژوو)دا کراون یارمەتیدەرن بۆ ئاشکراکردنی ئەوەی کە دابەشکردنی وێنەی سەردیواری ئەشکەوتەکان ڕێکخستنێکی

توندوتۆڵی لە پشتەوەیە. دیارە ئەوەش دەزانیت لە بواری بیولوژیادا شریتی کرۆمۆسۆمەکان هەڵگری کۆی ئەو ئاماژە بۆماوەییانەن کە ڕێگە بۆ پەرەسەندنی بوونەوەرەکە لە ئاییندەدا خۆشدەکەن، ئەوەش لە شێوەی سیستمێك هێما یاخود لە شێوەی پەیامێکی بە هێماکراو (مرموز)دا.. گرنگی (لاکان)یش لەوەوە دێت کە لە ئاکامی گوتارو دیاردە نیرۆسیەکانی نەخۆشەکەوە دەریخست ئەوەی قسە دەکات ئەو کەسە خۆی نیە بەڵکو بونیادو سیستمی زمانەوانیە. ئا بەو شێوەیە بەر لە هەر بوون و تاکێکی مرۆیی، مەعریفەو سیستمێك هەن دەمانەوێ سەرلەنوێ کەشفیان بکەینەوە.

*بەڵام کێ ئەم سیستمە بەرهەمدەهێنێ و دروستی دەکات؟*

فۆکۆ: ئەو سیستمە دەبەنگە چیە کە کەسێك نیە بەرهەمی بهێنێ؟ کێیە بیردەکاتەوە؟ سەیری ئەدەبی تازە بکە، وشەی (من) -واتە خود- تەقیەوەو نەما. ئێمە ئێستا لە قۆناغی کەشفکردنی ئەو شتەداین کە هەیە. شتێك هەیە نادیارو نەزانراوە. ئێمە لێرەدا -لە ڕوویەك لە ڕووکانەوە- دەگەڕێینەوە بۆ تێڕوانینی سەدەی هەفدەیەم: ئەگەر لە سەدەی هەفدەیەمدا مرۆڤ خرایە جێگەی خودا، ئەوا جیاوازی ئێمە لەگەڵ ئەو کاتە ئەوەیە کە فیکرێکی دەبەنگ دەخەینە جێگەی، کە فیکری مەعریفەو زانینە بێ خودێکی زانیار، فیکرێکی تیۆریزەکراو کە شوناسی نیە..

*ئەی گرنگی ئەوە بۆ ئێمە چیە، خۆ ئێمە فەیلەسوف نین؟*

فۆکۆ: شێوەی بیرکردنەوەی خەڵك، نوسینیان، قسەکردنیان، حوکمدانیان بەسەر شتەکاندا (تەنانەت ئەو گفتوگۆیانەی لەسەر جادەو نوسینی ڕۆژانەدا هەن)، بەڵکو تەنانەت شێوەی هەستکردنیان بە شتەکان و چۆنیەتی وروژانی هەست و هەڵسوکەوتەکانیان، لە هەموو سەردەمێکدا بونیادێکی تیۆری (سیستمێك) حوکمی دەکات کە بە پێی سەردەم و کۆمەڵگاکان دەگۆڕێت، بەڵام لە هەموو کۆمەڵگەو سەردەمێکیشدا ئامادەگیی هەیە.

*سارتەر فێری ئازادی کردین ئەوەتا ئێوەش پێمان دەڵێن بە ئازادی بیرکردنەوەیەکی ڕاستەقینە بوونی نیە؟*

فۆکۆ: ئێمە لەناو فیکرێکی دەبەنگ و بە زەبرو هێزدا بیردەکەینەوە، کە فیکری سەردەمێکی دیاریکراو و زمانێکی دیاریکراوە. ئەم فیکرو زمانە یاسای تایبەت بەخۆیان هەیە. کاری ئێستای فەلسەفەش وەك هەموو لقەکانی دیکەی لێکۆڵینەوەی تیۆری کە باسمکردن، بریتیە لە کەشفکردنی ئەو فیکرەی دەکەوێتە پێش هەموو فیکرێك و ئەو سیستمەی دەکەوێتە پێش هەموو سیستمێکەوە.

ئەمە ئەو بنەمایەیە کە بیروڕای سەربەخۆی ئێمەی لێوە هەڵدەقوڵێ و بۆ ساتێك تیایدا دەدرەوشێتەوە.

*ئەی سیستمی ئەمڕۆ چیە؟*

فۆکۆ: تا رادەیەك هەوڵمداوە لە کتێبی (وشەکان و شتەکان)دا بۆی بگەڕێمەوەو بیدۆزمەوە.

*ئەی تۆ لەو کاتەدا لە دەرەوەی ئەو سیستمە بوویت؟*

فۆکۆ: بۆ ئەوەی بتوانم بیر لە سیستم بکەمەوە، پێشوەخت بە

سیستمێکەوە پابەندبووم کە لە پشتی سیستمەکەوەیە. ئەویش سیستمێکە نایناسم و چەندێکیش بۆی بگەڕێم، هەرچەندێکیش بدۆزرێتەوە پاشەکشێ دەکات و خۆی نادات بەدەستەوە.

** ئەی لەناو ئەم هەموو شتەدا چارەنوسی مرۆڤ چییە؟ ئایا ئەمە سەرەتای بونیادنانی فەلسەفەیەکی تازەیە بۆ مرۆڤ؟ ئایا لە نێوان کۆی لێکۆڵینەوەکانت و زانستە مرۆڤایەتییەکاندا پەیوەندییەك هەیە؟*

فۆکۆ: بە روکەشی بەڵێ. من کەشفەکانی لیڤی شتراوس و لاکان و دومیزیل بە زانستە مرۆڤایەتییەکان ناوزەد ئەکەم. بەڵام تایبەتمەندێتی ئەم لێکۆڵینەوانە لەوەدایە کە نەك تەنها ئەو وێنە باوە ئاسڕنەوە کە پێشتر دەربارەی مرۆڤ دروستمان کردبووە، بەڵکو ئایدیای مرۆڤ خۆی بە شتێکی بێسوود دەزانن، ئەوەش لەسەر ئاستی لێکۆڵینەوەو بیرکردنەوە. قورسترین میراتێك کە لە سەدەی نۆزدەیەمەوە بۆمان ماوەتەوەو کاتی ئەوە هاتووە لێی دەرباز بین هیومانیزمە.

**تەوژمی هیومانیزم؟*

فۆکۆ: تەوژمی هیومانیزم لەکاتی خۆیدا رێگە چارەیەك بوو بۆ گرفتەکان بەهۆی رەوشت و ئاشت بوونەوەو بەهاکانەوە، لە کاتێکدا گرفتەکان بە هیچ جۆرێك چارەسەر نەدەکران. ئەو رستەیەی مارکس دەزانیت کە دەڵێت: "مرۆڤایەتی تەنها ئەو گرفتانە باس دەکات و دەیانهێنێتە پێشەوە کە خۆی دەتوانێ چارەسەریان بکات". بەڵام بەڕای من دەکرێت بڵێین: "تەوژمی هیومانیزم چارەسەری ئەو گرفتانە دەکات (چارەسەر بۆ ئەو گرفتانە دەدۆزێتەوە) کە ناتوانێ بیریان لێبکاتەوەو بیانخاتە بەر باس و لێکۆڵینەوە.

** بەڵام کام گرفتانە؟*

فۆکۆ: گرفتی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و جیهان، گرفتی واقیع، گرفتی داهێنانی هونەری، گرفتی شادیو هەموو ئەو وەسواسیانەش کە شایەنی ئەوە نین بە گرفتی تیۆریان لە قەڵەم بدەین.. هەرگیز سیستمی ئێمە بایەخ بەم گرفتانە نادات. کاری سەرەکی ئێستاشمان بریتیە لەوەی بە تەواوەتی لە تەوژمی هیومانیزم دەرباز بین، بەم مانایەش کارەکەمان دەبێتە کارێکی سیاسی.

** ئەی سیاسەت لە کوێی ئەمەدایە؟*

فۆکۆ: لە رزگارکردنی مرۆڤ و دوبارە کەشفکردنەوەی مرۆڤ لەناو مرۆڤ خۆیدایە.. هتد.. لە کۆتایی هێناندا بەو هەموو هەوڵدانە تیۆری و پراکتیکیە بێبەرانەی هەوڵ دەدەن مارکس و دوشاردان (بۆ نمونە) بەیەکەوە بگونجێنن (ئەو هەوڵانەی بە رادەیەك لە تەوژمی هیومانیزمدا نقوم بوون کە چەند ساڵە بیرکردنەوەیان توشی نەزۆکی کردووە).

کاری سەرەکی ئەمڕۆشمان بریتیە لەوەی بەتەواوەتی رزگارمان بێت لە تەوژمی هیومانیزم. بەم مانایەش کارەکەمان دەبێتە کارێکی سیاسی، بەو پێیەی هەموو سیستمە خۆرهەڵاتی و خۆرئاواییەکان لەژێر ئاڵای تەوژمی هیومانیزمدا بەرهەمە گەندەڵەکەی خۆیانمان پێدەگەیەنن. دەبێ ئێمەش هەموو ئەم چاوبەستەگیکردنانە ریسوا بکەین. وەك ئەوەی ئێستا لەناو حیزبی کۆمۆنیستدا ئالتوسێرو هاورێکانی دەیکەن، کە لە دژی تەوژمی (شاردانیزم- مارکسیزم) خەبات دەکەن.

***ئەی تا چ رادەیەك ئەم فیكرە بڵاوبۆتەوە؟**

فۆكۆ: ئەم بیروبۆچوونە زیاتر لەناو ئەو گروپانەدا بڵاوبۆتەوە كە ناتوانین دەستنیشانی بكەین. ئەو گروپانەی لە رۆشنبیرە فەرەنسیەكان و زۆربەی قوتابی و مامۆستا گەنجەكان پێكهاتووە. بێگومان لەم بوارەدا برێك بەرهەڵستی هەن، بەتایبەتی لە لایەن زانستە مرۆڤایەتیەكانەوە. چونكە سەلماندنی ئەوەی كە مرۆڤ هەرگیز لە مەعریفەو تیۆرە رزگاری نابێت لە زانستە مرۆڤایەتیەكاندا (بەتایبەتی ئەدەب) قورسترە تا لۆجیك و ماتماتیك.

***ئەی ئەو بزوتنەوەیە لەكوێ لەدایكبوو؟**

فۆكۆ: نارسیزم و تاكڕەهەندی زمانی فەرەنسیەكان (احادیة اللسان) بەرەو ئەوەی بردن وا بزانن خۆیان یەكەم كەسن كایەی ئەم گرفتانەیان دۆزیوەتەوە. لە كاتێكدا ئەم بزوتنەوەیە لە ئاكامی ئەو كارانەوە لە ئەمریكاو ئینگلتەرەو فەرەنسا گەشەی سەند كە راستەوخۆ لە پاش جەنگی جیهانی یەكەمەوە لەو وڵاتانەدا كران كە بە زمانی سلاڤی و ئەڵمانی قسە دەكەن. ئەو كاتەی چل ساڵ بەسەر سەرهەڵدانی (بزاوتی رەخنەیی تازە) لە ئەمریكا تێپەڕی، ئەوكاتەی هەرچی كارە لۆجیكیەكانی ئەمریكاو بەریتانیای مەزنە كرابوون، ژمارەی زمانەوانە فەرەنسیەكان -تا ئەو ساڵە نزیكانەی رابردوو- لە ژمارەی پەنجەكانی یەك دەست تێپەڕی نەدەكرد. ئێمە هۆشیاریەكمان هەیە كە ناتوانێ لە سنوری جوگرافی فەرەنسا بۆ رۆشنبیری تێبپەڕێت، هۆشیاریەك كە بە شیاوی دەزانێت دیگۆل بە رۆشنبیر لە قەڵەم بدات- ئەوەش بۆ خۆی شتێكی سەیرە!

*گرفتەكە لەوەدایە ئەوانەی خاوەنی رۆشنبیریەكی جۆراوجۆرو هەمەڕەنگن وا هەست دەكەن لە كاروان جێماون. ئایا ئەوە ئیدانەی رۆشنبیریی گشتیە، بە شێوەیەك كە جگە لە پسپۆڕەكان كەس لە مەیدانەكەدا نەمێنێتەوە؟

فۆكۆ: ئەمە خەتای خاوەن رۆشنبیریی جۆراو جۆرو هەمەڕەنگ نیە، بەڵكو سیستمی خوێندن و قۆناغی دواناوەندیمان خەتابارە (كە ڕژێمی هیومانیزم بەڕێوەی دەبات). ئێمە هەرگیز بایەخ بەو لقە سەرەكیانەی خوێندن نادەین كە یارمەتیمان دەدەن لەو شتانە تێبگەین كە لە وڵاتەكەماندا روودەدەن، بەتایبەتی ئەو شتانەی لە دەرەوەی وڵاتەكەماندا روودەدەن.

هەركاتێك ئەوانەی خاوەن رۆشنبیریەكی گشتین، هەستیان كرد لەبەردەم رۆشنبیریەكی نامۆدان كە سەرتاپا پڕە لە ژمارەو هێمای بێزراو و تێی ناگەن، ئەوا ئەم هەستكردنەیان دەگەڕێتەوە بۆ یەك شت ئەویش ئەوەیە كە سیستمی خوێندن لای ئێمە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی نۆزدەیەم، بەشێوەیەك كە مەسخترین و شێواوترین سایكۆلۆژیاو خراپترین ڕژێمی هیومانیزم و ڕێزاكانی زەوق و هەستی مرۆڤایەتی بەسەریدا زاڵن. گلەیی لەو شتانە ناكرێت كە هەن، گلەیی لە خاوەن رۆشنبیری جۆراوجۆریش ناكرێ ئەوكات كە هەست دەكات ناتوانێ لە هیچ كام لەو شتانە تێبگات كە لە دەوروبەری روودەدەن، بەڵكو خەتاكە خەتای سیستمی خوێندنە.

*بەڵام پەیوەندی بە ژمارەوە هەبێت یا نەبێت ئەوەمان لێناشارێتەوە کە ئەم گرفتە تازەیەی ناو فیکر خۆی لە خۆیدا ئەبستراکت و لاوازە.

فۆکۆ: ئەبستراکت؟ وەڵامەکەم بەم شێوەیە دەبێت: ئەوە تەوژمی هیومانیزمە کە ئەبستراکتە. ئەو هەموو هاتوهاوارانەی گوایە لە دڵەوە دەردەچن، ئەو هەموو داخوازیانەی لەبەر خاتری کەسێتی مرۆڤایەتی یا بەخاتری بوون دەکرێن، هەموو ئەمانە ئەبستراکتن.. بەو مانایەی جیان لەو جیهانە تەکنیکی و زانستیەی لە راستیدا جیهانی واقیعی ئێمەن. ئەوەی واملێدەکات دژ بە تەوژمی هیومانیزم بم، ئەوەیە کە هیومانیزم بۆتە ئەو پەردەیەی هەرچی بیروڕا زۆر کۆنزەرڤاتیفەکانە خۆیان لە پشتیەوە شاردۆتەوە، بە شێوەیەك کە بۆتە مایەی چەندەها هاوپەیمانێتی تۆقێنەرو چاوەڕوان نەکراو. بۆ نمونە هەندێکیان دەیانەوێت بەناوی مرۆڤەوە پەیوەندی لە نێوان سارتەرو دوشاردادا دروستبکەن (کێ دەتوانێ رەخنە لە مرۆڤ بگرێت؟)، لە کاتێکدا هەوڵی ئێستای ئەوەی ئەمڕۆمان بۆ ئەوە نیە شان بەشانی مرۆڤ لە دژی مەعریفەو تەکنیك بوەستن، بەڵکو بۆ ئاشکراکردنی ئەوەیە کە فیکرو ژیان و بوونمان.. تەنانەت رەوتی ژیانی رۆژانەشمان هەمووی سەر بەهەمان ئەو رێکخستنە سیستمیەیەو پاشتر پەیوەستە بە هەمان ئەو وتەزایانەی حوکمی جیهانی زانستی و تەکنیکی دەکەن. وتەی وەکو (دڵی مرۆڤ) ئەبستراکتە، بەڵام لێکۆڵینەوەکەمان کە ئامانجی گرێدانەوەی مرۆڤە بە زانست و کەشفەکانی و جیهانەکەی خۆیەوە، هەوڵێکی بەرجەستەو هەستپێکراوە.

*بڕوام وایە.

فۆکۆ: وەڵامەکەم ئەوەیە کە نابێت گەرموگوڕییەك کە لە ملدانەوە هاتووە تێکەڵ بە ساردو سڕیەکی بکەین کە سەر بە سۆزە راستەقینەکانە. ئەو دوو نوسەرەی کە لای ئێمەی خاوەن سیستمە ساردوسڕەکانن بەرێزو گەورەن: سادو نیچەن. دوو نوسەر کە رەخنەیان لە مرۆڤ دەگرت. بەڵام ئایا خاوەنی بە سۆزترین و گەرموگوڕترین هەست نەبوون؟

* * *

***سەرچاوە:***

*گۆڤاری (بیت الحکمة) ژمارەی تایبەت بە (میشیل فۆکۆ) وەرگێڕانی لە فەرەنسیەوە: مصطفی کمال/ لاپەڕە (5—10)*

*سەرچاوە فەرەنسیەکەش بریتیە لە: کانزین لیتیریر (La quinzaine litteraire)، ژمارە (5) (1966/5/15) مادلین شاپسال (M. chapsal) دیالۆگەکەی سازکردووە.*

# گفتوگۆیەك لەگەڵ "میلان کۆندێرا"دا

● و. لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

***-لە ئێستادا ئاستی ڕۆمان نووسین لە وڵاتەکەتدا چۆن دەبینیت؟***

*ئەو ڕووداوە سیاسیانەی وڵات بەخۆیەوە بینی، پشێوی و نائارامیەکی زۆری لە نێوەندە نێودەوڵەتیەکاندا دروستکرد. بە جۆرێك چاوەڕێی ئەو دارمان و لەبەریەك هەڵوەشانە نەدەکرا کە لە وڵاتانی بلۆکی ڕۆژهەڵاتدا ڕوویدا. لەم ماوە کورتەدا هەلومەرجی ڕۆمان کامڵ نەبووە، بەلکو دەرفەتێکی دەوێت تا گوزارشت لەو بارودۆخە تازەیە بکات. بەتایبەت ئەو گۆڕانکاریانەی لە ڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕۆشنبیریەوە ڕوویان دا.

لای ئێمە ڕۆمان و ئەدەب بەشێوەیەکی بێئەندازە کەوتبوونە ژێرباری چەند کۆت و پێوەندێکی قورس و نەویستراوەوە، ئەمەش گوایە بە مەبەستی خزمەتکردنی ئامانجە پیرۆزەکانی گەل و نیشتمانە. لەبەرئەوە بە درێژایی ئەم قۆناغە هیچ شتێکی وەها بەدەرنەکەوت کە گوزارشت لە گەشەکردن و بەرەو پێشچوونی ئەدەب یان ڕۆمان یان شیعریکات. سیاسەت تا ئەوپەڕی چووبووە نێو ناوەڕۆکی ئەدەبەوە. هەر ئەمەش بووە مایەی دروستکردنی کەلێنێکی گەورە لە نێوان ئەدەب و خوێنەراندا.

***-لەگەڵ ئەوەشدا بەڵام دەبینین هەندێك کارو بەرهەمی وەها هەیە کە ڕەخنە مافی تەواوی خۆی داونەتێ؟***

*ئەو کارانەی تۆ باسیان دەکەیت ژمارەیان هێندە نییەو، بە شێوەیەکی گشتیش ناڕاستەیەکی یاخود بڵێین خەسڵەتێکی ڕۆمانسیانەیان هەیە. ئەو ڕۆمانانەی کە بە ڕاستی سەرنجیان ڕاکێشام ئەمانەن: (سپێدەیەکی بە ئازارو، لەوپەڕی هەڵچووندا، لەنێوان سێبەرو ڕوناکی)دا. ئەمانە چەند ڕۆمانێکن هەوڵی وێنەگرتنی زۆر لە ئێش و ئازاری ئەو قارەمانانە دەدەن کە هەست بە دابڕان و جوێ بوونەوە دەکەن لە واقیع.

ئەم جۆرە ڕۆمانانەش بە پێویست دەنگدانەوەی خۆی دەبێت لە دڵ و دەروونی خوێنەردا بەر لە ڕەخنەگر.. هەروەها پاش ڕووداوەکانی بەهاری (پراگ) ڕۆمانی نوێنی گەشەی سەند، کە گوزارشتی لەو قۆناغە کرد. هەر بۆیە لە دەرەوەی وڵات هەندێك بەرهەمی لەمجۆرە بڵاوکرایەوە.

***-تۆ چۆن لە کاری ڕۆمان نووسین دەگەیت، پاش ئەوەی ڕۆمان و چیرۆکەکانت بۆ چەند زمانێکی ئەورووپی وەك (ئینگلیزی و فەرەنسی و ئیتالی) وەرگێڕدران؟***

*بەر لە هەموو شتێ من بەم وەرگێڕانانە بەختەوەرم، نەك لەبەر ئەوەی دەرگاکان لەبەردەم شۆرەت و نێوبانگی نووسەردا دەکاتەوە، بەلکو لەبەرئەوەی وێنەیەك لە ئەدەبی گەلانەوە دەگوازێتەوە بۆ ئەو میللەتانەی ترکە بە زمانی جیاواز دەدوێن، هەر لەبەرئەوەش گرنگیم بە ڕۆمان نووسین دا، لەبەرئەوەی لەمجۆرە هەلومەرجەدا نووسینی

رۆمان وەك یەك خزمەتێكی گەورە پێشكەش بە نووسەرو خوێنەر دەكات. چونكە من دەتوانم لە رۆماندا گوزارشت لەو شتانە بكەم كە مەبەستمە. لێرەشدا پەنا نابەمە بەر راستەوخۆیی، بەڵكو زۆرجار ئاماژە بەكار دێنم. بەڵێ، هەندێ دەستەواژەی راستەوخۆ هەیە كە لە ناوەرۆكیدا حكومكردنی هەڵوێستێك یاخود دەسەڵاتێك لەخۆ دەگرێت، بەڵام پێویستە فەزای گشتی رۆمان لەمجۆرە فۆرمە بەرتەسكە بچێتە دەرەوە، ئەگەرنا ئەوا سیفەتی ئەدەب یان رۆمان لەدەست دەدات و، دەبێتە دروشمێكی سیاسی تەحریزی بێ پەردە.

*-خوێنەری بەرهەمەكانت تێبینی ئەوە دەكات كە تۆ زیاد لە بابەتەكانی تر بایەخ بە (سێكس و گاڵتەجاڕی) دەدەیت، چی هانت دەدات بۆ وروژاندنی ئەم مەسەلەیە زیاد لە مەسەلەكانی تر؟*

*بە درێژایی رۆژگار و لە هەموو جێو شوێنێكدا سێكس دەچێتە قوڵایی ژیانی هەموو كەسێكەوە، بۆیە چارەسەری مەسەلەیەكی وا پێویستی بە وردی و كارامەیی هەیە، ئەگەرنا ئەوا دەبێتە ئەدەبێكی تیاترۆبازانەی سووك و بێ بەها.. كۆمیدیاش بۆ خۆی جۆرە چێژێك دەبەخشێتە دەروونی ئەو خوێنەرەی كە ئەرك و ژانی ژیانی رۆژانە سەرشانی قورس كردووە.

*-كێن ئەو رۆمان نووسانەی سوودت لە ئەزموونی نووسینەكانیان بینیووە؟*

*لە سەرەتادا بەرهەمەكانی دی. ئیچ. لۆرانس-م خوێندەوە، ماوەیەكیشە بەرهەمەكانی مۆرافیا دەخوێنمەوە. جیاوازیەكی زۆر لە نێوان بەرهەمی ئەم دوو نووسەرەدا هەیە.. (لۆرانس) مرۆڤمۆچی هاوڵاتی ئینگلستانت نیشان دەدات لە چوارچێوەی كۆمەڵگایەكی داخراوی سنووردارو گەندەڵدا، لە كاتێكدا مۆرافیا لە جیهانێكی زۆر كراوەترەوە دەست پێدەكات. كراوەتر لە جیهانەكەی لۆرانس تیایدا گوزارشت لە تراژیدیای سێكسی قارەمانەكانی دەكات لەنێو جیهانی هاوچەرخدا، ئەو جیهانەی لێوان لێوە بە جوڵەو كردەگی.

*-هەندێك دەڵێن تۆ لەو كەسانەی كە بە رۆمانەكانی ڤلادیمێر نابۆكۆف سەرسامیت، بەتایبەتی رۆمانی (لۆلیتا) ئایا ئەمە راستە؟*

*هەندێك لە بەرهەمەكانی نابۆكۆف-م خوێندۆتەوەو بەو توانا زۆرەشی سەرسام بووم كە هەیەتی بەرامبەر گۆڕینی شتە سادەو ئاساییەكان بۆ جیهانی رۆمان بەبێ هیچ كەموكوڕییەك.. من بۆ خۆم توانای ئەوەم نییە. نابۆكۆف لە هونەری رۆمان و چیرۆك نووسیندا لە ریزی پێشەوەدایە. لە رۆمانی (لۆلیتا)دا مەرگەساتی ملیۆنەها لەو كچە گەنج و ئەو پیاوە بە تەمەنانەم بینی كە هەردوو پاڵەوانەكە بەشێوەیەكی جوان لەم رۆمانەدا بەرجەستەیان كردووە.

لەم رۆمانەدا چەند لایەنێكی شاراوەو نادیار هەیە كە هێشتا رەخنەی هاوچەرخ ئاوڕی لێ نەداوەتەوە: چونكە ئەم رۆمانە بەتەنها بەسەرهاتی پەیوەندی سێكسی نێوان كچێكی منداڵ و پیاوێك نییە لە تەمەنی باوكیدا وەك هەندێك پێیان وایە: بەڵكو ئەمە بۆ خۆی بریتییە لە قەیرانی ئەو كۆمەڵگایەی كە لە واقعدا لەمجۆرە نموونانە دروست دەكات. ئەمەش وێنەیەكە لە پیواری ئەو هۆشیارییەی كە پێویستە بەرەو رەهەندە بێ سنوورەكان بجوڵێت.

*-ئەمە بەرەو ئەو هەستە رەخنەییەمان دەبات كە تۆ هەتە، بەتایبەت پاش ئەوەی بەم دواییە كتێبێكت بەناوی (هونەری رۆمان نووسینەوە) بڵاوكردەوە، ئێستا تۆ چۆن دەڕوانیتە پرۆسەی رەخنەگرتن؟*

*پێویستە باس لەوە بكەم كە من لە هەلومەرجێكی نامەمواردا ئەم كتێبەم نووسی، ئەگەرچی لە پاریسیشدا دەژیم.. تاراوگە بەمانای داوەشان و، دووركەوتنەوەش لە نیشتمان بۆ ماوەیەكی زۆر وێنەی هەمەجۆرو پێكداچوو لە مێشكی مرۆڤدا دەخولقێنێ كە بواری لێك تێگەیشتن و جیاكردنەوەی

شتەکانمان ناداتێ.. ماوەیەک بەرهەمەکانی "دێستۆیڤسکی"م خوێندەوەو بە پێویستم زانی سەرلەنوێ بەو دیدو بۆچوونانەدا بچمەوە کە تایبەتە بەم نووسەرە مەزنە.. ئەو (گەمژەیەی) دێستۆیڤسکی لە بارەیەوە دەدوێت لە گشت کات و شوێنێکدا ئامادەیە.. هەروەها ئەوەشی تایبەتە بە (برایانی کارامازۆف و تاوان و سزا)وە. ئەم نووسینانە وات لێدەکەن هەست بکەیت کەسێکی دیکەیت و خودی خۆت نیت.

لێرەدا ویستم ئەوە بڵێم کە دیستۆیڤسکی و بەرهەمەکانی پێویستیان بە لێکدانەوەی تازە هەیە، پێویستە رووە دەروونیەکانی کارەکانی ئاشکرا بکرێت. بۆ ئەوەی تێگەیشتنێکی بەرفراوانترمان لەسەر کارو بەرهەمەکانی هەبێت. ئەم کتێبەم لە روانگەی رۆمان نووسێکەوە نووسیووە زیاد لەوەی لە دیدی رەخنەگرێکەوە بێت، ئەگەر هاتوو رەخنەگر لە توانایدا بوو لە روانگەی رۆمان نوسێکەوە مامەڵە لەگەڵ ئەو دەقەدا بکات کە دێتە بەردەستی، ئەوا لەو باوەڕەدام زۆر لەو بڕیارە نامەعقولانەی رەخنەگران دەریدەکەن، سەرلەنوێ دەکەونەوە بەر پشکنین و چاوپێداخشانەوە.

*-چۆن دەڕوانیتە کەلەپووری رۆمانی کۆمیدی؟*

*رۆمانی کۆمیدی زۆرجار لە باریدایە گوزارشت لەوە بکات کە نووسەر مەبەستیەتی، ئەمەش لای هەمووان شتێکی روون و ئاشکرایە. بەڵام گرفتی رۆمانی کۆمیدی لەمڕۆدا لەوەدایە کە رەخنەی ئەدەبی بەهەمان ئەو چاوە سەیری ناکات کە سەیری جۆرەکانی تری رۆمان نووسینی پێدەکات.

کەسێتی "دۆنکیخۆتە" بە هەموو مانایەک کۆمیدیە. گەرنا ئەی چۆن چۆنی سووربوونی ئەو لەسەر بەردەوامبوون بۆ بەدەست هێنانی خەونە نەخۆشەکانی بەهەر جۆرێک و بەهەر نرخێک بووە لێکبدەینەوە؟ من لە کارەکانمدا تەنزو گاڵتەجاڕی بەکاردێنم تا لە رێیەوە گوزارشت لە هەندێ لایەنی دەسەڵاتی دیسپۆتیزمی بکەم، ئەم گاڵتەجاڕیەش لە وڵاتەکەی خۆمدا چەند گرفتێکی بۆ دروست کردم. من پێموایە گەر هاتوو گیانی نوکتەبازی بە چاکی بەکارهێنرا ئەوا دەبێتە وێستگەیەکی گرنگ، تا هونەری چیرۆک ئەو واقیعە پەست و رەشە تێپەڕێنێ کە لە چیکۆسلۆڤاکیا لە ئارادا بوو.

*-لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا کەچی هەستکردن بە پووچگەرایی بە ئەزموونی قارەمانی رۆمانەکانتەوە دیارە؟*

*لای من قارەمان ناتوانێت لەم جۆرە هەستکردنە قوتاری بێت، ئەویش لەبەرئەوەی ئەو بارودۆخەی تیایدا دەژی زۆر لەو بەهێزترو باڵادەسترە. ئەو لە توانایدا نیە خۆی لەو هێزانە راپسکێنێ کە جڵەوی دەکەن، یان لەوانەی هەوڵی کۆنترۆڵکردنی دەدەن. بۆیە دەبینیت بەگیانی نوکتەبازی و قۆشمەییەوە مامەڵەیان لەتەکدا دەکات. نوکتەی تاڵ و زبر، کە زۆرێک لە گەندەڵی ئەو هێزو دەسەڵاتانە ئاشکرا دەکات. رەنگە لەمەدا "دیکنز" باشی پێکابێت کاتێک رەخنەکانی ئاراستەی هەندێک لەو خەسڵەت و دیاردە بێزراو و نەویستراوانە کرد کە لە کۆمەڵگەی بەریتانی رۆژگاری خۆیدا لە ئارادا بوون.

***سەرچاوە:***

*ئەم دیدارە خاتوو کریس یۆنگ لە رۆژنامەی (ئایریش تایمز)دا لەگەڵ میلان کۆندێرادا سازی داوە، دەقی تەرجەمەکراوی بە زمانی عەرەبی لە گۆڤاری (افاق عربیة) بڵاوکراوەتەوە.*

